# ڕەخنەگرتن لەعەقڵ



## لەفەلسەفەی غەزالیدا

### پێگەی عەقڵی تیۆری و عەقڵی زانستی





وەرگێڕانی:
سەعید بەشیر مستەفا

# ڕەخنەگرتن لەعەقڵ

## لەفەلسەفەی غەزالیدا

### پێکەی عەقڵی تیۆری و عەقڵی زانستی

نوسینی: نورالدین السافی

وەرگێڕانی: سەعید بەشیر مستەفا

چاپی یەکەم

٢٠١٦

**لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە(٥٥٠)**

## ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب: ڕەخنەگرتن لەعەقڵ
- نوسینی: نورالدین ساف
- وەرگێڕانی: سەعید بەشیر مستەفا
- تایپ و هەڵەچن: کەیهان هەورامی
- بەرگ: فواد کەولۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٦
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردن: (١٧٩٥)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە.

ناونیشان:

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣), (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێڕست

## پێشکەشە بە :

* هاوسەری بەڕێزو خۆشەویستم کە بەدەستخۆشی و دوعا بەخێرەکانی هاندەرێکی گەورەیە بۆم لەبەردەوامبوون لەکارەکانمدا.

* کچە تاقانەکەم کە هیوای ئێستە و ئایندەمە.

* بەڕێز مامۆستا سەرخێڵ غەفار بەڕێوەبەری یادگاری هەڵەبجە کە پشتگیریەکانی جێگەی ڕێزو سوپاسە.

* هەموو ئەوکەسانەی کە پشتگیری کاری چاکە دەکەن و خزمەتکردنی مرۆڤایەتی گەورەترین ئاواتیانە.

* پێشکەشە بەو کەسانەی کە شارەزابوون لەبەرهەمەکانی ئیمامی غەزالی خولیاو ئاواتیانە.

# دەستپێك

لەوکاتەی ناوی ئیمامی غەزالیم بیستووە و کتێبە بەناوبانگەکەی(احیا علوم الدین) م بینیوە هێندە گرنگیم پیێ نەداوە و پێموابووە کە بریتیە لەکۆمەڵێك باس و بابەتی ئامۆژگاری و هیچی تر، چوونکە لە وولاتی ئێمەدا کتێبەکانی ناوبراو هێندە جێگەی بایەخی رۆشنبیران بەگشتی و رۆشنبیرانی موسوڵمان بەتایبەتی نین، ئەوەش بەو هۆیەوە بووە کە غەزالی بە کەسێك ناسراوە کە سەرقاڵی فەلسەفە بووە وچەمك و مەسەلە گەلێکی زۆرو زەوەندی دەرەوەی ئاینی هێناوەتە ناو ئاینەوە، لەسەر دەمێکدا ژیاوە کە هێڵە سورەکانی ئاین کەوتوونەتە بەر نەشتەری رەخنەکانی فەلسەفەوە، ئەمەش وایکرد کە ئیمامی غەزالی لەپێناو پاراستن و بەرگریکردن لە بەهاکانی ئاین پەنا بۆ هەموو فەرموودە و قسەی پیاوچاکان و هەر شتێك بەرێت کە بتوانێت بەربەرەکانێی فەلسەفەی پێبکات و کارێك بکات لەزۆرانبازی ئاین و فەلسفەدا ئاین زاڵ و براوە بێت و فەلسەفە ملی بۆ کەچ بکات.

هەربۆیە غەزالی جیاوازە لە بیرمەندەکانی تری ئیسلام وەك فەقیهەکان، چوونکە دەبینین کار لەسەر ڕاستیەتی ماناو ناوەڕۆکی حەدیس دەکات نەك ڕاستیەتی گێڕانەوەکەی، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە غەزالی کاری لەسەر ڕاستیەتی گێڕانەوەکان کردووە نەك گێڕەرەوەکانیان، واتە ئەگەر ناوەڕۆکی هەر فەرموودە و

قسەیەکی هاوەڵان نزیکبوبێت لەڕاستیەوە هێناویەتی و هێندە گوێی نەداوە بە گێڕەرەوە و گۆیاکەی، ئەم بەرگە ئیسلامیەش کە غەزالی کردوویەتیە بەری هەموو کتێبەکانیدا وایلێکردووە کە بەناوی ئیسلامەوە قسە بکات و ببێتە ووتەبێژی ئیسلام – چوونکە ئیسلام بەڵگەی بووە – ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ڕۆشنبیری غەزالی لەڕووی ووردی و جۆراو جۆریەوە قورسە لەیەك ئاین یان یەك فەلسەفەدا کۆبکرێتەوە، بەڵام بەداخەوە کتێبەکانی بەتایبەت احیا علوم الدین لەنێو چینی ڕۆشنبیری ئیسلامیدا بەوە ناسراوە کە پڕیەتی لە حەدیس و قەسەی لاواز لەڕووی سەنەد و گێڕانەوەوە، غەزالی هەر بەمەشەوە نەوەستاوە و لەگەڵ سەرقاڵبوونی بەفەلسەفە کاریشی لەسەر صۆفیگەری کرووە و توانیویەتی هەردوو بوارەکە شانبەشانی یەکتری بەرەو پێشەوە بەرێت، صۆفیگەریەك کە ئشفیتسر لەکتێبی(فلسفة الحضارة) دا دەڵێت: : (ئەو ئەخلاقەی کە فیکر ڕازی دەکات پێویستە لە تەسەووفەوە سەرچاوە بگرێت، هەموو فەلسەفەیەکی قوڵ و هەموو ئاینێکی قوڵ هەردووکیان لەکۆتاییەکەیاندا تێکۆشانێکە لەپێناو صۆفیگەری ئەخلاقی و ئەخلاقی صۆفیەتدا، ئێمەی خۆرئاوایی کە بە تێکۆشانێکی زۆر هەوڵی ئەوەمانداوە کە تیۆرێکی ئەخلاقی کارا لەجیهان و ژیاندا دابین بکەین ڕێگە نادەین تەسەووف بگاتە ئامانجەکانی. صۆفیگەری بەشێوەیەکی گۆشەگیرانە لەناوماندا دەژی و بەشێوەیەکی غەریزی هەستدەکەین کە دژایەتی هەیە لەگەڵ ئەخلاقی کارادا، هەربۆیە پەیوەندیەکی ناخیمان لەگەڵیدا نیە، لەگەڵ ئەمەشدا هەڵەی گەورەمان ئەوەیە کە باوەڕمان وایە کە دەتوانین بەبێ تەسەووف دەگەینە تێڕوانینێك لە بوونەوەرو ژیانی ئەخلاقیدا کە فیکر ڕازی بکات... ئێستەش کاتی ئەوە هاتووە کە ڕزگارمان بێت لەم هەڵەیە، چوونکە قوڵبوونەو ڕۆچوون لە

بیرکردنەوەدا تێڕوانین بۆ ژیان و جیهانی تایبەت بەئەخلاقی کارا وەدی ناهێنن مەگەر ئەو تێڕوانینە لە صۆفیگەرەیەوە سەرچاوەی گرتبێت).

کاتێك غەزالی لەگەڵ فەیلەسوفەکانی تری ئیسلامدا بەرابەر دەکەین تەنها وەك نوسەرێکی موسوڵمان دێتە بەرچاومان کە بەئاسانی لەنێو کۆمەڵەی سیستەمی ئیسلامیدا دێت و دەڕوات، وەك قورئان و سوننەت و فیقهو زانستی کەلام، کە لەنێو ئەم چوارچێوەیەدا باسی گەورەترینی فیکرەکان دەکات، بەمشێوەیە دەبێتە کەسێکی داهێنەر نەك گێڕەرەوە. غەزالی بەشێوەیەکی ئیسلامی بیردەکاتەوە، چوونکە توانیویەتی دەقی ئیسلامی بهێنێتە گۆو وایلێبکات کە نهێنیەکانی ئاشکرا بکات، دەقی ئاینی پێویستی بەخودێك هەیە کە ماناو ئەو ووشانەی کە خود بەزانست و مەعریفەکانیان گەشە دەکات تێیاندا دەربهێنێت هەرکات کە بتوانێت بگاتە لای دوورترین و قوڵترینی ماناکانی، لەبەر ئەوەی خود هیچ سنورێکی نیە کە لێی بوەستێت هەربۆیە دەرهێنانی دەق و خوێندنەوەی بەکراوەیی تاوەکو بێ کۆتا دەمێنێتەوە، ئەمەش ئەوەیە کە ئێمە دەتوانین بە م قسەیە دەری ببڕین(جەدەلیەتی وەحی و واقیع و حەقیقەت).

سەرەڕای کتێبی احیا غەزالی چەندین کتێبی تریشی هەیە وەك مقاصد الفلاسفە، میزان العمل، معیار العلم، مشکاە الانوار و تهافت الفلاسفەو...هتد. کە بەداخەوە لە کتێبخانەی کوردیدا بوونیان نیە و کار لەسەر وەرگێڕانی ئەو بەرهەمە ناوازانە نەکراوە.

کاتێك ئەم کتێبەم بینی کە نامەیەکی دکتۆرایە و باس لە ڕەخنەگرتن لەعەقڵ دەکات لەلای ئیمامی غەزالی، توانیم بەباشی ئاشنای ئیمامی غەزالی ببم لەو بوارەدا و لەوەش تێبگەم کە فەلسەفەی غەزالی لەسەر گەڕان و پشکنین وەستاوە لەسەر

پەیوەندی نێوان عەقڵ و بوون(واتە سروشتی زانست)، وە هەروەها هەندێك لەو کتێبانەشی بناسم کە دایناون و نرخ و بەهایان کەمتر نیە لەزۆرێك لە کتێبە فیکری و فەلسەفیەکانی ئەمڕۆکە.

هەربۆیە هیوادارم ئەمکارەم دەریچەیەك بێت بۆ چوونە ناو جیهانی فراوانی بیرو فیکرو فەلسەفەو تەسەووفی ئەو پیاوە مەزنەی کە تاوەکو ئێستەش لەدوورەوە شتێکمان لەبارەیەوە بیستووە و بەباشی لەحەقیقەتی نەگەشتووین.

سەعید بەشیر مستەفا

٣٠ / ٨ / ٢٠١٥

# پێشەکی

## هۆکارەکانی نوسینی ئەم بابەتە و ئامانجەکانی

خۆرهەڵاتناسەکان [1] لەدێرزەمانەوە لەبارەی کەلتوری شارستانی و بەتایبەت فەلسەفیمانەوە ئاگاداریان کردووینەتە وە، چوونکە لەو سەردەمەدا کە لاوازی بەهەموو شێوەکانیەوە زاڵبوبو بەسەرماندا، زۆر پێویستمان بەم ئاگادار کردنەوەیە هەبوو، مونك لەکتێبەکەیدا(تێکەڵەیەك لە هەردوو فەلسەفەی یەهودی و عەرەبی)[2] توانیویەتی هێڵکەلێکی گرنگ لەبارەی مێژووی فیکری فەلسەفی و کەلامیەوە دابنێت، بەڵام لێکۆڵەرەکان بەشێوەیەکی کورت سوربوون لەسەر رۆشتن بە رێڕەوەکەی ئەودا و گرنگیدان بەفیکری ئیسلامی و پێناسە کردنی، هەروەك ئەوەی کە دیبور لەکتێبەکەیدا بەناوی(مێژوو فەلسەفە لەئیسلامدا) کردوویەتی، کە تێیدا دەڵێت: : یەکەمین هەوڵێك بۆ باسکردنی مێژووی فەلسەفەی ئیسلامی بەگشتی لەپاش ئەوەی کە مونك کورتەباشەکەی دانا، دەتوانرێت ئەم کتێبەی من

---

[1] لەم بوارەدا دەتوانین ئاماژە بە ئنسکلۆپیدیای بروکلمان بکەین لەبارەی ئەدەبی عەرەبیەوە لەساڵی ١٨٩٠ و کارەکانی ماکدونالد لەبارەی ژیانی ئاینی ئیسلامی کە لەلەساڵی ١٩٠٩ دا دەرکەوت بکەین، لەگەڵ ژیاننامەی غەزالی ١٨٩٩ و کارەکانی قارادی فو لەبارەی غەزالیەوە لەساڵی. ١٩٠٢

[2] سولومون مونك: کتێبی تێکەڵەیەك لە فەلسەفەی یەهودی و عەرەبی، کە لەساڵی ١٨٥٩ دەرچووە.

بەسەرەتایەکی نویٚ دابنریٚت [٣]، من لیٚرەدا باسی میٚژووی ئەم جۆرە کارانە ناکەم، بەڵکو ویستوومە فەلسەفەی ئیسلامی بەپیٚی بیرو بوچوونەکانی ئەوان بخەمە ڕوو.

بۆنمونەی دیبور دەڵیٚت: : بەردەوام فەلسەفەی ئیسلامی فەلسەفەیەکی هەڵبژاردنیە، پایە و کۆڵەکەکانیشی بریتین لە دەرهیٚنان و هەڵگۆزینی ئەوەی کە لەکتیٚبە فەلسەفیەکانی گریکەکانەوە تەرجەمە کراوە، ڕیٚرەوەی میٚژووەکەشی کەمترە لەوەی کە بلیٚین تیٚکەشتن و هەڵگۆزین بیٚت لەنیٚو مەعریفەی پیٚشینانەوە، داهیٚنانکارانەش نەبووە، جیاوازیەکی ئەوتۆیشی لەگەڵ فەلسەفەکانی پیٚش خۆیدا نیە، نە توانیویەتی کیٚشەگەلیٚکی نویٚ بهیٚنیٚتە ئاراوە، نە توانیویشیەتی بەشیٚوەیەکی سەربەخۆ شتیٚکی نویٚ دابهیٚنیٚت، کە چارەسەری مەسەلە کۆنەکانی پیٚبکات. لەجیهانی فیکردا هەنگاوی نویٚی هەڵنەهیٚناوە کە شیاوی ئەوە بیٚت بۆی تۆمار بکەین [٤]. خەمی هەوڵ و تیٚکۆشانی فەلسەفی لەئیسلامدا ئاراستەی لایەنی تیۆری عەقڵیە.... و فەلسەفەی عەرەب فەلسەفەیەکی پراکتیکی و کرداری نیە [٥].

وەهەروەها لەبارەی دابەشکاریشیەوە بۆ فەلسەفە، باسی شویٚنکەوتوانی فەلسەفەی ڤیساغۆرسی دەکات، لەنیٚویشیاندا باسی ڕازی و ئیخوان الصفا دەکات، دواتر باسی ئەو فەیلەسوفانەش دەکات کە شویٚنی مەزهەبی ئەرستۆ کەوتوون و کاریگەری ئەفلاتونیەتی نویٚیان لەسەرە، لەم بەشەشدا ئامازەی بەکندی و فارابی و ئیبن مسکویە و ئیبن سینا دەکات، دواتر باسی کۆتایی فەلسفەفە دەکات لەخۆرهەڵاتدا، باسی غەزالی دەکات بۆ ئەوەی بەرەو باسی فەلسەفەی خۆرئاوا(مغرب) بڕوات، وەك ئیبن باجە، ئیبن توفەیل، ئیبن ڕوشد، دواتر

---

[٣] دی بور: میٚژووی فەلسەفە لەئیسلامدا، وەرگیٚڕانی محمد عبد الهادی ئەبو ریدە لا ١٢.

[٤] دی بور: تأریخ الفلسفە فی الاسلام لا ٧٠

[٥] دی بور: تأریخ الفلسفە فی الاسلام لا ٨٥

بەباسکردنی بەشێکی سەربەخۆ لەبارەی ئیبن خەلدونەوە کۆتای بەباسەکە دەهێنێت.

ئەم دابەشکاریە لەخۆرهەڵات و خۆر ئاوادا فەلسەفەی کردووەتە فەلسەفەیەکی ڕووتی یۆنانی، بەڵام کەسایەتی غەزالی بووەتە نمونەی کۆتایی فەلسەفە لەخۆرهەڵاتدا، هەروەك بڵێی کەسایەتیەکە لە ڕێگەی بڕیارلێدراو دەرچووە و لەفەیلەسوفەکانی تر خۆی جیا کردووەتەوە، بەڵکو(بێگومان غەزالی سەر سوڕهێنەر ترین کەسایەتیە لەمێژووی ئیسلامدا و مەزهەبەکەشی ئاوێنە نوێنی کەسایەتیەکەیەتی) [٦]. ئەمەش نزیکە لە هەڵوێستەکەی ڕینانەوە کە دەڵێت: : غەزالی تاکە فەیلەسوفێکی موسوڵمانە کە شێوازێکی تایبەتی لەبیرکردنەوەی فەلسەفیدا بۆ خۆی هەڵبژار دووە. کەواتە غەزالی وەك خاڵێکی جیاواز وایە لە مێژووی فەلسەفی لەلای موسوڵمانان، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەسایەتی خۆی بەجوانی ئاشکرا کردووە و نەبووەتە چاو لێکەر و لاسایی کەرەوەی کەسانی تر. بەڵام ئایا ئەم تاکبوونەوەیە سیفەتێکی باشە لەجیهانی فەلسەفەدا؟ یان یەکێکە لەسیفەتە ناشیرینەکانی دوونیای فەلسەفاندن؟ وەڵامی ئەمەش دەبێت لەڕێگەی ئاشکرا کردنی هەڵوێستی ئێمەوە بێت لەبارەی فەلسەفەی یۆنانیەوە، ئەگەر فەلسەفەمان تەنها بەفەلسەفەی یۆنانی زانی، ئەوا ئەم تاکبوونەوەیە غەزالی لەدوونیای فەلسەفە دەکاتە دەرەوە.

بەڵام ئەگەر فەلسەفەمان بەچالاکی عەقڵی هۆشیار(الواعی) زانی لەبارەی خود و لەبارەی جیهانەوە، بەبێ ئەوەی کە پەیوەستی بکەین بە لایەنێکی جوگرافی یان ئینتیمایەکی شارستانیەوە، ئەوکات ئەو تاکبوونە دەبێتە بەڵگەی پێگەشتن و

---

[٦] دی بور: تأريخ الفلسفه فی الاسلام ل ٣٦٢

نیشانەی سەربەخۆیی و لەدایکبوونی فەیلەسوف. هەرچەندە ئەم ڕاڤەیە ئەمڕۆکە لەلای هەندێك نوسەری عەرەبی چالاك لەفیکری فەلسەفیدا بەگشتی و فیکری ئیسلامیدا بەتایبەتی وەك محمد عابد جابیری لێکۆڵەر، پاشەکشەی کردووە، چوونکە ئەرستۆییەتی کردووەتە نمونەی فەلسەفە و خاوەنی عەقڵی بوونەوەر، چوونکە ئەم لێکۆڵەرە عەقڵی دابەشکردووە بە عەقڵی بوونەوەر و عەقڵی دەستلەکارکێشاوە(المستقیل). عەقڵی بوونەوەر(کونی): مانای زانستی یەقینی دەگەیەنێت، کە خۆی بەسەر هەمواندا دەسەپێنێت، بەو شێوە بەهێزە چوونکە لەسەر بەڵگەی گەلێگ وەستاوە کە لە پێشەکی گەلێکی ڕاست و پێویستی گشتیە. پێشەکی گەلێك مرۆڤ لێیان دڵنیایە و بووەتە شتێکی دیاری سروشتی. عەقڵێکە خۆی بەسە بۆ خۆی. پێویستی بە بنەمایەك نیە لەدەرەوە پێی بدرێت، بۆئەوەی کاروبارە نوێیەکانی پێ پێوانە بکرێت، وە هەروەها پێویستی بە ئیلهامێك نیە لەم ڕووەوە یان لەهەر ڕوویەکەوە مەعریفەی پێببەخشێت [٧]. بەڵام عەقڵی دەستلەکارکێشاوە(المستقیل) جارێك بە عیرفان پێناسەی دەکات و جارێکیش بە صۆفیگەری.

هەروەك لەم جیاکاریەوە دەردەکەوێت ئەم لێکۆڵەرە بەردەوام لەژێر کاریگەری لایەنگریەکاندایە(انتما) و لەهیچ فیکرەیەك تێناگات، مەگەر شوێنێکی ئامادەکراوی هەبێت کە لەگەڵیدا بگونجێت، چوونکە چێژ لە داهێنان وەر ناگرێت و هەستی لەمانای سەر بەخۆیی تێناگات. مەسەلەی غەزالی هەندێك سەر سوڕهێنەرە، باشە بیخەینە چ خانە و شوێنێکەوە؟ ئەم سەر سوڕمان و سەرسامیە هێزەکەی هەرچەندێك بێت، ناتوانرێت بخرێتە خانەی بەڵگەوە(البرهان). غەزالی لەنێو عەقڵی

---

[٧] تکوین العقل العربی – الجابری – لا ٢٤٤.

دەستلەکارکێشاوە(المستقیل) دایە، هەروەك ئەوەی کە تاك بووەتەوە لەعەقڵی ئەرستۆیی بوونەوەری(الکونی)، هەروەك جابیریش دەڵێت: : غەزالی کێشەی عەقڵی عەرەبی بەرجەستە کرد و دایمەزراند، ئایا لەپاش ئەمەوە پێویستمان بەوە هەیە کە بڵێین: سەرکەوتنی عەقڵی دەستلەکارکێشاوە لەغەزا لیدا برینێکی زۆر قوڵی لەعەقڵی عەرەبیدا دروستکردووە کە تاوەکو ئێستەش برینی ناوبراو خوێنەکەی لە زۆرێك لەعەقڵە عەرەبیەکاندا دەچۆڕێت؟ [٨].

ئەم داوەریکردنە لەچەند ڕوویەکەوە جێگەی سەر سوڕمانە:

ڕووی یەکەم: چۆن دەکرێت ئەمڕۆکە باسی عەقڵی بوونەوەری(الکونی) بکەین، پاش ئەوەی کە ڕوونبووەتەوە کە عەقڵ پێکهاتەیەکی گۆڕاوی مێژووییە، وە لۆژیکی شێوازیش(صوری) لۆژیکی فیکری مرۆیی نیە، هەروەك ئەرستۆ پێی وابووە و جابیریش دوای زیاتر لەبیست سەدە پشتگیریدەکات، لەکتێبەکەیدا کەپێشتر ئاماژەمان پێکرد، بەڵکو لۆژیکی زمانی یۆنانیە، هەروەك لەباسە زمانیەکان(اللسانیات) ی [٩] وەك بنفنیست و باسەکانی لایەنگرانی لۆژیکی ماتماتیك و و ئاماژەیی وەك باسەکانی براتراند رسلدا [١٠] ڕوونکراوەتەوە، کە بەڕاشکاوانە ئەوەی کە سیرافی گوتوویەتی ئەمیش دەیڵێتەوە، کاتێك قسە لەگەڵ متی کوڕی یونسدا

---

[٨] تکوین العقل العربی — الجابری — الفصل الحادی عشر — ازمه الاسس وتأسیس الازمه.

[٩] بنفیست: مەسەلە گەلێکن لەزمانە گشتیەکاندا، لا ٦٥، دەڵێت: ئەرستۆ پێیوابووە ککە زمانە گشتیەکان سیفەتی بابەتەکان دیاری دەکەن، بەڵام ئەمەی لەڕێگەی بوونەوەرە زمانیەکانەوە ئەنجامداوە، لەمەوە ئەمە تێدەگەین ئەوەی کە ئەرستۆ لەسەر لیستی مەرجە گشتی و ئەگۆڕەکان پێشکەشیدەکات تەنها کەوتنێکی ماناو تێگەشتنە بۆ واقیعێکی زمانی دیاریکراو.

[١٠] مقدمة للفلسفة الریاضیة — الفصل الخامس لا ٢٣١ دەڵێت: لەڕووی مێژووییەوە ماتماتیك و لۆژیك( المنطق) دوو جۆر لێکۆڵینەوەی جیاواز بوون لەیەکتری، بەڵام ماتماتیك بەزمانی یۆنانی پەیوەستکراوە بە بەزانست و مەنتیقەوە.

دەکات و دەڵێت: :(کەواتە تۆ ئێستە ئێمە بانگ ناکەیت بۆ لای زانستی لۆژیك(المنطق)، بەڵکو بانگماندەکەیت بۆلای فێربوونی زمانی یۆنانی) [١١].

ئەوەی لەمبارەیەوە جێگەی داخە ئەوەیە کە ئەوەی لەم سەردەمەی ئێمە لەم بوارەدا کردوویانە، پێشتر تۆوەکانی لەلای خۆرئاوا لە سەردەمی سەرهەڵدانی نوێگەریەوە دەرکەوتوون، بەشۆڕشێکی زانستی دادەنرێت، ئیتر لەزمانیەکاندا بێت، یان لەجیهانی مەنتیق و زانستەکانی پرۆگرامەکاندا بێت. ئەمە لەکاتێکدایە کە نوسەر ناوی دەنێت دامەزراندنی کیشە و گرفت، هەندێکجاریش ناونانەکەی ڕاست دەردەچێت، چوونکە بەڕاستی کێشەیەکی خولقاندووە لەبنەماکاندا و تەنانەت خودی بیرکردنەوەکەشی فەلسەفەی توشی کێشەیەکی ڕاستەقینە کردووە. ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی گەورەیی ئەم پیاوە، ئێمەش ئەمڕۆکە لەباسی ئیبستیمولوجیدا شوێن کێشەکان دەکەوین و هەوڵدەدەین خوێندنەوەیان بۆ بکەین، چوونکە وێستگەکەلێکن کە گۆڕان لەفیکری زانستیدا دروست دەکەن، ئەمانەش گۆڕانگەلێکن کە فیکر لەئاستێکەوەدەبەنە ئاستێکی تر. هەرچەندە عەقڵیەتی عەرەبی هاوچەرخ، لەم لێکۆڵەرەدا خۆی دەبینێتەوە، کە وادیارە هێشتا لەسەر نەریتەکانی فیکری باو ماوەتەوە، لەکاتی ڕووبەڕوبوونەوە لەگەڵ فیکری نوێ و تێڕوانینی نوێدا تووشی نائارامی و شپرزەیی دەبێتەوە، تووشی کێشەش دەبێت بەبێ ئەوەی بزانێت کە کێشەکە بەهۆی نەخۆشی فیکری باوی کۆنەوەیە، نەك بەهۆی خراپی نوێگەریەکانەوە بێت. ئەم هەڵەیە لە هەڵسەنگاندندا بەبۆچوونی من غەزالی دەکاتە بەتواناترین کەس لە توێکاری عەقڵی باوی سەردمەکەی ودامەزرێنەری عەقڵی نوێ، کە دواتر دەبێتە هۆی هەنگاوی نوێ بەرەو پێشکەوتن و

---

[١١] ابو حيان التوحيدي( الإمتاع والمؤانسة – الليلة الثامنة.

گەشاوەیی زیاتر، هەنگاوە نویّ و پێشکەوتووەکەش توانای لەخۆ گرتنی هەنگاوە کۆن و باوەکەی هەیە، بەلاّم پێچەوانەکەی نەگونجاوە.

ڕووی دووەم: چۆن دەکرێت خوێندنەوە بۆ بەرهەمی فەیلەسوف و حوکمدان بۆی یاخود لەدژی بکرێت، لەرێگەی دەستەواژەگەلێکی ئامادەو پێکهاتەیەکی مانایی تێگەشتن لەدەرەوەی تۆڕی ئەو تێگەشتنەی کە فەیلەسوفی مەبەست بەدەستی دەهێنێت ! بۆ نمونە ئەرستۆ بهێنین و بیکەینە سەرچاوە و نمونە و لەرووی دوور و نزیکی و لێکچوون و لێك نەچوونەوە ئەوانیتری پیّ بەراورد بکەین، بۆ نمونە ئەگەر مانای زانست لەلای ئەفلاتون وەربگرین و بیکەینە پێوەر لەبەر ئەوەی کە ماناکەی ئامادەیە و ئەوکات ناتوانین لێی تێبگەین و مانای زانست لەلای ئەرستۆ قبولّبکەین، کەواتە(چرکەساتی دامەزراندنی فەلسەفەیەکی نویّ واتە لەناوچوون و کەوتنی تۆرێکی تێگەشتن و مانای باوو دانانی تۆرێکی مانایی نوێیە لەجێگەکەیدا).

ڕووی سێیەم: باسکردنی ڕوونکردنەوە و بەلّگە و عیرفان، هەروەك جابیری ریزبەندی کردوون، ریزبەندیەکی گونجاوە، بەلاّم دەبێتەبەربەرست، ئەگەر بێتو بەڕاستی و بەشێوەیەکی ڕاستەقینە فەیلەسوفەکان نەناسین، بۆ نمونە غەزالی گرنگیداوە بە ڕوونکردنەوە(البیان) و بەلّگە(البرهان) و عیرفان، هەموو ئەمانە لەچەندین کتێب یان لەکتێبێکدا دەبینین، ئایا چۆن کتێبی لەبارەوە بنوسین؟ ئایا مافی تەواوی پێناسە و ناساندنی فەیلەسوفەکە دەدەین، یان مافی تەواوی کتێبەکە دەدەین؟

ئەم تێبینیانە بەلّگەن لەسەر ئەوەی کە بارودۆخی فەلسەفەی ئیسلامی و فیکری ئیسلامی بەگشتی بارودۆخێکی هێندە باش نیە، ئیتر لەلای خۆرهەلاّتناسەکان بێت

یان کەسانی تر، ئەمە سەرەڕای ئەم خزمەتە گەورە و بەڕێزانەی کە لەم بوارەدا پێشکەشیانکردووە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئاراستەی گشتی مەحکوم و تۆمەتبارە بەوەی کە زیاتر حەزی لەڕێڕەوو پڕۆگرامی مێژووییە و بەدوورە لە پڕۆگرام و مەنهەجی فەلسەفی [١٢]. ئەگەر غەزالی وەك نمونە وەربگرین ئەوا مەسەلەکە هێندەی تر بەهێزو جەخت لەسەرکراوە دەبێت، چوونکە ئەم پیاوە بیرمەندەکانی لەکۆن و نوێدا زۆر ماندوو کردووە، هۆکاری ماندووبون و سەرسامیەکەشیان ئەوەبووە کە غەزالی پڕچەك و تەیار بووە بە چەکی ڕەخنەی یەکلاکەرەوە، کە ئاراستەی هەموو جۆرە بیرکردنەوەکانی سەردەمەکەی خۆی کردووە، وەك فیقهو کەلام و فەلسەفە و تەسەووف، وەهەروەها بەچەندین ڕەنگ ڕنگرێژی کردوون، ئەمەش وادەکات کۆکردنەوەیان لەیەك بازنەدا شتێکی زۆر قورس بێت ئەگەر نەڵێین نەگونجاوە.

ئەم کەسایەتیە سەرسوڕهێنەرە کەمەنکێشی کردم بۆلای خۆی، بێداری هۆشیاری وایلێکردم کە بچمە ناو جیهانەکەیەوە، بەو هیوایەی لەڕێگەی ئەو مەعریفەیەی کە لەبەردەممدایە بتوانم حەقیقەت و ڕاستی ئەم سەرسامی و ئەم مەتەڵە ئاڵۆزە بزانم. بەڵام ناتوانیت بەشێوەیەکی گشتی مامەڵە لەگەڵ غەزالیدا بکەیت، چوونکە هەر لەیەکەمین هەنگاوەوە بۆت دەردەکەوێت شتێکی قورسە و تێگەشتن لەونابراو مەسەلەیەکی زۆر ئاستەم و قوڵە. بەڵام ئەگەر لەیەکێك لە گۆشە نیگاکانیەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەم و بمەوێت لێی تێبگەم و بتوانم گرنگترین

---

[١٢] لێرەدا بۆ نمونە باسی ئنسکلۆپیدیای ئیسلامی و ئنسکلۆپیدیای دین و ئنسکلۆپیدیای ئەخلاق و ئنسکلۆپیدیای بەریتانی دەکەین، لەگەڵ کارەکانی بروکلمان و کارەکانی بێرسون و رینان و هنری کوربان و دی بور کە کارانێکی بەپیت و دەوڵەمەند بوون، وە هەروەها باسی کارەکانی ماسینیون دەکەین لەبارەی صۆفیگەری ئیسلامیەوە، بەتایبەحەلاج، و چەندانی تریش دەکەین.

لایەنیشی هەڵبژێرم، ئەوکات لەوانەیە بتوانم دەرگایەك بدۆزمەوە بۆ چوونە ژوورەوە و بنەمایەك پەیدا بکەم و بیکەمە بناغەو خاڵێکی نەگۆڕی لێکۆڵینەوەکانم لەسەر ناوبراو، نەك ئەم لێکۆڵینەوەیە بەگونجاو بزانم بۆ لایەنەکانی تری، چوونکە لێکۆڵەرەکان لەبارەی غەوالیەوە گوتوویانە: فیکرەکانی ووردترینی ئەو فیکرانەن کە فەیلەسوفە موسوڵمانەکان لەدوای خۆیان بەجێیانهێشتووە [١٣]. کاتێك بەناو کتێبەکانیدا گەڕام کۆتا دانراوی غەزالیم بینی، بەڵام سەرەڕای ئەو خاڵە کاتیەی کە داگیریکردووەکتێبەکە لەلای لێکۆڵەرەوان بەنامۆیی ماوەتەوە، سەرەڕای قسەکەی دکتۆر عبدالامیر ئەعسەم کەجەخت لەوە دەکاتەوە باسکردن لەبارەی غەزالیەوە لەدێر زەمانەوە، وەك بیرمەند و فەیلەسوف و فەقیهو موتەکەلیم و موتەصەویف ئەو تازەیی و بنەڕەتی بوونەی تێدا نیە، چوونکە باس و بابەتە ئەکادیمیەکان بەتەواوی مافی ئەم پیاوە گەورەیانداوە [١٤].

لێکۆڵەرەکان بەپێچەوانەی ئەعسەمەوە گرنگیەکی ئەوتۆو پێویستیان بەم کتێبە نەداوە، بەڵکو بەشێوەیەکی لاوازو سنوردار لەهەندێك لێکۆڵینەوەدا لەسەر غەزالی باسیانکردووە. ئەم کتێبەش بریتیە لەکتێبی(میزان العمل) واتە تەرازوی کارەکان. کە د جمیل صلیبا و د کامل عیاد لەبارەیەوە گوتوویانە: کورتەیەکە لەبارەی دەروونناسی و گەڕانە بەدوای ئەو بەختەوەریەی کە بەدەست نایەت مەگەر

---

[١٣] لێرەدا پێویستە ئاماژە بە و هەوڵە گەورەیەی فەرید جەبر کە لەکتێبی( سیرة الغزالی ومؤلفاته) لەساڵی ١٩٥٤ بلاو کراوەتەوە، لەگەڵ عبدالرحمان بدوی کە لەبارەی دانراوەکانی غەزالیەوە لەساڵی ١٩٦١ بلاویکردووەتەوە بەناوی( حول مؤلفات الغزالی) بکەین.

[١٤] الفیلسوف الغزالی – د عبد الامیر الاعسم لا ٧.

بەزانست و زانیاری و کردار نەبێت، وە هەروەها باسی ڕێزی زانست و کردار و فێرکردنیش دەکات [١٥].

دکتۆر سلیمان دونیا و لێکۆڵەر حیکمەت هاشم بە گرنگترین ئەو کەسانە دادەنرێن کە گرنگیان بەم کتێبە داوەو نیشانی خەڵکیشیانداوە، یەکەمیان لێکۆڵینەوە و پێشەکی بۆ نوسیوە و لەساڵی ١٩٦٤ز لەدار المعارفی میسردا چاپی کردووە، دووەمیشیان وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەکی پاشکۆدا کە بۆی کردووە، فەیلەسوفی فەرەنسیش لوی ماسینیون پێشەکی بۆ نوسیوە، لەساڵی ١٩٤٥ز لەپاریس بەچاپی گەیاندووە.

بەڵام لەوانەیە لێکۆڵینەوەی ئەم بەرهەمە و چاپکردنی لە میسر و پاریسدا بەفەرنسی ببێتە هۆی ئەم تێبینیانەی خوارەوە:

یەکەم: لوی ماسینیۆن لەوانەیە تەنها باسکردنی ئەوەی کە د حکمەت هاشم پێشکەشی ئەمی کردووە و ئەمیش وەریگێڕاوە بۆ سەر زمانی فەرەنسی و پێشکەشی خوێنەری فەرەنسای کردووە، بەبەس بزانێت و نەچێتە ناو قولاییەکەیەوە.

دووەم: حیکمەت هاشم بیست و هەشت لاپەڕە پێشەکی بۆ ئەم کتێبە نوسیوە، کە کۆمەڵێك بابەتی تێدا وورووژاندووە، لەوانەش پێگەی ئەم کتێبەیە لەنێو کتێبەکانی تری غەزالیدا، وەهەروەها هەڵوێستی ڕاستەقینەی غەزالی لەبارەی زیندووبونەوەوە، بەبەراوورد بە هەڵوێستی فەیلەسوفەکان و صۆفیەکان خستووەتە ڕوو، بەشەکەی تری پێشەکیەکە بریتیە لە خستنەڕوویەکی وورد و قوڵ بۆ ماناکانی ئەم کتێبە، بەڵام لێکۆڵەری وەرگێڕ بەپێی پەیڕەوی دەستنوسی دێر بەدێر و بەش

---

[١٥] پێشەکی کتێبی( المنقذ من الضلال – لا ٥٤.

بەش لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی وەرگێڕانەکەی کردووە، هەروەك بڵێی وویستوویەتی کورتی بکاتەوە، یان بیخاتەڕوو بەبێ هیچ شەرح کردن و هەوڵێك بۆ وەبەرهێنان لەتێگەشتنی گرنگترینی فیکرەکانی بەبەراوورد بە کتێبەکانی تر و فەیلەسوفەکانی تر کە کتێبیان نوسیوە لەوبارەیەوە. بێجگە لەهەندێك ئاماژەی خێرا، بەگشتی پێشەکیەکە کورتەیەکە کە بیرۆکەیەکی گشتی لەبارەی کتێبەکەوە دەبەخشێت بە خوێنەر، کە بەشێوەیەکی ڕواڵەتی دەتوانێت لەناوەڕۆکەکەی تێبگات، بەڵام دووبارە خوێندنەوەی کتێبەکە و باس و گەشتکردن بەناو قوڵاییەکانیدا پێویستیەکی هەنوکەییە بۆ ئەوکەسانەی کە تەنها بەڕواڵەت دڵیان ئاو ناخواتەوە و هەوڵی ناسین و زانینی حەقیقەت و ڕاستی شتەکان دەدەن.

سێیەم: دکتۆر سلێمان دونیا لەپێشەکیەکەی کە بۆ کتێبەکەی غەزالی نوسیویەتی، تەنها باسی ئیشکالیەت و گرفتی حەقیقەتی کردووە لەلای غەزالی، بەجۆرێك هێندە ناوەڕۆکی کتێبی(المنقذ من الضلال) ڕزگار کەر لەگومڕایی، باسدەکات، خوێنەری بێئاگا وادەزانێت خەریکی خوێندنەوەی کتێبی(المنقذ من الضلال) نەك کتێبی(میزان العمل). ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەم پیشەکیە بەووردی و دووروودرێژی باسی مەبەستەکانی مونقیزی کردووە، پشت بەستووە بە کۆمەڵێك بەش کە لەقورئاندا لێکۆڵەر باسیکردووە، کە لەم سەردەمەی زانستدا دەرکەوتوون(هەروەك چۆن بەڕاشکاوانە باسیاندەکات). بەڵام لەبارەی باسکردنی میزان العمل وە ئەم لێکۆڵەرە تەنها باسی سوپرایزێك دەکات و بەناوی(المفاجئە) هێناویەتی و مەسەلەی زیندووبونەوە لەلای ئیمامی غەزالی دەوورووژێنێت لەکتێبی میزان العمل دا، یارمەتیش لە هەڵوێستەکەی ئیبن توفەیل وەردەگرێت کە لەکتێبەکەی خۆیدا(حی بن یقظان) باسیدەکات وەك دەقی یەکێك لەکتێبەکانی

غەزالی لەژێر ناونیشانی(فیصل التفرقه بین الاسلام والزندقه) دەیهێنێت، ئەم بەشەش کۆتایی پێدەهێنێت بەڕاگەیاندنی بێتوانایی خۆی لەچارەسەر کردنی ئەم کێشەیەدا و دەڵێت: (خوێنەری بەڕێز من لەمبارەیەوە شتێکم بۆ گوتن نیە کە تایبەت بێت بەم دژیەکبوونەوە، بێجگە لەوەی دەقێکی تر لەدەقەکانی غەزالی لەکتێبەکەیدا بەناوی(فیصل التفرقه بین الاسلام والزندقه) هێناویەتی بخەمە بەردەستت [١٦].

لەکۆتایی پێشەکیەکەشیدا بەشێك لەبارەی صۆفیگەریەوە دەنوسێت، کە مەسەلەی ئاماژە(الرمز) و تئویل و ناخ(الباطن) ی تێدا دەووروژێنێت، بەڵام بەبێ قوڵبوونەوە و هێزی پشتیوانی هیچ جۆرە بەڵگەیەك و ڕوونکردنەوەیەك لەهەڵوێستدا، بەگشتی پێشەکیەکە زۆر گشتگیرە و لەڕێگەی تێگەشتن و لێکۆڵینەوەوە دوورە لەکتێبی مەبەستەوە، سەرەڕای ئەم نەرێنیانەش(السلبیات) بەڵام ئاشکراکردنی ئەم کتێبە بۆ خوێنەرانی زمانی عەرەبی یان خەڵکانی تریش، کارێکی زۆر ئەرێنیە و کاریگەریەکی زۆری هەیە، ئەمەش بەخوێندنەوەیەکی زۆر قوڵ و ووردی ئەو کتێبە و ڕۆچوون بەناو قوڵایی کونج کەلەبەرە شاراوەکانیدا دەبێت، بەهیوای ئەوەی کە ڕوویەکی غەزالیمان نیشانبدات کە پێشتر نەمانبینیبێت، یان چارەسەرێك بۆ چەندین مەسەلەی هەڵواسراوو چارەسەرنەکراو لەبارەی فەلسەفەو صۆفیگەری و هەڵوێستی ناوبراو لەبارەی دژەکانیەوە بدۆزینەوە.

هەموو ئەم تێبینیانەی پێشوو شتەکانی تریش – کە لەنێو ئەم باسەدا پێیان ئاشنا دەبین – بوونە هۆی ئەوەی ئەم کتێبە(میزان العمل) لەناو کتێبەکانی تردا

---

[١٦] المقدمه – لا ١٦٩، لەکتێبی میزان العمل.

هەڵبژێرم، کە ئەوانیش لەگرنگیدا شتێکی ئەوتۆیان لەم کتێبە کەمتر نیە، بەڵام ئەم هەڵبژاردنە هاوڕێیە لەگەڵ بەڵگەیەکی شارستانی و پرسیارێکی فەلسەفیدا کە پەیوەندیان بەسروشتی شوناسی ڕۆشنبیری و ئەو نمونە مرۆییەوە هەیە کە غەزالی بانگەشەی بۆدەکات، کە مەسەلەیەکە شەرعیەتی سەرقاڵبوون پێوەی لە سروشتی واقیعی ژیانەوە وەردەگرێت، ئیتر ئەو واقیعە، واقیع و ژینگەی ئیسلامی بێت یان ژینگە و واقیعی خۆرئاوایی، چوونکە ئەمرۆکە مرۆڤ لەکێشەیەکی شارستانیدا دەژی کە دەتوانین ناوی بنێین کێشەی گەڕان بەدوای نمونەی باڵا، یان کێشەی دەسەلاتی نمونە.

ئێمەی عەرەبی موسوڵمانیش پێش خەڵکی تر ئەم مەسەلەیەمان بەلاوە گرنگە و جێگەی بایەخمانە، چوونکە لەسەر دەمی گۆڕاندا دەژین لەسەر دەمی داگیرکاریەوە(الاستعماری) بۆ سەردەمێکی تر، کە تاوەکو ئێستەش نیشانەکانی بەناداری ماونەتەوە، بێجگە ئەونیشانانەی کە لەخۆرئاواوە هاتوون و جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە پێویستە لەگەڵ نمونەی خۆرئاواییدا تێکەڵ ببین و بڕۆین [17]. تایبەتکردنی ئەم کتێبە بەباسی فەلسەفەی کرداریەوە(پراکتیك) لەلای غەزالی بریتیە لەباسکردنی خودە قوڵبووەکانمان لەناو شارستانیەت و خودە عەودالەکانمانە بەدوای خۆیان لە هەڵدێر و نشێوەکانی جیهاندا، لەوانەیە ئەم کتێبە(میزان العمل) نیشانەیەکی ڕێنمایی بێت بۆلای شتەکان، چوونکە شتەکان بەدژەکانیاندا دەناسرێنەوە، هیچ زیانێکیشی نیە خاوەن کتێبەکە واتە(غەزالی) کە زۆرێك بەچاکە و خراپە باسیانکردووە، ئەگەر خراپەکەش زۆرتر نەبێت، چوونکە

---

[17] مەبەستم کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی نوێیە کە ئەیەوێت جیهانی ئەمڕۆ بەهەموو شێوەیەك بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە.( واتە جیهانگیری(العولمه).

مرۆڤ دووژمنی ئەوەیە کە نایزانێت، لەلایەکی تریشەوە ناکرێت کە شیعارو بانگەوازی مرۆڤی عەودالّی حەقیقەت و ڕاستی لەسەر چاکە گووتن و خراپە گووتنی خەڵکی وەستابێت.

ڕووبەڕووبوونەوەمان لەگەڵ ئەم کتێبەدا گریمانەیەکی فەلسەفی دوور لە کاردانەوەو داوەریە پێشوەختەکان هەڵدەگرێت، کە سەرپەرشتی بەسەر ئێستە و ئایندەدا، لەگەڵ گریمانەیەکی شارستانی چارەنوس سازدا. هەرچەندە غەزالی یەکێکە لە فەیلەسوفە صۆفیەکان، بەڵام خۆ دژ نیە لەگەڵ ئەم سەردەمە زانستیەی ئێمە و کرانەوەکانیدا، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە سەردەمی ئەمڕۆ بەڕووی خەڵکیدا کراوەتەوە، زانستیش بووە بەخەونێك لەخەونەکان، ئیتر بۆچی دەبێت فەلسەفە لەناخیدا پرۆژەیەکی شارستانی نوێی هەڵنەگرتبێت کە ڕەگ و ڕیشەو تۆوەکانی لەڕابوردوی لەناوچووەوە وەر بگرێت، بەڵام زیندووە لە ناخمان و قوڵایی کەسایەتیماندا، چوونکە کەلتور بۆ ڕابوردوو مێژوو نیە بەڵکو بۆ زیندووەکان و نەوەی نوێیە کە بەرەو داهاتوو هەنگاو دەنێن.

لەبەر ئەم هۆکارانە غەزالی و میزان العمل بریتین لە لاکردنەوەیەك بەلای ئەوڕابوردوەی کە لەدڵەکانماندا جێگیر بووە، بەمەبەستی ئامادەکردنی خود و هاندانی بەرەو داهێنان، داهێنانی عەقڵێك کە ئەیەوێت بۆ خۆی و نەتەوەکەشی پرۆگرامی بیرکردنەوەیەکی تایبەت و دیدێکی تایبەتی هەبێت، وەك بەڵگەیەك لەسەر هۆشیاری تایبەت لە هەرسکردنی بزوتنەوەی فەلسەفی نوێ کە ئەمڕۆکە لەجیهاندا بوونی هەیە، لەپاش ئەوەی کە خرابوویە ناو ئەوقۆزاخە دانراوەی فەلسەفەوە کە کەوتووەتە ژێر کاریگەری پێشکەوتنە زانستیەکانەوە. هەرچەندە ناوەڕۆك و گەوهەری بیرکردنەوەی فەلسەفی ڕۆژێك لەڕۆژان دوور نەبووە لەهەموو بەشەکانی

زانستەوە، وەك ماتماتیكی و زانستەمرۆییەكان، هەر لەئەفلاتونەوە تاوەكو سەر دەمێكی نزیك، چوونكە لەوكاتەدا زانستەكان بەسەربەخۆو بەجیا لەفەلسەفە خاوەنی قەوارەیەكی سەربەخۆ نەبوون، هەر لەچركەساتی ئەفلاتونیەوە تاوەكو، بەلآم زاڵی قسەی دانراو كاتێكی دیاریكراوی هەیە لەمێژووی فیكری مرۆڤایەتیدا، واتە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە تێروانینی ئێمەی بەرەو زانست بردووە وەك قەوارەیەكی سەربەخۆ و جیاواز لە قەوارەی فەلسەفی، هەروەك چۆن فەلسەفەی دانراو بنەمای فیكرو بیركردنەوەی گۆڕانكاری خودی [18] كە ڕوویكردووەتە حاڵەتی دانراو(الوضعی) لەپاش تێپەڕبوون لەحاڵەتی لاهوتی و میتا فیزیكەوە، وەهەروەها مەحاڵبوونی پێكەوە ژیانی هەرسێ حاڵەتەكە لەیەككاتدا [19].

ناكرێت بابەتەكە لەیەككاتدا لەحاڵەتێكی دانراوو میتافیزیكیشدا بێت، هەرچەندە پاشماوەی هەردوو ماوەكەی بەسەرەوەیە كە تێپەڕی كردوون، وەك دەرئەنجامێكی ئەم قسەیە منیش پشتگیری سەربەخۆیی زانستەكانم كردووە لەفەلسەفە، بەمانای گۆڕانی مەسەلەكانی فەلسەفە بۆ مەسەلە زانستیەكان، هەربۆیە فەلسەفەم خاڵیكردووەتەوە و هیچ بیانویەكی بۆ بوون نیە، بێجگە ئاگاداربوون لە دەرئەنجامی زانستەكان، هەروەك ئۆگۆست كونت ئەمەی بۆ دیاریكردووە. مێژوو نوسانی فیكر ئەوانەی كە كەوتوونەتە ژێر كاریگەری فیكری دانراوەوە، باسی سەركەوتنەكانی

---

[18] كونت دەڵێت: پێشكەوتنی عەقڵی تاكەكەسی تەنها ڕوونكردنەوەمان ناداتێ، بەڵكو دەبێتە بەڵگەیەكی ناڕاستەوخۆ لەسەر پێشكەوتنی عەقڵی گشتی( فەصڵی یەكەم لە بەشی یەكەمی كتێبی الفلسفة الوضعية).

[19] كونت دەڵێت: عەقڵی مرۆیی بەسروشتی خۆی لەپێشخستنیدا سێ پرۆگرامی فەلسەفاندن بەكار دەهێنرێن، كە لەتایبەتمەندیدا جیاوازیەكی جەوهەریان هەیە، بەڵكو بەرابەربوونێكی ڕیشەداریشیان هەبێت لەنێوانیاندا، واتە لەنێوان پرۆگرامە لاهوتی و میتافیزیكی و دانراو( وضعی) یەكاندا، لێرەوە شوێن سێ فەلسەفە یان سێ سیستەمی گشتی تێگەشتنەكان كە هەریەكەیان شوێنی ئەوانیتر دەكەوێت.

زانستدەکەن لەبەرامبەر گەڕەلاوژێکانی فەلسەفەدا، چوونکە فەلسەفەی کۆن دڵنیایی دروستنەکردووە، هەرچەندە باسیشی لێوە کردبێت، ئەمە لەکاتێکدایە زانست ئەو دڵنیاییەی دروستکردووە، هەروەك خەونێك وایە کە بێتەدی، هەرچەندە ئەم شیکاریە لەناخیدا تەسەوورێکی هەڵە دەشارێتەوە بۆ مەسەلە زانستی و فەلسەفیەکان. چوونکە بابەتی فەلسەفی نەگۆڕاوە بۆ بابەتێکی زانستی هەروەك فەلسەفەی دانراو پێماندەڵێت، بەڵکو دامەزراندنی بابەتی زانستی خراوەتە پاڵ بابەتی فەلسەفیەوە، گرنگی بەزانست دراوە لەسەر حیسابی فەلسەفە. واتە لاوازی فەلسەفە هەرلەسەدەی نۆزدەیەمەوە سەرچاوەکەی ئەو بۆشاییە نەبووە کە فەلسەفەی لەسەر بووە، بەڵکو لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانی تێڕوانینی فەیلەسوفەکان سەبارەت بەبابەتە زانستی و دەرئەنجامەکانی، واتە حاڵەتێکی وەستانە لەئاستی تێڕوانین و تیۆردا، نەك نادیاری خودی مەسەلە تیۆریەکان بێت.

هوسول پێی وایە هەموو زانستەکان بەو هەموو زانستانەشەوە کە پێویستە بنیاتبنرێن و هەموو ئەو زانستانەشی کە چوونەتە بواری کردارەوە، لەکۆمەڵێك لقی ناسەرەکی تێپەڕ ناکەن، لقگەلێکن کە سەربە فەلسەفەن و هیچی تر [٢٠].دواتریش ئەو بەڕاشکاوانە دەڵێت: کە دانراوی(الوضعیة) سەری فەلسەفە دەبڕێت [٢١]. مەسەلە فەلسەفی و میتافیزیکیەکان بریتین لەمەسەلەکانی عەقڵ لەهەموو دیمەنە تایبەتەکانیاندا(چوونکە عەقڵ ڕاشکاوی ئەو بابەتە فەراهەم دەکات کە بابەتەکانی زانست و مەعریفەیان تێدایە، واتە مەعریفەی ڕاستەقینەی بنەڕەتی یانی مەعریفەی عەقڵی، زانستی بەها ڕاستەقینە بنەڕەتیەکان کە مەبەستمان بەهاکانی حەق و

---

[٢٠] هوسول( ازمە العلوم الاروبیە) قلیمار – لا ١٣ بۆ ١٤.

[٢١] هوسول( ازمە العلوم الاروبیە) قلیمار – لا١٣ بۆ ١٤.

ڕاستیە کە بەها عەقلٚیەکانیش یەکێکن لەوان، لەگەلٚ هەلٚسووکەوتی ئەخلاقی واتە هەلٚسوو کەوتی جوانی ڕاستەقینە واتە: ئەو هەلٚسووکەوتەی کە لەعەقلٚی کرداریەوە سەرچاوە دەگرێت)، عەقلٚ لەهەموو ئەمانەدا ناونیشانی فیکرو نمونە ڕەها سەرمەدیە بالاٚکانە بەسەر کاتدا، بەبێ هیچ مەرجێك قبولٚکراوە [٢٢]. دواتریش میتافیزیك – کە زانستی مەسەلە لوتکەیی و بالاٚکانە – دەگەیەنێتە پلەی مەلەکەی ئەو زانستانەی کە بێجگە لەزەینی مرۆڤ نەبێت ناتوانرێت مانا لوتکەییەکەی بدرێت بەسەر هەموو مەعریفەکاندا، مەبەستم لەمەعریفەکان، باقی زانستەکانی ترە [٢٣].

پرسیاری ئەوەی کە ئایا مرۆڤ چیە؟ هەرچەندە پرسیارێکی زانستی تایبەتە بەزانستە مرۆییەکانەوە، لەهەمانکاتیشدا پرسیارێکی فەلسەفیە، بەشداربوون لەناوەکەدا هیچ زیانێکی نیە، جیاوازی لەنێوان هەردوو وەرگرتنەکەدا زۆر فراوانە، پرسیاری گەردیلە چیە؟ زانستە فیزیایی و کیمیاییەکان دەووروژێنێت، لەهەمانکاتیشدا باسە فەلسەفیەکانیش دەووروژێنێت، چوونکە گەردیلە لەزانستدا ئەو گەردیلەیە نیە کە لەفەلسەفە دایە، مادەش لەزانستدا ئەو مادەیە نیە کە لە فەلسەفەدایە، وەهەروەها ئەو مەسەلانەی کە فیکری زانستی و فەلسەفی دەیانگرێتەوە، هەر بەمجۆرەن، چوونکە ئەم بەشداریە لەناودا لەشوێنکەوتوانی فیکری زانستی و دانراوی لەخۆ بایی کردووە و وایلێکردوون کە بلٚێن باسە زانستیەکان بەیەکجاری و کۆتایی پێش باسە فەلسەفی و میتا فیزیکیەکان کەوتوون، چوونکە فیکری زانستی بەهۆی گونجاوی مەنهەجیەت و هۆکارەکانیەوە، توانیویەتی بگاتە مەعریفەیەك کە شاراوە نیە لەلای مەعریفەی فەیلەسوفەکان.

---

[٢٢] هەمان سەرچاوە.

[٢٣] هەمان سەرچاوە

بوونی فیکری زانستی و پێشکەوتن و سەرکەوتنەکانی ناکرێت ناوبنرێت تێپەڕبوون لەفەلسەفە یان قەرەبو کردنەوەی، تەقینەوەی ئەو بەشەی کە دابەشنابێت(گەردیلە) لەزانست و تەکنۆلۆژیادا ڕاستکردنەوە نیە بۆ چەمکی گەردیلەی فەلسەفی، بەڵکو دامەزراندنی چەکێکی زانستیە. بەڵام گەردیلە بەمانا و چەمکە فەلسەفیەکەی وە ك بابەتێکی فەلسەفی تایبەت و سەربەخۆو دوور لەدەستێوەردانی زانستی دەمێنێتەوە. بێگومان هۆشیاربوونەوەی سەردەمی نوێ لەسەر بنەمای گەڕانەوە وەستاوە لەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفی و میتافیزیکی،. بەتایبەت هەروەك هوسرل و برقسون و چەندانی تریش لەسەر ئەو باوەڕەن، هیچ دژبوونێك لەنێوان ئەم دوو گرنگیپێدانەدا نیە، بەڵکو کەش و هەوای مەعریفی لەئەمڕۆدا بەگونجاوتر و بەپیت تر دەردەکەوێت، بەهۆی بەپیتی زانست و مەعریفە هاوچەرخەکانەوە، فەلسەفە لەدەرەوەی خۆی خۆراك وەردەگرێت، پێکهاتنیشی شتێکی کەڵەکە بوو نیە، بەڵکو بریتیە لە کرداری هەرس و گۆڕان و دواتریش پێهێنانی خانەی فەلسەفی و تۆڕی خانەیی فەلسەفی.

هۆشیاربوونەوەی فەیلەسوفیش مانای ئەوە نیە کە زانست لەکێشەدا دەژی، بەڵکو مانای ئەوەیە کە فەلسەفە لەکێشە و گرفتەکەی ڕزگاری بووە. ئەمڕۆکە دەتوانرێت بەیەکەوە باسی زانست و فەلسەفە بکرێت بەبێ ئەوەی کە هەست بە بەرتەسکی و بێزاری بکەین، کە فەلسەفەی دانراو لە دەروونی بیرمەندەکاندا چاندوویەتی، ئەمەش وا لە توانا داهێنانکارەکان دەکات کە لەلایەك جیهانگەلێکی نوێ بخولقێنن، لەلایەکی تریشەوە واقیع و بارودۆخی چاوەڕوانکراو وەدی بهێنن، ئەوەی کە توانای ئافراندنی هێزی داهێنانکارانەی هەبێت، بەدڵنیاییەوە ئامادەباشی پێویستیشی بۆ وەرگرتنی فەلسەفەکانی ڕابوردوش هەیە، کە خستنمانە ناو

چوارچێوەی نازانستی یان پێش زانستیەوە. ئەوەی کە ئێستە زۆر ڕاستترە ئەوەیە کە بڵێین مەعریفەی نازانستی – هەروەك لەبارەی زانستەوە دەڵێین بریتیە لەمەعریفەیەکی نافەلسەفی – بەمانای جیاکردنەوەیە نەك بەباش و خراپ و پێشکەوت و دوا کەوتوو دانە قەڵەم بێت لەیەك هێڵی کاتی و سەردەمی نەگۆڕدا.

لاکردنەوە بەلای فەلسەفەی ئیسلامیدا لەم گۆشە نیگا نوێیەوە، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە فەلسەفە وەك میتافیزیك و تیۆر، تێکەڵ نەبووە بەزانست، واتە بەبێ ئەوەی بکەوینە سەر ڕێڕەوی فەلسەفەی دانراوەوە. ئێمە لەنێو ئەم شێوازە فەلسەفیەدا کە شارستانیەتی ئیسلامی هەر لەلەدایکبوون و گەشەکردن و پێشکەوتنیەوە لەسەردەمی کلاسیکیدا لەگەڵیدا ژیاوە، بیرکردنەوەی جۆراو جۆر و زۆر دەبینین کە بەڕوونی ئەو جیاوازیە ئاشکرا دەکەن کە فیکری ئیسلامی لەسەر بووە لەکۆندا. باس و بابەتگەلێك لەبارەی نەفس و دەروونەوە دەبینین کە دەگەڕێتەوە سەر میتافیزیك، لێکۆڵینەوە گەلێکی تریش دەگەڕێنەوە سەر زانست بەبێ تێکەڵکردن یان کەوتنە ناو ئەوەی کە کامەیان باشترە، سەرەڕای کەوتنە ناو کێشەی بەغەیبی کردنەوە، لەوانەیە ئەم ئازایەتیە فیکریەی کە لەلای زۆرێك لەفەیلەسوفانی ئیسلام هەیە وایلە خوێندنەوەکەیان کردووە کە زۆرێك لەخەڵکی بکەونە تەڵەی دانراوی یان ئەو قوتابخانانەی کە بانگەشەی خاوەنداریەتی هۆکارەکانی خوێندنەوەی زانستی دەکەن، بەلآم ئەگەر بەشێوەیەکی زانستی کەلتوری خوێندنەوە بۆ فەلسەفە بکەیت دەبنیت شتێکە، ئەگەریش بەشێوەیەکی فەلسەفی بیخوێنیتە وە شتێکی ترە. ئەمەی دووەمیان بەزۆری ئامادە نیە و نادیارە.

لەبەردەم ئەم تەسەووڕەدا مەسەلەی خوێندنەوەی فەیلەسوفەکان کێشە و گرفتێکی ئاڵۆز دەووروژێنێت، کە خودی ووروژاندنەکەی گرنتی چارەسەر کردنەکەیەتی، ئەی دەبێت چۆن خوێندنەوە بۆ فەیلەسوفێك بکەین؟ ؟

# قسەیەك لەبارەی پرۆگرامەكەوە

بێگومان ئەم كێشە و ئیشكالیەتە دوو مەسەلەی پەیوەست بەیەكەوە و جیاواز لەیەكیش دەوروژێنێت، یەكێكیان خوێندنەوە چیە؟ ئەویشیان فەیلەسوف كێیە؟

خوێندنەوە پەیوەستە بەكرداری خودی خوێنەرەوە، فەیلەسوف ئەوەیە لەبەرامبەر خودی خوێنەرەوە وەستاوە. یان لەبەر ئەوەیە دوو خودی سەربەخۆن، خودێك كە ئەیەوێت پەیوەندی بەخودێكی ترەوە هەبێت، كە ئامادەباشە بۆ ئەمە، چوونكە كردار پێویستی بەكارایی و شیاوی هەیە، كارایی لە خودەوەیە و شیاویش لە فەیلەسوفەوەیە، نیوەندیش بریتیە لە خوێندنەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە كە خوێندنەوەیەك بوونی نیە مەگەر كاتێك كە پەیوەست بێت بەخودی خوێنەرەوە، ئەمەش خوێندنەوەیەكە بانگەشەی بەرائەتی كردار ناكات، چوونكە لەو ڕوانگەوەی كە خوێندنەوەیە هەر دەبێت پەیوەست بێت بەخودێكەوە، هەروەك چۆن ئەمە مانای ئەوەیە كە ئەم خوێندنەوەیە كارایە لەكەسێكی تری ئامادەباشدا بۆ وەرگرتنی كردار، واتە ئەو خودەی كە بەبێدەنگ دەركەوێت لەبەردەم كرداری خوێندنەوەدا، ئەویش بەو شێوەیە نیە، چوونكە كارایە لە ڕێڕەوی خوێندنەوەدا، كارایی و زاڵیەكەشی یان لەڕووی هەڵبژاردنی بابەتەكەو چۆنیەتی هەڵسووكەوتكردنە

لەگەڵیدا، لەگەڵ ئەوەی کە بابەتەکە بریتیە لە خودی فەیلەسوف ئەوکات دەبێت خوێندنەوەکە فەلسەفی بێت، ئەمەش ناچاریە و ئیختیاری و سەرپشك بوونی تێدا نیە.

واتە لەئاراستە کردنی خودی بابەتەکەوەیە نەك لەهەڵبژاردنی خودی خوێنەرەوە بێت، دواتر خوێندنەوەکە دەبێتە کردارێکی پەیوەندیکردن کە خود پێی هەڵدەستێت و لەیەکەم گومانیشیدا بانگەشەی کارایی بۆ خۆی دەکات، سەر پەرشتی ئاشکراکردن دەگرێتە ئەستۆ بۆ ئەوەی لەناخی کارەکەیدا ئەوە ئاشکرا بکات کە بابەتەکە زیندووە و ئەم حوکمی دەکات و ئاراستەشیدەکات، بەڵکو لەزۆر حاڵەتیشدا بوێری ئەوە لەخۆی نیشاندەدات کە بیخات و ناچاریبکات بۆ ملکەچکردن و گوێڕایەڵی.

ئەمەش جەدەلیەتێکە کە ئاستی پەیوەستبوونی نازانرێت، مەگەر ئەنجامدان و ژیان نەبێت لەناویدا لەدوو توێی پێکهاتەیەکی کارلێك و تێکەڵدا کە تاڵە دەزووەکانی و بابەتی خوێندنەوەکەشی خوێنەر دەیانچنێت. بەمشێوەیەش خوێندنەوەیەکی بابەتیانە لەلای فەیلەسوف دەستناکەوێت، ئەگەر خوێندنەوە بانگەشەی ئەمەی کرد، ئەوە مانای ئەوەیە کە ناهۆشیارو بێئاگایە بە سروشتی جێبەجێکردنی.

خوێندنەوەی فەیلەسوف تەنها خوێندنەوەیەکی فەلسەفیانەیە و هیچی تر، واتە لەرێگەی فەلسەفاندنی خوێنەرەوە دەبێت بۆ خودی خۆی، واتە ئەنجامدانی کرداری فەلسەفاندن لەکارێکی فەلسەفیدا بەئامادەباش دەردەکەوێت و هەردەڵێی بێدەنگە و هیچ رۆحێکی تێدا نیە. بەڵام فەلسەفاندنی خود بێدەنگیەکەی دەشکێنێت و باسی ئەو توانایانە دەخاتە روو کە خودی خوێنەر ئەیەوێت بەپێی ئەو توانایانەی

کە بۆ ئاشکرا کردن و دۆزینەوە هەیەتی باسیانبکات. ئەم توانایەش خۆی لە پێکهاتەکانی خودی خوێنەردایە کە گووتمان بەرائەت قبوڵناکات، ئەمەش مانای ئەوەنیە کە ناپاکی دەق قبوڵناکات، بەڵکو مانای ئەوەیەکە هەڵگری ئامێرگەلێکی خودی تایبەتە کە لەبارەیانەوە بێدەنگە و لەڕووی مێژووییەوە دروستکراوە و لەڕووی دەروونیەوە کارلێکدەکات، بۆ ئەوەی ببێتە ئاشکراکەری میکرۆسکۆب یان نەشتەرێکی نوك تیژی نەشتەرگەری. کاتێك کەمیکرۆسکۆب بابەتەکەی خۆی دروستدەکات، چوونکە تەنها ئەو شتە دەبینینێت کە لەڕووی سروشتی پێکهاتەیەوە ئامادەباشی تێدایە، ئەوا بابەتی لێکۆڵینەوەکە بەکارهێنانی میکرۆسکۆبێکی دیاریکراومان بەسەردا فەرز دەکات، کەواتە گونجاو نیە کە میکرۆسکۆبی شیکاریە پزیشکیەکان بەکار بهێنین بۆ شیکاری سروشتی ئەلیکترۆن، یان بەکارهێنانی مشاری دارتاشی بۆ هەڵکۆڵینی دومەڵێکی پیسی جەستە.

وادەردەکەوێت کە خوێنەر ئەیەوێت بکەرێکی ڕاستەقینە بێت، لەخوێندنەوەیدا، بابەتەکە بەتەواوەتی ملکەچ دەکات، وادیارە کە خوێندنەوە ڕقی لە خوێنەرەکەیەتی، بەپێی پەیرەوێکی دیاریکرا و هەلومەرجی تایبەت، ئەم بۆشاییەی نێوان ئەم دوانە کاردانەوەی قورسی جێبەجێکردنی خوێندنەوە، واتە قورسی دووبکەری ڕووبەڕوی یەکتری، وەهەروەها کاردانەوەی دەوڵەمەندی خوێندنەوەو جۆراو جۆریەکەی و گونجانی ڕوودانی جیاوازیەکان نیشاندەدات، گرەویش لەسەر مەترسی بەدیهێنانی و دەوڵەمەندی بەرهەم و بەپیتی دەکات، ئیتر خوێندنەوەی پاك و ناپاك بوونی نیە، بەڵکو هەوڵی خوێندنەوە بوونی هەیە، چوونکە لەهەمانکاتدا ئاشکراکردنی پرۆگرام و بابەتەکەیشە، ئەمەش ئەرکی فەیلەسوفە لەوکاتەی کە فەلسەفە لێدەدات و فیکری لە شێوازەکانیدا کاردەکات. ئەم بابەتی خۆی لەڕێگەی

دروستکردنی پرۆگرامەکەیەوە دروستدەکات، وە پرۆگرامەکەشی لەڕێگەی دروستکردنی بابەتەکەیەوە بووە. لەوانەیە ئەم بارودۆخە بێت کە ڕاڤەی فرەیی ئیجتیهاد وجیاوازی بەرهەمەکانیان دەکات، بەڵام ڕاڤەی بانگەشەی هەندێك ناکات کە دەڵێن لەقوڵایی بابەتەکە تێگەشتوون، بەشێوەیەکی گشتگیر هێناویانە، کارێکی لەم شێوەیە شتێکی مەحاڵە لەلای ئەو فەیلەسوفەی کە باوەڕی وایە کە خودی خۆی لەنێو مێژووەکەیدا دانیشتووە و خەڵکی تریش لەنێو مێژوویەکی تردا دەژین، لەهەمان کاتیشدا نایەوێت خوێندنەوەکە وەك خوێندنەوەی مێژوو نوسێك بێت. بەڵکو ئەیەوێت وەك خوێندنەوەی فەیلەسوفێك بێت.

خوێندنەوەی جێگیری مێژوونوس، وەك خوێندنەوەیەکی ئاگادارو ئاشکراکەرە، واتە کاری مێژوونوس ئاگاداربوونە لەڕابوردوو، واتە ئاگاداربوونی ئێستە لە ڕابوردوو، بەمەبەستی تێگەشتن لەڕابوردوو، بەو جۆرەی کە ڕوویداوە، وە هەروەها بۆ تێگەشتنی چۆنیەتی بەشداری ئەو ڕابوردووە لە دروستکردنی مێژووی ئەم ئێستەیەدا، واتە مێژوونووس پێی وایە کە بابەتی باسەکەی بەگشتی ئامادەیە و چاوەڕێی ئاشکراکردن و دۆزینەوە و ڕووتبوونەوە دەکات، چوونکە ڕێگرەکانی ئێستە و ڕابوردو دەخاتە نێوان خۆی بابەتەکەیەوە. بەڵام فەیلەسوف هەرچەندە لەئێستەدا دەژی، بەڵام دەزانێت کە ئێستە تەنها پێکهاتەیەکی ئاڵۆزە بەهەموو کارابییەکانی ڕابوردوەوە، وەهەروەها ڕێگری کاتی لەنێوان فەیلەسوف و مەسەلەکەیدا نیە، فەیلەسوف کاتێك بیر دەکاتەوە، بیر لەخۆی دەکاتەوە نەك بیر لەمەسەلەیەکی سەربەخۆ بکاتەوە لەخۆی و لەسەردەمێکی تری بێجگە لەسەردەمەکەی خۆیدا. ئەو لەناخیی خۆیدا دەگەڕێت بەمەبەستی دەرهێنانی جوڵێنەرە شاراوەکانی ناخی، لەبیرگەی ئێستەدا هەڵیاندەکۆڵێت، چوونکە ڕابوردوو

ئێستەو داهاتوو کۆمەڵێك بەربەستن خۆمان دروستمانکردوون بۆ جیاکاریەکی مادی لەنێوان ڕووداوەکاندا، دەڵێین: ئەوە ڕووداوێکی ڕابوردووە، ئەوە ڕووداوێکی ئێستەیە، ئەوەش پرۆژەیەکە بۆ داهاتوو، ئەوە سەردەمێکی ڕێکخراوە کاری ئێستە دەخاتە گۆڕی ڕابوردوەوە کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کەڵەکە دەبێت بەسەر یەکدا، دواتر مێژوونوس ئامادە دەکات بۆ ئەوەی چاڵ هەڵبکەنێت لەنێو ئەم گۆڕانەدا و شتە شاراوە و خەزێنەکانی ئاشکرا بکات، هەروەك بەجێماوە یان هەروەك لەئێستەیدا فەوتاوە و کۆتایهاتووە، بەڵام لەئێستەدا بەشاراوەیی و مردوویی ماوەتەوە، ئەرکیۆلۆجی مامەڵە لەگەڵ مردواندا دەکات و هەرچیەك کە بیەوێت لەگەڵیاندا دەیکات، ئەو چەکە زاڵدەکات بەسەریاندا کە هەڵیدەبژێرێت و لەڕێگەیەوە دەیخوێنێتەوە و بانگەشەی تێگەشتن لەحەقیقەتەکەی دەکات، چوونکە باوەڕی بەبەهێزی ئامێرەکان و کرداری پرۆگرامەکەی خۆی هەیە، بەڵام فەیلەسوف لەسەردەمێکی دەروونیدا دەژی لەوکاتەی کە فەلسەفە لێدەدات، ئیتر لێرەدا ڕابوردوو ئێستە و داهاتوویەك بوونی نابێت، ئەوەی کە حەقیقەتێك دەهێنێتە بوون ئەوە داینەمۆی ئەو فیکرەیە کە فەیلەسوفی تێدا دەژی لەناخیدا، دواتر بەربەستەکان و چەمکەکان کۆتاییان دێت و هەروەك بڵێی لەگەشتێکی کاتی بێ سنوری ڕەهادایە، مرووەکان بەلای ئەمەوە زیندوون و هێزو ئامادەباشی و کاراییەکی بەهێزتر لەزیندووەکانیان هەیە، ئەوانەی کە بەهەڵە پێیانوابووە کە پێشینان مردوون، هەرلەبەر ئەوەی لەنێو ئەماندا ناژین و نایانبینن، واتە ئەوان حوکمیان داوە بەسەر خەڵکیدا بەمردن چوونکە لەنێوانیاندا بەربەستێکی کاتی هەیە و لەبیریان چووەتەوە کە ئەمان دروستکەرینی، وەهەروەها ئەوەش بریتیە لە بەربەستێك لە زەیندا نەك بەربەست بێت لەبووندا.

ئەوەی کە تێرامان لەئەستێرەکان بکات وادەزانێت ئێستە دەبینێت، بەڵام لەڕاستیدا ئەو ئامادەباشی ڕابوردوو دەبینێت کە ئێستەی جوانکردووە. ئەگەر پێوەرەکانی سەردەمی خۆمان و بەربەستەکانی تێڕوانینمان بەکار بهێنین، دەبێت بڵێین ئەستێرەکان مردوون و ئێستە هیچ بوونێکیان نیە. ئەوانە گروپێکن کە بەڵگەن لەسەر بنەڕەتێکی مردوو یان کورت. وە هەروەها جوانی لەچاوەکانماندا دادەماڵرێت و شێوەکە لە خەیاڵماندا تێکدەچێت و ژیانیش لەدەمارەکانماندا ووشکدەبێتەوە. زانست باسی حەقیقەتی خۆیمان بۆ ناکات، ئەگەر وەك شتێکی بابەتی سەیر بکرێت، ئێستەمان ڕێکدەخات، چوونکە تێگەشتنێکی بابەتیانەیە لەناسینی خودی شتێکدا کە لەدەرەوەی ئاسماندایە. خودی گەورەیی ئاسمانیش بوون و ڕاستی و جوانیەکەی دەبەخشێتە ئێستە، چوونمان بۆ ئاسمان ئەستێرەکانی لێدەردەکات، هیچ نابینین و دەستمان ناکەوێت، هەربۆیە سەرسامدەبین و دەبینە کەسێکی خەیاڵاوی، دێینە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەوەی لەسەر زەویەوە لەئاسماندا دەیبینین کۆمەڵێك ئەستێرەی مردوون کە ئێستە هیچ بوونێکیان نیە، ئەوەمان لەبیر دەچێتەوە کە ئەستێرەی ئاسمانن لەسەر زەویدا، واتە گۆڕانی پەیوەندیە کە ئێستە دەگۆڕێت و ئەوەشی کە هەیە ناشیرینی دەکات و دەیشێوێنێت.

ئەگەر ئەمە ڕاستبێت، کەواتە فەیلەسوف لەگەڵ فەیلەسوفەکاندا وەك ئەستێرە مامەڵەدەکات نەك کۆمەڵێك مردوو، بەو مانایەی کە ئامادە باشیەکی هەمیشەییان هەیە، نەك ئەوەی کە لەمێژوودا بن، واتە لەبزوتنەوە و جەدەلیەتدا ئاوێتەیان دەبێت، کە بزوتنەوەی ژیان و جەدەلیەتەکەیەتی، وەك گۆڕ هەڵکەنێك تێکەڵیان نابێت و هەڵناکوتێتە سەریان، ئەو بیریان لێدەکاتەوە و لەگەڵیشیاندا تێدەفکرێت،

بەڵام وەك شێوە گەلێكی بێدەنگ و بێگیان سەیریان ناكات، واتە ئەگەر بمانەوێت فەلسەفاندن بكەین دەبێت وەك فەیلەسوفەكان بكەین، نەك قسەكانی ئەوان بكەین، هەرئەمەشە كێشەی من لەگەڵ غەزالیدا.

ئایا غەزالی فەیلەسوفە تاوەكو بیكەینە بابەتی فەلسەفاندنەكەمان؟

ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم پرسیارە كارێكی ئاسان نیە چوونكە سەرەتا پێویستدەكات فەیلەسوف پێناسە بكرێت، دواتریش دەبێت بەباشی غەزالی بناسین، سێیەمیش باسی ڕاستیەتی و حەقیقەتی بەرابەری و گونجان بكەین لەنێوانیاندا. ئەم كردارە ناشەرعیە هەرچەندە پرۆگرامی بیركردنەوە دەیسەپێنێت، چوونكە ئەو دەرئەنجامەی كە ئێمە پێیدەگەین، وەك بارمتەی ئەو پێدراوانە دەمێنێتەوە كە ئێمە لێیانەوە دەردەچین و تەسلیمیاندەبین، بەتایبەت كاتێك ئەمانەوێت پێناسەی فەیلەسوف بكەین، هەربۆیە ئەو مەسەلەی كە خۆی فەرزدەكات بەسەرماندا ئەوەیە كە دووربكەوینەوە لەم دەستپێكانە و جڵەوەكە شل بكەین بۆ خودی فەلسەفاندن، كە بەشوێن خۆی و چەمك و ماناو پێناسەكان و بۆچوونیدا دەگەڕێت، واتە كرداری فەلسەفاندن پرۆگرامێكە لەمجۆرە كارانەدا خۆی فەرز دەكات، هەرچەندە باسی بابەتەكەی بكەین كە فەیلەسوفە یان دەستیوەردەرە. هەروەك چۆن تایبەتمەندی فەلسەفاندن دەدرێتە پاڵ خودی لێكۆڵەر نەك بدرێتە پاڵ بابەتەكە، چوونكە هەرچەندە بابەتەكە ئاینی یان سیاسی یان كرداری یان هەرشتێكی تر بێت، دەبێت لێكۆڵینەوەكە لەلای ئێمەش فەلسەفی بێت. لەلایەكی ترەوە دەكرێت كە مێك لابكەینەوە بۆ بەرهەم و كارەكانی ئەم پیاوە كە پێیاندەناسرێتەوە، یەكەمین دەرئەنجام كە دەكرێت بەدەستبێت ئەوەیە كە ئەو پیاوێكە كە گرنگی بەلێكۆڵینەوەی پرۆگرامی بیركردنەوە و پێوەرەكانی تێڕوانین دەدات، پیاوێكە كە

دژایەتی هەموو شێوەکانی چاولێکەری کردووە و کاری لەسەر هەموو چەمکەکانی ڕەخنە کردووە، واتە ئەو عەقڵێکبووە کە کاری چەکوش و بیناکردنی کردووە و باوەڕی وایە کە ئازادی مەرجی سەرکەوتنی هەردووکارەکەیە. ئەگەر مەسەلەکە بەو جۆرەیە کە بانگەشەی بۆ دەکرێت، ئەی ئەو دیمەن و دەمووچاوە لێڵە بۆچی دراوەتە پاڵ غەزالی لەلای هەندێك مێژونووسی فەلسەفە؟

وادیارە ئەوانەی کە مامەڵەیان لەگەڵ فەلسەفەی ئیسلامیدا کردووە وەك مێژوونوس مامەڵەیانکردووە نەك وەك فەیلەسوف، وە هەروەها باسەکانیان پیاهەڵدانی و خستنە ڕوویین. هەندێکجار نوسەر چەند لاپەڕەیەك دەنوسێت و بەدوای نەسەب و ڕەچەڵەکی ڕاستەقینەی غەزالیدا دەگەڕێت، ئەو دەبێتە غەزالی، باشە هۆکاری ئەم ناونانە چیە، ئایا دەگەڕێتەوە بۆ زێدی بنەڕەتی خۆی یان دەگەڕێتەوە سەر پیشەکەی باوکی، هەروەك مێژوو نوسەکان هەرچەندە باسەکان بەبابەتیبوونی وەسفدار کراون، هەروەك چۆن لەکرداری مێژوونوسیەکەیاندا دەبێت وابن، ئەوا دەچنە ناو کێڵگەی فیکری فەلسەفیەوە کە لەگەڵ خۆیاندا فیکر گەلێکی خودی و بەها گەلێکی ئامادەو تەحەدی و نیشانەگەلێك کەلەلای ئەوان ئامێرگەلێکی تێڕوانینن ئامادە دەکەن، بەڵام بەلای فەیلەسوفەوە بەربەستگەلێکن کە دەکەونە نێوان ئەم تێڕوانینەوە.

هەربۆیە دەیانبینین کە دەڵێن: خاوەنی(معیارالعلم) پێوەری زانست دووژمنی زانستە. وە خاوەنی(القسطاس المستقیم) مەحەکی تێڕوانین و دابەشکاری دادگەرانە و ڕاست دووژمنی عەقڵە، وە خاوەنی(تهافت الفلاسفه) دووژمنی فەلسەفەیە، وە هەروەها ئەشعەریەکی صۆفیە بانگەشە بۆ مردن دەکات، لەکاتێکدا کە فەیلەسوفەکان بانگەشە بۆ ژیان دەکەن. بەڵام ئەوانەی کە مامەڵەیەکی پیاهەڵدان و

مەدح و سەناییان لەگەڵ غەزالیدا کردووە، ئەوانیش مێژوو نوسن و فەیلەسوف نین، بەڵام شتێك لەخۆیان لەودا شك بردووە و پلە و پایەیان بەرز کردووەتەوە. ئیتر پیاهەڵدانمان کردبێت یان هێرشمانکردبێت، بەڵام بەدڵنیاییەوە لێکۆڵینەوەی فەلسەفە ئامانجێکی تری هەیە، کە ئەیەوێت وەدی بهێنێت، ئەگەر فەیلەسوف لەلێکۆڵینەوەکانیدا مەبەستی بێت. ئەو تەنها لەبەر ئەوە لێکۆڵینەوەی ناکات کە بیناسێت و بەس، بەڵکو لەبەر ئەوە لێکۆڵینەوەی دەکات کە ئەو یەکبوونە فیکریەی کە لەدووتوێی کتێب و موجەلەدەکاندایە ئاشکرای بکات و ئاشناش ببێت لەگەڵ سروشتی ئەو پرۆسەیەی کە فەیلەسوف ئەیەوێت وەدی بهێنێت، بەڵکو تەنانەت ئەیەوێت لەگەڵیدا بچێتە ناو ئیشکالیات و مەسەلەکانیەوە و لەکرداری بیرکردنەوە و ڕەخنە گرتندا بەشدار بێت لەگەڵیدا. هەروەك بڵێی کەسی سەر قاڵ بەفەلسەفە لایەنێك بێت لەمەسەلەکەدا. پرۆژەکەی ئێمە زیاتر بە تەواوی باسی پێویستی تێگەشتن یان تێگەیاندنی فەلسەفەی غەزالیە بەو مانایەی کە دلتای دیاریکردووە، کە کار لەسەر چوونە ناو گوتارو دیاردەکان دەکات، بەمەبەستی تێگەشتن لەمانای دووەمی ناخی ئەو گوتارانە، ئەم چوونە ناوەوەش گونجاو نیە مەگەر بەتێگەشتن نەبێت.

ئەمەش تەنها مانای بیرکردنەوە ناگەیەنێت، بەڵکو لەسەر هاوسۆزی و پێکەوە ژیان و بەشداری ویژدانی وەستاوە، ئەگەر لەوە تێبگات کە دەبێت لەئەزموونی خەڵکی تێبگات، بۆ ئەوەی ئەم هاوسۆزیە سەرکەوتوو بێت پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کەتێدەگات بەپێی توانا بچێتە ناو جیهانەکەیەوە و لەبابەتێکدا بەشداری لەگەڵدا بکات. ماناش ئەوەیە کە تێگەشتن دەرکی دەکات. دلتای ئەم مانایەی پێناسە کردووە بەوەی کە(خۆتێگەیاندن(التفهم) بریتیە لە و ناوەی کە لەکردارەکە

نراوە کە بەهۆیەوە ژیانی عەقڵی دەناسرێت لەنێو ئەو دەربڕینانەی کە لەبارەی هەستە کانەوە پێشکەشیدەکات [٢٤]. هەروەك چۆن مەبەستەکانی ئەم شێوازە و ئامانجەکانی لەتێڕوانین لەکردنەوەی دەرگای فەلسەفاندن و داهێنانی سەر لەنوێ و دەرچوون لەدەرگای چاولێکەری و شوێنکەوتن، دیاریدەکات، ئامانجی ئێمەش ئەوەیە کە ببینە قوتابی لەبەردەم ئەم فەیلەسوفانەدا. وەکاتێکیش بەڕاستی دەبینە قوتابیان کە خۆمان لەگەڵ سروشتی بابەتەکاندا بگونجێنین و هەروەك چۆن ئەوان لەگەڵ کارەکانیاندا دەجولێنەوە ئێمەش بەو شێوەیە بجولێینەوە [٢٥].

ئەم شێوازە هەمان ئەو شێوازەیە کە فەیلەسوفەکان لەژێر بنەماکانی تەئویلدا کە دەتوانین بەمانا ڕوشدیەکەی دیاری بکەین پەیڕەویانکردوە و ئەنجامیانداوە، کە لە کتێبی فصل المقالدا گوتوویەتی(مانای تەئویل بریتیە لەدەرهێنانی مانای زاراوە لەدەلالەت و مانای مەجازیەوە بۆ مانا حەقیقی و ڕاستەقینەکەی، بەبێ ئەوەی ئەمکارە کەموکورتی لەزمانی عەرەبدا دروستبکات لە تێپەڕبوون و بەدروستزانینی ناونانی شتێك بەلێکچووەکەی یان بەهۆکارەکەی یان بە ئەوەی کە پێی دەگات یان بەوەی کە پێیەوە دەلکێت، یان بەشتانێکی تر کە لەپێناسەی بەشەکانی قسەی مەجازیدا دیاریکراون [٢٦].

جورجانیش لە(التعریفات) پێناسەکاندا، دەڵێت: تەئویل لەئەصلدا بەمانای(ترجیح) گەڕاندنەوە دێت، لەشەرعیشدا بریتیە لە لادان لەمانای دیاری قسە بۆ لای مانایەك کە گریمانی ئەوە هەیە کە ئەو مانایە بگەیەنێت، ئەگەر مانا

---

[٢٤] فیلهایم دلتای: بیرۆکە گەلێکن لەزانستی دەروونزانی وەسفی و شیکاریدا. لەکتێبی جیهانی فیکردا هاتوون.

[٢٥] سەیری کتێبی( الموضوعیة فی العلوم الإنسانیة) د صلاح قنصوە لا ١٦٧ – ١٨٧ بکە.

[٢٦] ابن رشد( فصل المقال) المطبعة الکاثولیکیة ١٩٦١ لا ٣٥.

گریمانیەکە گونجاو بێت لەگەڵ قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا [٢٧]. کەواتە تەئویل بریتیە لەدەرچوون لەمانای ڕواڵەتی و دیار بۆ لای مانای شاراوە و نادیار، یان تێپەڕبوون بۆ ناخ، واتە چوون بۆ لای ئەو حەقیقەتەی کە دیمەنێکی هەیە و خۆی پێدەردەخات، یان وەك نیشانەیەکە کە پێی دەناسرێتەوە و بەکاریشدێت بۆ گەشتن پێی، لەخودی خۆی و شاراوەییەکەیدا، هەروەك بڵێی هیچ زانستێك نیە مەگەر شاراوە نەبێت. زانستی ڕاستەقینەش ئەوەیە کە بتوانێت بچێتە ناو مانا شاراوەکانەوە و ئاشکرایان بکات، هەروەك چۆن غەزالی خۆی لە کتێبی(المنقذ من الضلال) دا پێناسەی دەکات بەوەی کە: (زانست بریتیە لە یەقین و دڵنیایی کە شتە دیارەکانی تێدا ئاشکرا دەکرێت بەجۆرێك جێگەی هیچ شك و گومانێکی تێدا ناهێڵێتەوە). ئاشکراکردنی مانای دیار بریتیە لەزانستی دڵنیایی ئاشکراکردنیشی تەنها بەلابردنی پەردەکان دەبێت لەسەری، ئەمەشە ئەرکی تەئویل کردنەکە کە بەدەر نیە لە مەترسیەکان و مرۆڤ ناچاردەکات کە بکەوێتە سەرەڕۆییەوە. وەك چاولێکەری لەخودی غەزالی کە گوتوویەتی(من ئێستەش لە سەرکەشیەکانی لاویەتیدام، دەچمە ناو شەپۆلەکانی ئەم دەریا قوڵەوە و وەك بوێرەکان لەناویدا خۆم نغرۆ دەکەم، نەك وەك ترسنۆکە خۆپارێزو خۆلادەرەکان، دەچمە ناو هەموو تاریکیەکەوە و هێرشیش دەکەمە سەر هەموو کێشەیەك و خۆم تێکەڵی هەموو گرفتێکیش دەکەم) [٢٨].

کەواتە بێجگە لەوەی کە بەناچاری دەبێت بچینە ناو جیهانەجۆراو جۆرو بەپیتەکەی غەزالیەوە ڕێگەیەکی ترمان لەبەردەمدا نیە، بۆ ئەوەی بەشداری بکەین

[٢٧] التعريفات – للجرجاني دار الكتب العلمية بيروت ١٩٦٨ لا ٥٠.

[٢٨] المنقذ من الضلال – غزالي – لا ٧٩.

له خەم و کێشەکانیدا و لەگەڵ دڵەڕاوکێ و دڵنیاییەکانیدا بەئاشکرا بژین، لەڕووناکی ئەزمونەکانی ڕووناکی پێویست وەربگرین بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگامان و بەرچاو ڕوونیەکی تەواو، وا لەخۆمان بکەین کە غەزالی لەکتێبی میزان العمل دا لەبارەیانەوە دەڵێت: : (لەدوا ڕۆژدا و لەکۆتایی کارەکەتدا لەستەمی سەرکردەکەت تێدەگەیت، کەواتە ڕزگار بوون نیە مەگەر بەسەربەخۆیی نەبێت).

ئەوە وەربگرە کە دەیبینیت، واز لەشتێکیش بێنە کە بیستووتە، (لەکاتی خۆرهەڵهاتندا پێویستت بە زوحەل نیە بۆ چی لە ڕێڕەوی ئەم ووشانەدا تەنها شتێك وەردەگریت کە لەبیرو باوەڕەکەتدا توشی گومانت دەکات، بۆ ئەوەی پەشیمان ببیتەوە، وازی لێبهێنە چوونکە بێ سوودە، چوونکە گومان و دوودڵیەکان مرۆڤ دەگەیەنن بە حەق و ڕاستی، هەرکەسێك گومان نەکات تێڕوانینیشی نیە، هەرکەسێکیش تێڕوانینی نەبوو بینایی نیە، هەرکەسێکیش بینایی نەبوو بەکوێری و گومڕایی دەمێنێتەوە، پەنا دەگرین بەخودا لێی، درود و سلاوات بۆسەر گیانی پاکی گەورەمان محمد و ئال و بەیت و هاوەڵانی) [٢٩].

---

[٢٩] میزان العمل — غەزالی لا ١٣٧.

# دەستپێك

# پێگەی( میزان العمل ) لەناو کتێبەکانی غەزالیدا

غەزالی ڕاستیەتی و حەقیقەتی کتێبی(میزان العمل) واتە: تەرازووی کار و پێگەکەی لەنێو کتێب و دانراوەکانی خۆیدا لەهەمان کتێبدا دیاریکردووە و دەڵێت: : (ئەو بەختەوەریەی کەخواستی پێشینان و پاشینانە، بەدەست نایەت مەگەر بەزانست و کردار نەبێت، دەبێت بەباشی حەقیقەت و ڕاستیەتی و ئەندازەی هەریەکەیان بزانرێت، وەهەروەها پێویستە زانست بناسین و لەگەڵ شتەکانی تردا بەپێوەر جیابیکەینەوە، هەرکاتێکیش لەمکارە بووینەوە، ئەوا دەبێت کرداری بەختەوەری هێنەر بناسین و لەگەڵ کارو کرداری بەدبەختی هێنەردا لەیەکتریان جیابکەینەوە، ئەمەش پێویستی بە تەرازوویەك هەیە [٣٠].

لەم دیاریکردنەوە تێدەگەین کە غەزالی گرنگیەکی زۆر گەورەی داوە بە پێوانە کردن و ئەندازەگیریەکان، بەمەبەستی بەدیهێنانی بەختەوەری کە خواستی پێشینان و پاشینان بووە، ئێمەش دەتوانین پشتگیری ئەم دیاریکردن و پیناسەکردنە بکەین کە غەزالی کردوویەتیی هەر لە خاڵی دەستپێکی سەرەتای

---

[٣٠] میزان العمل لا ٥ دارالکتاب العربی ١٩٨٣.

کتێبەکەیەوە، ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی سەیری دانراوەکانی بکەین، کە لەڕێگەی گونجانە لۆژیکیەکانیانەوە ڕوونی ئەو شێوازەمان نیشاندەدات کە غەزالی لەسەر بووە، هەرلەکتێبی(مقاصد الفلاسفه) وە، چوونکە غەزالی لەم کتێبەدا قسەیەکی کورت و گشتگیری لەبارەی مەبەستی زانستە مەنتیقی و سروشتی و ئیلاهیەکاندا کردووە بەبێ جیاوازی لەنێوان ڕاست و ناڕاستیاندا [٣١].

مەبەستی کتێبەکە باسکردن و گێڕانەوەی مەبەستی فەیلەسوفەکانە(مقاصد الفلاسفه) کە کردوویەتی بەناو بۆ کتێبەکەی [٣٢]، واتە ئەوەی کە هێناویەتی لە چیرۆك و بەسەرهات تێپەڕناکات، بەبێ لێکۆلینەوە لە ڕاست و ناڕاست و باش و خراپی بەسەرهات و گێڕانەوەکان [٣٣].

بەلآم ئەم مەبەستە تەنها پێشەکیەکە بۆ کارێکی درێژ و پرۆژەیەکی فەلسەفی زەبەلاح کە غەزالی پلانێکی ناوو نیشان ڕوون و هەنگاو ووردی بۆ داناوە، کە کتێبی یەکەمی واتە(مقاصد الفلاسفه) وەك پێشەکی وایە، کە غەزالی تێیدا دەڵێت: : (لەپاشان: تۆ قسەیەکی دڵنەواکارت لە ئاشکرا کردن و دۆزینەوەی گەڕەلاوژێی فەیلەسوفەکان و دژو پێچەوانە بوونی بۆچوونەکانیان و شاراوەیی شەیتانیەتیان و سەرکەشیانەوە دەستکەوتووە، ئێمە ناتوانین فریات بکەوین تاوەکو خۆت بەباشی لەمەزهەب و عەقیدە و بیروباوەڕەکانیان تێنەگەیت، چوونکە وەستان لەسەر خراپەی مەزهەبەکان بەبێ ئەوەی بەباشی بیانناسیت شتێکی نەگونجاوو مەحاڵە، بەڵکو خۆ فڕێدانە نێو تاریکی و ڕۆشتنە بەسەر ڕێگەی گومراییدا [٣٤]. وەهەروەها

---

[٣١] مقاصد الفلاسفة – لا ٣١ تحقيق د سلمان دنيا دار المعارف بمصر سلسلة ذخائر العرب ١٩٦٠.

[٣٢] سەرچاوەی پێشوو – لا ٣١.

[٣٣] هەمان سەرچاوە لا ٣٢.

[٣٤] هەمان سەرچاوە لا ٣١.

غەزالی لەم کتێبە پێشەکیەیدا بنەماکان و پایەکانی پرۆژە فەلسەفیەکەی ڕووندەکاتەوە و لە(عەقڵ) و(حەق) و ڕاستیدا کورتیاندەکاتەوە، ئەم دوو ووشەیە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە غەزالی پشت بەهەمان هۆکارو ئامێر دەبەستێت کە فەیلەسوفەکانیش بەکاریان هێناوە بۆ هەمان ئامانج و مەبەست، واتە هەم عەقڵ و هەم پرۆگرامی عەقڵیش ئامێرو هۆکارێکی هاوبەشە لەنێوان غەزالی و فەیلەسوفەکاندا، وەهەروەها حەقیش ئامانجێکی هاوبەشە لەنێوانیاندا، وەهەروەها جیاوازیەکە لەئاستی گەڕەلاوژێ و دژایەتی تێپەڕ ناکات، واتە ئەو جێبەجێکاریەی کە بە(مقاصد الفلاسفە) دەستیپێکردووە و بە کتێبی(تهافت الفلاسفە) کامڵی کردووە، بووەتە هۆی ئەوەی کە پێویست بێت باسی پێوەر و پیوانە کردنەکان بکات، چوونکە غەزالی هەر لەکتێبی(مقاصد) دا لەقسەکانیدا ئەوەی ئاشکرا کردووە کە(حەق باتڵی تێکەڵ کراوە، ئەوەشی کە چاکە هەڵەی تێکەڵ کراوە، کەواتە ناتوانین بەسەرکەوتوو دوڕاو حوکمی بەسەرداْ بدەین) [٣٥].

هەربۆیە پێویستمان بە کێشانەیەك هەیە کە توانای جیاکردنەوە و ڕێکخستن و دانانی هێڵی جیاکەرەوەی هەبێت لەنێوان حەق و ناحەق و ڕاست و هەڵەدا. لەپێوەری زانست(معیار العلم) دا هاتووە: (کاتێك لە قسەکاندا خلیسکانەکان و خرۆشانەکانی گومڕایی زۆر بوون و ئاوێنەی عەقڵیش لەو پەڵە و لێلیانەی کە بەهۆی تێکەڵکردنی وەهم و ئاوەژوو کردنەکانی خەیاڵەوە ڕزگاری نەبووەو لێڵ بووە، هەربۆیە ئەم کتێبەمان ڕێکخست کە ببێتە پێوەرێك بۆ تێڕوانین و ئیعتیبار و کێشانەیەکیش بۆ باس و بیرکردنەوە و سافکردنێك بۆ زەین و بەرگێکی پارێزەریش بۆ هێزی بیرکردنەوە و عەقڵ... ئەوەش بزانە هەر بیرو بۆچوون و تێڕوانینێك کە

---

[٣٥] هەمان سەرچاوە لا ٣٢.

بەم کێشانەیە نەکێشرێت و پێوانە نەکرێت دڵنیا بە کە خراپ و ناپەسەندە و کونج و کەلەبەر و قولأییەکانی مەترسیدارن)[٣٦]. غەزالی لەهەندێك لەکتێبەکانیدا ئەم پێوەرەی ناوناوە دابەشکاری ڕاست و دروست(القسطاس المستقیم)[٣٧] و بۆتەقە و مەحەکی تێڕوانین(محك النظر) لەهەندێك دانراوی تریدا. ئەگەر ئەمە هەنگاوەکانی غەزالی بن، ئەوا دانپێدانانمان بەوەی کە غەزالی ناکرێت فەیلەسوف نەبێت دانپێدانانێکە کە بەڵگە و بیانو هەیە بۆی، بەپشتبەستن بەسروشتی خودی قسەی فەلسەفی، چوونکە قسەیەکە لەسەر عەقڵ وەستاوە و ئامانجیشی حەقە و مەرجیشی ئەوەیە کە دژبەیەکی تێدا نەبێت لە زەمینەیەکی ئازاددا کە لەئاستی چاولێکەری بەرزتر بووبێتەوە و گەشتبێتە پێگەشتن و بەرزی بینایی و بەصیرەت[٣٨]. ئەمەش زەمینەیەکە غەزالی هەرلەسەردەمی منداڵیەوە لێکۆڵینەوەی لەبەهاکەی کردووە، هەروەك لە مونقیزدا بۆمان باسدەکات(تینویەتی بۆ تێگەشتن و دەرککردنی حەقیقەت و ڕاستی شتەکان، ڕێگە و تێڕوانینم بووە هەرلەسەرەتای بەهاری ژیانمەوە وەك غەریزە و فیترەتێکی خودایی بووە لەناخمدا کە بەبێ وویستو ئارەزوی خۆم ئافرێنراون، تاوەکو وایانلێکردووم کە چاولێکەری تێدا نەهێشتووم و بیروباوەڕە بۆماوەییەکانی هەرلەسەرەتای سەردەمی منداڵیمەوە لەدڵ و دەروونمدا تێکشکاندووە)[٣٩].

ئەگەر کتێبی(مقاصد الفلاسفە) پێشەکیەك بێت کە مەبەست لە پرۆژەکەی لێدانی فەیلەسوفەکان نەبێت، بەڵکو ئامانج لێی(تێگەشتن بێت لە

---

[٣٦] معیار العلم لا ٦٠ تحقیق د سلیمان دنیا – دار المعارف بمصر الطبعة الثانیة ١٩٦٩.

[٣٧] کتێبی قیستاس لا ٤٢.

[٣٨] المنقذ من الضلال لا ٧٧ تحقیق د جمیل صلیبا و د کامل عیاد – دار الأندلس للطباعة والنشر ١٩٨٧.

[٣٩] المنقذ من الضلال لا ٧٧ تحقیق د جمیل صلیبا و د کامل عیاد – دار الأندلس للطباعة والنشر ١٩٨٧.

دەرککردنی(ئامانجی زانستەکان و نهێنیەکانیان) [٤٠]. ئەم پرۆژەیەش تەنها بە پەیڕوکردنێکی ڕەخنەیی دەبێت بۆ سروشتی زانستی باوو بڵاو لەنێوان فەیلەسوفەکان و شوێنکەوتووەکانیان لەگەڵ ئەو گروپە جیاوازانەی کە هەریەکەیان بانگەشەی خاوەنداریەتی حەقیقەت و ڕاستی دەکەن، (هەموو گروپێك وا گوماندەبات کە ڕزگار بووە، هەموو گروپێکیش دڵخۆشە بەو عەقیدە و بیروباوەڕەی کە لایەتی) [٤١].

ئەم پەیڕەو کردنە ڕەخنەییەش کە غەزالی پێی وایە لە کتێبەکەیدا(تهافت الفلاسفه) پێی گەشتووە و گەیاندوویەتیە ئەنجام، تێیدا باسی سروشتی ئەو پەیڕەوکردنە فەلسەفیەدەکات کەغەزالی لەیۆنانیەکان و هەموو ئەو فەیلەسوفانەی کە باوەڕیان بەبیرکردنەوە و تێڕوانینی ئازادو پرۆگرامدار هەیە وەریگرتووە، لەوانەیە ئەرستۆ باشترین نمونە بێت کە بتوانین ئامازەی پێبکەین، کاتێك کە ڕەخنەی لەتیۆرەکەی ئەفلاتونی مامۆستای خۆی گرت و پەندەکەی گووت [٤٢]. ئەم

---

[٤٠] المنقذ من الضلال لا ٧٧، تحقيق د جميل صليبا و كامل عياد دار الأندلس للطباعة والمشر ١٩٨٧.وە هەروەها لەهەمان کتێب لە لا ٨٣ ئەم قسەیەی غەزالی هاتووە کە دەڵێت( خواستی من بوونی زانیاریە لەبارەی ڕاستیەتی شتەکانەوە).

[٤١] المنقذ من الضلال لا ٧٨.

[٤٢] لەکتێبی( علم الاخلاق الى نيقوماقوس) ی ئەرستۆ لەکتێبی یەکەم بابی سێیەم بڕگەی یەکدا هاتووە: ( لەوانەیە گونجاوبێت کە لێکۆڵینەوە بکەیت لەمانای خێردا بەگشتی، ئەوکات لەمانای ووشەکە بەتەواوەتی تێدەگەین. لەگەڵ ئەمەشدا من نایشارمەوە کە باسێکی لەمشێوەیە لەوانەیە بەلای ئێمەوە هەندێك بێزار کەر بێت مادەم کە مەزهەبی نمونە خەڵکانێکی بەرێزتر لەئێمە دایانناوە، بەڵام گومانی تێدا نیە کە لەداهاتوودا ئەوە دەزانین و دەیبینین وەك ئەرکێکی ڕاستەقینە لەلای ئێمە کە لەبەر بەرژەوەندی حەق ڕەخنەش لە بۆچوونەکانی خۆماندەگرین، بەتایبەت مادەم من بانگەشەی ئەوە دەکەم کە فەیلەسوفم، هەربۆیە لەنێوان ڕاستگۆیی و حەقدا کە هەردووکیان لەلای ئێمە خۆشەویستن، هەربۆیە پێمانوایە پێویستە لەسەرمان حەق پێشی هەمووشتەکان بخەین.

نەریتەی کە ئەرستۆ لەسەری ڕۆشتووە، کاتێك بەهەڵوێستێکی ڕەخنەییەوە لەبەرامبەر مامۆستاکەیەوە وەستاوە، بەهەمان شێوەو بەڕوونیش لەهەڵوێستەکانی لەبەرامبەر فەیلەسوفەکانی تری پێش خۆیەوە ئەم نەریتە ڕەخنەییە دەبینین، ئیتر لەگەڵ هیرقلیتدا بێت یان برمنید و دیموقریت، یان لەگەڵ سوفستائیەکاندا، بەڵکو دەتوانین بڵێین ئەم هەڵوێستە ڕەخنە ئامێزانەیە کە ئەرستۆیان دروستکردووە، هەروەك پێشتر ئەفلاتون و سوقراتیشیان دروستکردووە و نازناوی بروسکەداریان لێنراوە، وەهەروەك چۆن فەیلەسوفەکانی تریش دروستدەکات کە پاشتر هەموو دونیا پڕدەکەن لەنوسین و ڕەخنەکانیان کە نیچە ئاماژەیان پێدەکات و ناویان لێدەنێت چەکوش، هەروەك چۆن پێشتریش ئەفلاتون بە دڕۆخستنەوەیەکی پێش هەموو دامەزراندنێك(الدحض) ناوزەدی کردوون.

فەیلەسوف لەلای ئەرستۆ تاکە کەسێکە کە توانای سەرخستنی حەق و ڕاستی و بەدرۆخستنەوەو ڕووبەڕووبوونەوەی ناڕاست و هەڵە و بەتاڵی هەیە، بەڵکو دیارترین سیفەتێك کە بتوانین پێناسەی فەیلەسوفی پێبکەین بریتیە لەئازایەتی لەقسەکردندا، هەربۆیە گوتمان غەزالی لەپرۆژەکەیدا فەیلەسوفێکی خاوەن بڕیارو ئازابووە لەقسەکانیدا، چوونکە ڕەخنەی لەفەیلەسوفەکان گرتووە، هەروەك چۆن لەهەردوو کتێبی خۆیدا(مقاصد الفلاسفه — وتهافت الفلاسفه) دا ڕوونبووەتەوە، واتە کارەکەی تەنها ڕووینەکردووەتە خودی فەلسەفە، وەگەرنا هەرکەسێك ڕەخنەی لەفەیلەسوفەکان گرتبێت لەفەلسەفە دەرچووە، ئایا نرخ و بەهای سوقرات و ئەفلاتون لەڕەخنەگرتنیدا نەبووە لە سوفستائیەکان؟ وە هەروەها نرخ و بەهای ئەرستۆ لەڕەخنەگرتنەکانیدا نیە لە ئەفلاتون و موحەدیسەکان، وە هەروەها نرخ و بەهای دیکارت لە ڕووبەڕووبوونەوەیدا بووە لەگەڵ فەیلەسوفە مەدرەسیەکاندا، بەهاو

نرخی کانت لەڕووبەڕووبوونەوەیدا بووە بۆ دیکارت، بەهای هیگڵیش لەڕەخنەگرتنیدا بووە لە کانت و گەورەیی مارکسیش لە ڕووبەڕووبوونەوە و ڕەخنەگرتنیدا بووە لە هیگڵ. بەهای کاری فەیلەسوف یەکەمجار خۆی لە ئاستی ڕاستیەتی ئەوزانیاریانەدا دەبینێتەوە کەلەبارەی فەیلەسوفەکانی پێش خۆیەوە دەیزانێت، دووەمیش لەئاستی هێزو قوڵی ئەو ڕەخنانەدایە کە لەفەیلەسوفەکانی تری دەگرێت، سێیەمیش پەیوەستە بەهێزی ئەو دڵنیایی و یەقینەوەی کە بنیاتی دەنێت وەك لەبرو جێگرەوەیەك بۆ قسەی فەیلەسوفەکانی پێش خۆی کە ڕەتیکردوونەتەوە و بێمانایی ئاشکرا کردوون، کارەکانی غەزالیش دەڕژێنە ناو ئەم مانایەوە، بەڵکو غەزالی لەهەموو هەنگاوەکانیدا زۆر ڕوونبووە و خۆی لەتێکەڵکردن لاداوە، چوونکە ئامانجی کتێبی(مقاصد الفلاسفه) لەئامانجی کتێبی(تهافت الفلاسفه) جیاوازترە.

غەزالی لە تەهافوتدا دەڵێت: : (کاتێك ئەم دەمارە لەرزۆکەم لەو بێئەقڵانەدا بینی بڕیارمدا ئەم کتێبە بنوسم، وەك ڕەتدانەوەیەکی فەیلەسوفانی پێشین، بۆ ئەوەی گەڕەلاوژێی بیروباوەڕەکانیان و دژ بوونی هەریەکەیان لەگەڵ یەکتریدا سەبارەت بەئیلاهیات دەستنیشانبکەم، بەجۆرێك کە توانیومە زیادەڕەوی و نهێنیە بێماناکانی مەزهەبەکەیان ئاشکرا بکەم، کە بەڕاستی جێگەی پێکەنینی ئاقڵەکان و پەند و ئامۆژگاریە بۆ کەسانی زیرەك و شارەزا [٤٣]. لەپاشان غەزالی ئەم فەیلەسوفانە لەنێو کەسایەتی فارابی و ئیبن سینادا دیاریدەکات، چوونکە لەفەلسەفەکەیاندا پشتیان بەقسەی ئەرستۆ بەستووە، کە ڕەتی ئەفلاتونی مامۆستای خۆی داوەتەوە. هەربۆیە غەزالی ئامانجی کتێبەکە ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: : (هەربۆیە ئێمەش بەپێی قسەی نقڵکراوی ئەم دووپیاوە مەزهەبەکەیان

---

[٤٣] تهافت الفلاسفة – لا ٧٥ تحقيق د سليمان دنيا – الطبعة السادسة، دار المعارف – ١٩٨٠.

ڕەتدەکەینەوە بۆ ئەوەی قسەکان بەپێی بلاو بوونەوەی مەزهەبەکان بلاو نەبنەوە)[٤٤].

بەلام پالنەری پشتی ئەم ڕەخنەیە غەزالی بەم قسەیەی دیاریکردووە کە دەلێت: : (لەپاشان: من کۆمەلێکم بینیوە کە باوەڕیان وایە لەخەلکی بەرزو دیار جیاوازترن و لەوان زیرەکتر و شارەزا ترن، ئەرکە ئیسلامیەکانی پەرستشیان ڕەتکردووەتەوە و شیعارەکانی ئاینیان سوك کردووە)[٤٥]. تادەگاتە ئەوەی کە دەلێت: (سەرچاوەی کوفرو بێباوەریەکەشیان بیستنی کۆمەلێك ناوی گەورەیە وەك سوقرات و بوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆتالیس و نمونە و هاوشێوەی ئەمانە)[٤٦].

ئەوە ڕووندەبێتەوە کە کتێبی(تهافت الفلاسفه) حیکمەتەکەی بریتی بووە لە هۆکارو بارودۆخ گەلێك کە لەچوارچێوەی مەعریفی ئەو سەردەمەدەرناچن کە تێیدا پەیڕەو کراوە، چوونکە ئەبستمیەتی ئەو سەردەمە و بەپێی شاهێدیدانی غەزالی ژەهراوی بووە بە ڕۆشنبیری فەلسەفی کە کاریگەریەکی سەرکەشی هەبووە و بەجۆرێك بلاو بووەتەوە کە خەلکی بەگشتی شوێنیان کەوتوون و بەدەم بانگەوازەکانیانەوە چوون، بوونەتە چاولێکەری نا موجتەهید، (تاکە بەلگەی ئەم کوفر کردنەشیان بریتیە لە چاولێکەریەکی بیستراوی نەریتی خوو گرتنی کوێرانە)[٤٧].

---

[٤٤] تهافت الفلاسفة – لا ٧٨ تحقيق د سليمان دنيا – الطبعة السادسة، دار المعارف – ١٩٨٠.

[٤٥] تهافت الفلاسفة – لا ٧٣ تحقيق د سليمان دنيا – الطبعة السادسة، دار المعارف – ١٩٨٠.

[٤٦] تهافت الفلاسفة – لا ٧٤ تحقيق د سليمان دنيا – الطبعة السادسة، دار المعارف – ١٩٨٠.

[٤٧] تهافت الفلاسفة – لا ٧٣ تحقيق د سليمان دنيا – الطبعة السادسة، دار المعارف – ١٩٨٠.

ئەم بڵاو بوونەوەی ڕۆشنبیری فەلسەفیە خەڵکی والێکردووە کە شتەکان تێکەڵبکەن و جیاکاری نەکەن لەنێوان زانستە دڵنیاو یەقینیە حیسابی و مەنتیقی و لۆژیکیەکان و زانستە زەننی و گومانایە ئیلاهیەکان، ئەم بڵاوبوونەوە بەربڵاوەی فیکری فەلسەفی و ئەم تێکەڵکردن و ناڕوونی و ئەو دەرئەنجامە نەرێنیانەی کە لەم شتانە دەکەونەوە، هۆکاری ڕاستەوخۆو پاڵنەری سەرەکین بۆ ئەوەی غەزالی بەئاراستەیەکی نوێ فەلسەفە بنوسێتەوە و جیاکاری بکات لەنێوان سێ جۆری قسەدا(قسەی بەڵگەیی(البرهانی)، قسەی ووتاری(القول الخطابی)، قسەی دیالیکتیکی و لێکۆڵینەوەیی(الجدلی)، ئەمەش بەپێی ئەو ڕیزبەندیەی کە غەزالی هێناویەتی و هەروەك خۆی دەڵێت: (لەقورئانی پیرۆز هەڵیگۆزیوە) [48].

ئەگەر ئەهلی ئامۆژگاری بە حیکمەت و دانایی تێربکرێن، ئەوا زیانیان پێدەکات، هەروەك چۆن منداڵی شیرە خۆر ئەگەر خۆراك و گۆشتی پەلەوەری پێبدرێت زیانی پێدەگات و نەخۆشدەکەوێت، موجادەلەش ئەگەر لەگەڵ ئەهلی حیکمەت و داناییدا بەکارت هێنا پێی تێکدەچن هەروەك چۆن پیاوی پێگەشتوو بەو شیرە تێکدەچێت

---

[48] لەکتێبی( القسطاس المستقیم) دا ئەم قەسەیەی غەزالی هاتووە( بەڵام تەرازووی بۆچوون و قیاس حەشای لێبێت ئەوە شەیتانە و پەنا دەگرم بەخودا، ئەوە تەرازوو کێشانەو پێوەری شەیتانە، هەرکەسێکیش لەهاوەڵانم واگوماندەبات ئەوە تەرازوو پێوانەی زانست و مەعریفەیە، ئەوا لەخودا دەپارێمەوە کە خراپەی لەسەر دین کەمبکاتەوە، چوونکە هاوڕێیەکی نەزانی دین خراپترە لەدووژمنێکی ئاقڵی ئاین، ئەگەر کەسێك بەختەوەری مەزهەبی فێربوونی پێبەخشرا، ئەوا پێویستە لەسەری سەرەتا دیالیکتیك و لێکۆڵینەوەی قورئان بزانێت، هەروەك خودای گەورە دەفەرمێت( ادع الی سبیل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتی هی احسن) واتە: خەڵکی بە دانایی و ئامۆژگاری جوان بانگبکە بۆسەر ڕێگەی خوداکەت، بە جوانترین شێوەش موناقەشە و موجادەلەیان لەگەڵدا بکە. ئەوەش بزانە کە ئەوانەی بە دانایی و ژیریەوە بانگدەکرێن بۆلای خودا کۆمەڵێکن، وە ئەوانەشی کە بە موجادەلە و دیالیکتیك و لێکۆڵینەوە بانگدەکرێن بۆلای خودا کۆمەڵێکی ترن، ( قسطاس المستقیم ل ٤٠ طبع دارالمشرف — بیروت).

کە منداڵی بچووك لەمەمکی دایکی دەیخوات، هەرکەسێك موجادەلەی بەشێوەیەکی ناباش لەگەڵ ئەهلی موجادەلەدا بەکار هێنا هەروەك لەقورئاندا زانیمان، ئەوە وەك خۆراکپێدانی کەسێکی دەشتەکی وایە بە نانی گەنم لەکاتێکدا ئەو تەنها خووی بەخواردنی خورماوە گرتووە [٤٩].

بەمشێوەیە قسەکەی ئێمە ڕاستتر دەردەچێت بەوەی کە پرۆژە فەلسەفیەکەی غەزالی کارێکی تەواوو جۆراوجۆرە کە بەکتێبی مەقاصید دەستیپێکرد و بە کتێبی تەهافوت زیاتری کرد و گەیاندیە کۆتایی و کاملیکرد، کە بریتی بوو لەڕەتدانەوەیەك لەبەرامبەر ئەوەی کە لەمەقاصیدا هاتبوو، بەڵام لەبارەی کتێبی تهافت الفلاسفەوە لەوانەیە خراپ تێگەشتن ڕوویدات، هەربۆیە غەزالی بەپێویستی زانیوە کتێبی(معیار العلم) بنوسێت کە دوو هۆکاری دیاریکردووە، یەکەمیان: تایبەتە بە سروشتی زانستەوە کە پێویستە لەڕێگەی بیرکردنەوە و تێڕوانین و ڕووناککردنەوەی ڕێگەکانی پێوانەکردن و پەند وەرگرتنەوە فێری ببین و بیزانین، بۆ ئەوەی پێوەرەکە بۆ زانست وەك زانستی عەروزی لێبێت بۆ شیعر. دووەمیشیان: بریتیە لەئاگاداری و شارەزا بوون لەبارەی ئەوەی کە لەکتێبی(تهافت الفلاسفە) دا هاتووە، ئێمەش بەزمانی خۆیان گفتوگۆمان لەگەڵدا کردن و بەپێی حوکمی زاراوەکانیان قسەمان لەگەڵدا کردن، ئەمەش تایبەتترینی هۆکاری گشتگیرو گرنگترینیانە [٥٠].(پێوەری زانست(معیار العلم) بەم مانایە هەرچەندە هۆکارو ئامێرێکی بنەڕەتیە بۆ تێگەشتن لە تهافت الفلاسفە، لەهەمان کاتیشدا پیوانەو تەرازوویەکە بۆ لێکۆلینەوە و بیرکردنەوە و بەرگێکی پارێزەری زەینە و هۆیەکیشە بۆ بەهێزبوونی

---

[٤٩] القسطاس المستقيم – لا ٤٢ طبع دار المشرف – بيروت. لێرەدا ئاگاداری مانای ووشەی( الرأی) بە چوونکە بەمانای عەقڵ نەهاتووە.

[٥٠] معيار العلم لا ٦، تحقيق د سليمان دنيا.

فیکرو عەقڵ، ئەم ئامانجەیە کە غەزالی بە گرنگترین ناوزەدیکردووە چوونکە لەداهاتوودا هاوڕێیەتی بینا فەلسەفیەکەی دەکات، کە جیهانی دیار و نادیاری میتافیزیکی و فیزیکی جیهانەکانی تریش لەیەکەیەکی نێشتەجێبوونی جۆراوجۆر و کێشانەکراو بەتەرازوویەك کە غەزالی پێی وایە ئەو تەرازوەیە کە خوا دایناوە کێشانە و پێوانەدەکات، بەبەڵگەی ئەم ئایەتی پیرۆزە کە دەفەرمێت: (الرحمن خلق الإنسان علمه البيان... والسماء رفعها ووضع الميزان الا تطغوا فى الميزان واقيموا الوزن بالقسط ولا تخسروا الميزان) [٥١] واتە: خودای ڕەحمان ئەو خودایە کە مرۆڤی دروستکردوە، قسەکردنی فێرکردووە. ئاسمانی لەبەرزیدا ڕاگرتووە، تەرازوویداناوە، داوایکردووە کە لەکێشانەو پێوانەکاندا سەرکەشی نەکەن، کێشانە و پێوانەکان بەدادگەریەوە بەرپا بکەن و کەموکورتیان تێدا دەکەن.

غەزالی لەمبارەیەوە دەڵێت: : دڵنیابە و بزانە کە ئەو تەرازووە بریتیە لەتەرازوی ناسینی خودا و فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەرەکان و موڵکو مەلەکوتەکانی خودای گەورە [٥٢]. هەربۆیە زانستی ڕاستەقینە لەلای غەزالی بریتیە لە زانست سەبارەت بەخودا و سیفەتەکانی و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی خوداوو زانست لەبارەی نەفس و سیفەتەکانی و زانیاری لەبارەی مەلەکوتی ئاسمانەکان و زەوی و شتەکانی تر، واتە هەموو ئەو زانستە تیۆریانەی کە بەپێی گۆڕانی سەردەم و نەتەوەکان ناگۆڕێن. غەزالی حەقیقەتی ئەم زانستە لەکتێبەکەیدا(میزان العمل) بەمشێوەیە باسدەکات و دەڵێت: (ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زانیاری لەبارەی خودا و سیفەتەکان و فریشتەکان و کتێب و پێغەمبەران مەلەکوتەکانی ئاسمان و زەوی و

---

[٥١] س الرحمن ئا ١ بۆ ٤ – ٧ بۆ ٩.

[٥٢] القسطاس المستقيم – لا ٤٣ دار بيروت ١٩٨٣.

شتە سەرسوڕهێنەرەکانی دەروونە مرۆییی و حەیوانیەکان لەو ڕوانگەیەوە کە پەیوەستە بەهێزی خودای گەورە و بالأدەستەوە، نەك لەڕووی ڕێزو ئەوپەڕی بەرزیانەوە [٥٣].

ئەو زانستە وەسفدارکراوەی بە جێگیری و نەگۆڕی کەملکەچ نیە بۆ گۆڕانکاری بەهۆی سەردەم و کاتەکانەوە، بریتیە لە زانستی ئیلاهی یان میتافیزیکی کە غەزالی ملکەچیدەکات بۆ کرداری عەقڵ و عەقلگری و پێوەرەکانی لۆژیك و تەرازووەکانی، کە گونجاوە لەگەڵ ئەوەی کە لەکتێبی(تهافت الفلاسفه) دا هێناویەتی، چوونکە گەڕەلاوژێ و دژبەیەکبوونی فەیلەسوفەکانی لەمەسەلە ئیلاهیەکاندا ئاشکراکردووە، لەبەرئەوەی کە ئەوپەڕی ئاسانکاری و شلگیریانکردووە و بەپێی ئەو مەرجانەی کە لە لۆژیك و مەنتیقەکەیاندا دایانناوە نەجولأونەتەوە، هێندەش دژ نیە لەگەڵ زۆرێك بۆچوونەکانی غەزالیدا ئەگەر بێت و باس و لێکۆڵینەوە بکرێت. چوونکە ڕەخنەگرتن لەفەیلەسوفەکان ئاراستەی بابەتە ئیلاهیەکان و دژبەیەکیەکانی فەیلەسوفەکان لەبەکارهێنانیان بۆ مەنتیق دەکرێت، واتە غەزالی ڕەتی بەکارهێنانی عەقلی نەکردووەتەوە لەزانستە ئیلاهیەکاندا، بەڵکو ڕەتی بێسەرو بەری و شپرزەیی و دژبەیەکی و ئەو بیروباوەڕو عەقیدانەی کردوەتەوە کە فەیلەسوفەکان دایانمەزراندوون و لەنێو خەڵکیدا بلاویانکردوونەتەوە، هەروەك خودی غەزالی خۆی لەالمنقذ من الضلال دا باسیکردووە و دەڵێت: :

(زۆربەی هەڵەی فەیلەسوفەکان لە مەسەلەی ئیلاهیاتەکاندایە، چوونکە نەیانتوانیوە مەرجەکانیان کە لەمەنتیقدا دایانناون بیانهێننەدی، هەربۆیە جیاوازی

---

[٥٣] میزان العمل لا ٣٧ دار الکتاب العربي — بیروت ١٩٨٣.

زۆربووە لەنێوانیاندا)[٥٤] سروشتی پەیڕەوکردنی فەلسەفی گەشتووەتە لوتکە بەنوسینی کتێبی(معیار العلم)، هەرچەندە ئامانجی ئەو پەیڕەوکردنە لەدواییدا وەدی نەهات، چوونکە پێویستی بەڕووی دووەمی زانست هەبوو، ئەویش بریتی بوو لەزانستی کرداری، ئەم زانستەش دابەشدەبێت بۆ زانستی تیۆری و زانستی کرداری، هەروەك چۆن غەزالی پێوەرو یاساو ڕێسا و قیستاس و مەحەکی بۆ زانستی تیۆری دانا، لەولاشەوە زانستی کرداری پێویستی بە تەرازوو کێشانەیەك هەیە کە گونجاو بێت لەگەڵیدا، غەزالی بەزیرەکی خۆی پەی بەم پێویستیە بردوو کتێبێکی تایبەتی بۆ تەرخانکرد، کە زنجیرەی قەڵاکەی پێ تەواوکرد و بەشێوەیەکی بەهێزو ڕوون و ئاشکرا بناغەی بیناکەی لەسەر دانا کە ئامانجی بەدیهێنانی ئەو بەختەوەریە بوو کە بەزانست و کردار نەبێت مرۆڤ ناتوانێت پێی بگات، هەربۆیە غەزالی لەسەرەتای کتێبەکەیەوە(میزان العمل) لەپاش ئەوەی لەنوسینی کتێبی(معیار العلم) بووەتەوە، باسی پێویستی و گرنگی ئەم کتێبە دەکات[٥٥].

ئەوەی کە پێشتر باسکرا لەبارەی حەقیقەت و ڕاستی بینای فەلسەفی ئیمامی غەزالیدا، دەتوانین بەمشێوەیەی لای خوارەوە دیاریبکەین:

(بنیاتنانی ئامێرو هۆکار کە دەکاتە عەقڵ، وە بەدیهێنانی ئامانجی عەقڵگری کە دەکاتە حەق و ڕاستی، ئامانجی عەقڵگریش بریتیە لە کردار، وە ئامانجی کرداریش گەشتنە بەبەختەوەری). ئەم بازنەیەش تەواو نابێت مەگەر پاش ڕەخنە گرتنێکی بەهێزو ڕەوان لەو فیکرەی کە هەیە لەپاش ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردنی، بەمشێوەیە بینای فەلسەفی ئیمامی غەزالی دوو ڕووی بەرابەر هەڵدەگرێت، ڕوویەکی

---

[٥٤] المنقذ من الضلال لا ١٠٦ تحقيق د جميل صليبا ود كامل عياد – دار الأندلس ١٩٨١.

[٥٥] ميزان العمل لا ٥ دار الكتاب العربي – ١٩٨٣.

ڕەخنەیی، ڕوویەکی بنیاتنانی، ڕووە ڕەخنەییەکەشی دووقۆناغ هەڵدەگرێت: قۆناغی ڕوونکردنەوە و پێشکەشکردن(کتێبی مقاصد الفلاسفه) قۆناغی ڕەتدانەوە و تێکشکاندن(کتێبی تهافت الفلاسفه). ڕووە بنیاتنانیەکەشی(التأسیسی) دوو بنەما لەخۆ دەگرێت: یەکەمیان تیۆری کە بریتیە لەکتێبی(معیار العلم) دووەمیشیان کرداری کە بریتیە لەکتێبی(میزان العمل). کەواتە فەلسەفەی غەزالی ئاراستەی ناوەڕۆك و پرۆگرام کراوە لە ئاستی ڕەخنەدا، بەڵام لەئاستی بنیاتناندا جەخت لەسەر ئاستی پرۆگرامی دەکاتەوە لەبەر مەترسی و گرنگیەکەی.

وەهەروەها دەتوانین بەپشت بەستن بەم دیاریکردن و سنوردار کردنە هەڵوێستەکانی غەزالی لەکتێبەکانی تریشیدا بەباشی بزانین. لەلایەکی تریشەوە پێویستە ئاگاداری سروشتی بیرکردنەوەی غەزالی و پەیڕەو کردنی فەلسەفەکەی بین، لەهەردوو ڕووی ڕەخنەیی و بنیاتنانیەکەیەوە. ئەو سروشتەش کەبەچاوی ئیعتیبارەوە سەیردەکرێت و وەردەگیرێت، بریتیە لەو سروشتەی مرۆڤ کە تێیدا خەیاڵ و وەهم و فیکرەکان کارلێك دەکەن و پەروەردە و خوو خدەش کاریگەرە لەسەری، وە هەروەها سروشتی کۆمەڵگەش بەگشتی بەچاوی ئیعتیبارەوە سەیر دەکرێت چوونکە ئاقڵی دانا و خەڵکی سادە و ئاسایشی تێدایە، لەنێو ئەمانەدا کەسانێك هەن کە دەستیانداوەتە موجادەلەو مونازەرە بەبێ دڵنیابوون لەعەقڵی خەڵکی بەگشتی، نەگەشتوونەتە پلەی ژیری و دانایی، لەهەڵوێستێکی بەین بەیندایە، واتە نە لەمانە و نە لەوانیشە، کورتە و بەرهەمی ئەم قسەیە ئەوەیە کە غەزالی لەنوسینە فەلسەفیەکانیدا ئیتر ڕەخنەگری کردبێت یان باسی کردبێت وەیان دامەزرێنەر بووبێت لەزەین و بیریدا سێ مەرجی بنەڕەتی ئامادەباشیان هەبووە، ئەوانیش سروشتی کەسی وەرگرەکە بووە، لەگەڵ سروشتی پرۆگرامەکە، کە

ئامانجی ئەم ئاگادار بوونە دیاریکردنی ڕووی حەقیقەت و ڕاستیە لەگەڵ حەقیقەتی یەقین و دڵنیاییدا.

بیرکردنەوە و تێفکرانمان لەکتێبی(میزان العمل) دەچێتە ناو ئەم چوارچێوە مەعریفیە پرۆگرامیەوە کە غەزالی دایمەزراندووە، هەر دەڵێی ئێمە لەنێو ئەم کتێبەدا لەبەردەم کۆتا خشتی پرۆژەکەیدایین، کە ناکرێت شوێن و پلەکەی دیاری بکەین مەگەر بەسەیرکردن و تێفکرانێکی وورد نەبێت لەسروشتی ئەوبینایە و سروشتی ئەو ڕۆڵەی کە غەزالی داویەتی بەم کتێبە، ئایا کتێبێکە لەبارەی ئەخلاقەوە وەك کتێبەکەی ئەرستۆ؟ یان کتێبەکەی مسکویە؟ ، یان کتێبێکە لەبارەی زانستە دەروونی و سیاسیەکانەوەیە؟ لەم ئاستەدا ناتوانین سروشتی ئەم کتێبە دیاریبکەین، بەڵام ئەوەی کە سەلمێنراوە ئەوەیە کە(میزان العمل) کتێبێکە باس لەفەلسەفەی کرداری دەکات، کە لەڕێگەی فەلسەفەی تیۆریەوە مرۆڤ دەتوانێت لێی تێبگات.

با ئێستە بزانین ڕووی پەیوەندی نێوان عەقڵی و کرداری لەفەلسەفەی غەزالیدا لەڕێگەی کتێبی میزان العمل وە چیە؟ وە ئایا دید و بۆچوونی خۆی سەبارەت بەمرۆڤ و جیهان چیە؟ بۆ ڕونکردنەوەی ئەم ئیشکالیەتە پێویستە شارەزای سروشتی نەفس و عەقڵ ببین و تێیدا دەرك بە لەدایکبوونی خود(الذات) و دامەزراندنی زانست(تأسیس العلم) و دامەزراندنی کردار(تأسیس العمل) بکەین، وە هەروەها لەنێو عەقڵی کرداریشدا دەبێت سروشتی زانستی کرداریش بزانین، کە لەڕێگەیەوە نیشانەکانی فەلسەفەی ئەخلاقی و نەفسی دەردەکەون، لەکۆتاییشدا دەستدەکرێت بە موناقەشە کردنی بنەمای ئەخلاق و ڕۆڵی پەروەردە و فێرکردن،

بۆ ئەوەی لەم کتێبەدا بگەینە ئامانجی کۆتایی فەلسەفەی غەزالی، کە قسەکردنیەتی لەبارەی بەختەوەریەوە.

لەڕێگەی لێکۆڵینەوەی مانای بەختەوەریەوە، هەڵوێستی غەزالی لەبارەی شارستانیەت و مرۆڤ و جیهانەوە ئاشکرا دەبێت، لەگەڵ هەڵسەنگاندنی ئەم تێڕوانینەدا بەپشت بەستن بەهەندێك دیدو بۆچوونی هاوچەرخ، بۆ ئەوەی لەکۆتاییدا ئاستی ئامادەباشی غەزالی لەبارەی زانست و کردارەوە لەدوونیای ئەمڕۆدا بزانین.

# بەشی یەکەم

## لەدایکبوونی خود( الذات )

چۆن ئاین دەبێتە پرۆژەی پرسیار کردن؟ وە چۆن ئاینپەروەر حەز لەپرسیار کردن دەکات و سورە لەسەری؟ ئەگەر پرسیارەکە بنەڕەتی حیکمەت و دانایی بێت ئەوکات پرسیارکردن لەبارەی بنەما یان یەکەمین و بالآترین هۆکارەوە ئەوە دەبێتە یەکەمین حیکمەت ودانایی و ڕێگەیەکیشە بەرەو خێری بالآ [٥٦]. ئەگەر سەر سوڕمان هۆکاری یەکەمین بێت لەلای یۆنانیەکان بۆ فەلسەفەفاندن و داواکردنی حیکمەت و دانایی [٥٧]، ئەوا ئاین لەلای غەزالی هۆکاری یەکەمە بۆ بیرکردنەوە، لێرەدا

---

[٥٦] ئەرستۆ دەڵێت: ئەو کەسەی کە مەعریفەی تەنا لەبەر خودی مەعریفە دەوێت باشتر وایە کە زانستی تەواوکار هەڵبژێرێت واتە ئەو زانستە کە بەباشترین شێوە دەکرێت بناسرێت، کە بریتیە لەو بنەماو هۆکارانەی کە لەڕێگەیانەوە دەتوانین شتەکانی تر بناسین کە ناسینی بنەماو هۆکارەکان لەڕێگەی ئەمانەوە دەبێت، زانستی بالآش ئەو زانستەیە کە ئامانج لێی بزانرێت و لەپێناویشیدا هەموو شتێك بکرێت، ئەم ئامانجەش بریتیە لەخێر بۆ هەموو بوونەوەرێك، بەشێوەیەکی گشتیش خێری بالآ لەکۆی سروشتدایە.( میتافیزیقا – ارستو – الکتاب الاول الجزء الاول).

[٥٧] ئەرستۆ دەڵێت: سەر سوڕمان بوە تە پاڵنەری بیرمەندە پێشینەکان هەروەك چۆن ئێستە لەتێڕوانینی فەلسەفیشدا هەر وایە). ارسطو مابعد الطبیعة لا ٩٨٢ ب ١٠.

بیرکردنەوە بریتی نیە لە ڕیازەت و خۆڕاهێنانێکی زەینی کە نە ئامانجێکی هەیە و نە مەبەستێك، بەڵکو مەبەستی غەزالی لەبیرکردنەوە گەڕانە بەشوێن حەق و جیاکردنەوەیەتی لە لێکچووەکانی و حوکمدانە بەسەر مەزهەب و گروپەکاندا لەپاش دەرککردن و تێگەشتن لەجەوهەر و ناوەڕۆکیان و شیکاری و لێکۆڵینەوەی ڕاستیەتی و حەقیقەتی زانستەکەیان، چوونکە حەق لەنێو هەموو ئایندا بڵاو نەبووەتەوە بەڵکو لەنێو جیاوازی و لق و پۆپەکانی ئەو گروپانەدا شاراوەتەوە، هەرکەسێك داوای بیرکردنەوە بکات بیرکردنەوەی بوێت و بەچەشتنی ناڕەحەتیەکانی ژیان ڕازیبێت، ئەوا هەردوو قاچی خستووەتە سەر یەکەمین ڕێگەی زانست.

ئامانجی غەزالی بریتی نیە لەناسینی زانست بەڵکو ئامانجی ناسینی(نهێنی و ئامانجەکانی و ڕۆچوون بووە بەکونج و کەلەبەر و قوڵایی مەزهەبەکاندا)[٥٨] زانست بەشێوەیەکی ڕاستەقینە لەنێوان قوتابخانەکاندایە، مەبەستیش ناسین و دەرککردنی ئامانج و زانینی نهێنیەکانیەتی، واتە یەکەمین مەبەستێك کە غەزالی لەزانست هەیبووە بریتی بووە لە مەبەستێکی ڕەخنەیی کە ڕەنگێکی بابەتی دەدات بەزانستەکان.

ڕەخنە گرتنی غەزالی لەزانست بەبیرکردنەوە و لێکۆڵینەوە بووە لەنزیکەوە، ئامانجیش لە ڕەخنەکە پاککردنەوەی حەق و دەرهێنانی بووە لە و بێسەرو بەریەی کە لەنێوان ئەو گروپانەدا هەبووە کە جڵەوی مەعریفەیان لەدەستدا بووە و هەڵگری ئاڵای حەقیقەت و ڕاستی بوون، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ڕاستی و حەقیقەت لەنێو ئەو زانستانە دەرناچێت کە هەن، وە پاڵفتە کردنیشیان شتێکی گونجاو نیە مەگەر

---

[٥٨] المنقذ من الضلال – الغزالي لا ٧٧.

لەپاش بیرکردنەوە لەبەرهەمی زانستی کە بیرکردنەوەیەکی تێرو تەواوو وەستاوبێت لەسەر پشکنین و بەراووردکاری پشت بەستوو بە شێوازی بەدوادا چوونی لەبارەی ڕاستیەتی پرۆگرام و ڕێبازەکانیانەوە.

پرۆژەکەی غەزالی هەروەك ئەوەی کە ئەزموونی خۆی لە(المنقذ) دا کورت دەکاتەوە بریتیە لە: بیرکردنەوە لەو بەرهەمە زانستیە کەلەسەردەمەکەیدا هەبووە، هەروەك بڵێی وویستویەتی قسەیەکی چەمکی دابمەزرێنێت کە لەو زانستەی کە هەیە بابەتێك هەڵبژێرێت و لەبەراورد کاریەکەش شێواز و پرۆگرامێك هەڵبژێرێت، واتە لێکۆڵینەوەی مەرجەکانی مەعریفە بکات لەڕێگەی لێکۆڵینەوەی بنەماو پایەکانی هەڵسەنگاندنیەوە. ئەم کارە ئیبستمولوجیە بەمانا زاراوەییەکەی وەك خاڵێکی دەستپێك وایە لەفەلسەفەی غەزالیدا، هەروەك چۆن لە مونقیزدا کورتەکەی خستووەتە ڕوو، چوونکە ئەم کتێبە وەك وەرگێڕان و تەرجەمەیەکی ڕاستەقینە وایە بۆ ڕێڕەوە فەلسەفیەکەی هەر لە سەرەتای هەڕەتی لاویەتیەوە تاوەکو پیربوونی و کۆتایی ژیانی، کە تەمەنی نزیکی پەنجا ساڵ بوبویەوە [٥٩]. بڵاوبوونەوەی فیکری دۆگمایی و باوەڕی ساویلکانە، لەسەردەمەکەیدا، وایلەغەزالی [٦٠] کرد کە تێڕوانین لەحەقیقەتی زانستدا بکات، کە خەمێکی ئیبستمولوجی بوو، هەروەك چۆن وایلێکرد بچێتە ناو سەرکەشیەکانی بنیاتنانەوە(التأسیس) [٦١] ئەوکات برۆژە فەلسەفیەکەی

---

[٥٩] المنقذ من الضلال — الغزالي لا ٧٩.

[٦٠] هەروەك خۆی دەڵێت( هەموو گروپێك وادەزانێت خۆی ڕزگار بووە و دڵیان خۆشە بەوەی کە لەلایان هەیە) مونقیز لا ٧٨.

[٦١] معیار العلم لا ٢٥٨.( تینویەتیم بۆ تێگەشتن لەحەقیقەتی شتەکان ڕێگە و خولیام بووە هەرلەسەرەتای لاویەتیمەوە، لەناخی خۆمدا گوتم: یەکەم خواستی من زانستە لەبارەی حەقیقەتی شتەکانەوە کەواتە دەبێت بەشوێن ڕاستیەتی و حەقیقەتی زانستدا بگەڕێم وەگەرنا ئەگەر وانەکەم ئیتر غەزالی چیە ؟

غەزالی لەلایەك دەبێتە ئیبستمولوجی و لەلایەکیش دەبێتە دووبارە کردنەوە و خووگرتن بەقسەوە کە غەزالی لەقسەکانیدا بۆی گەڕاوەتەوە، واتە گەڕاوەتەوە بۆ ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە کە دەفەرمێت(خودا هەموو سەد ساڵ جارێك کە سێك دەنێرێت کە نوێگەری لەئاینی ئوممەتەکەیدا بکات و بۆیان تازە بکاتە).

حەدیسەکە لەم دوو ڕووەوە و بەشیوەیەکی جیاواز بێجگە لەهۆکارێکی مەنهەجی و پرۆگرامی هیچ هۆکارێکی تری نیە، چوونکە لەزۆربەی کاتەکاندا نوسینەکانی غەزالی پەیوەستن بەهەردووکیانەوە(ئیبستمولوجی و زانستی) چوونکە هەردوولای ڕەخنەیی و دامەزراندنی دەبینین لەتەنیشت یەکەوەن و هاوشانن.

غەزالی لەفەلسەفەکەیدا تێڕوانینێکی واقیعی دەکات لە حەقیقەتی زانستی سەردەمەکەی خۆی، تێڕوانینی وەك تێڕوانینی مێژوو نوس یان خاوەن مەزهەبێکی چاولێکەر نەبووە، بەڵکو تێڕوانینی ڕەخنەگرێکی بیر قوڵبووە کە لەزانستەکانی سەردەمەکەی شوێنکاری باس و لێکۆڵینەوە و دۆزینەوە و ئاشکراکردنی بێلایەنانەی هەڵبژاردووە(هەموو گروپێك وادەزانێت هەر خۆی ڕزگار بووە، دڵیشی خۆشە بەوەی کە لەلایەتی) [٦٢].

ئەگەر ئەم گومانە خاڵی دەستپێك بێت، ئەوکات ناکرێت کە لەبارەی غەزالیەوە بڵێین بەشوێن ئەوەدا گەڕاوە کە جەخت لەڕاستیەتی بۆچوونەکانی بکاتەوە و گەڕەلاوژێی بەرامبەرەکانی ئاشکرا بکات، بەڵکو ئەمە بەڕاشکاوانە دەڵێت: (شیکاری لەبارەی عەقیدە و بیروباوەڕی هەموو گروپێکەوە دەکەم، نهێنیەکانی

---

[٦٢] معيار العلم لا ١٨٥.

مەزهەبی هەموو گروپێکیش ئاشکرا دەکەم، بۆ ئەوەی ڕاستو ناڕاست و شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی سوننەت لەبیدعەچیەکان جیابکەمەوە)[٦٣].

حەقیقەت و ڕاستی باسی ئیستمولوجی لەسنوری پانتایی زانستی تیپەڕ دەکات بۆ گرتنەبەری چەمکێکی ڕەخنەیی کە لەوانەیە بگاتە ئاستی ناوزڕاندن(التشهير) و بەکارهێنانی فەزیحەت هەروەك نیچە دەڵێت:.

**ئاستەکانی بەکارهێنان و پەیڕەوکردنی ئیستمولوجی:**

یەکەم: خستنە ڕووی زانست بەشێوەیەکی بابەتیانە.

دووەم: پێشخستنی حوکم یان چەمکی ڕەخنەیی.

سێیەم: تێپەڕینی و دامەزراندن(التجاوز والتأسيس).

غەزالی ئەم هەنگاوانەی بەووردی بەکار هێناوە و باسی ئەم مانایەی کردووە و دەڵێت: (ئەوەی کەمن پێوانەم کردووە لە پاڵفتە کردنی حەق لەنێو کێشمەکێشی گروپەکاندا لەگەڵ جیاوازی ڕێگە و ڕێڕەوەکانیان، ئەوەی کە بوێریم بەخۆم داوە لەپلەی چاولێکەری بەرز ببمەوە بۆ ئاستی بەصیرەت و بینایی، ئەوەی کە یەکەم سودم لێبینیوە لەزانستی کەلام و دووەم سودم لەڕێگەکانی ئەو کەسانە وەرگرتووە کە بەچاولێکەری ئیمام نەبێت لەحەق تێناگەن، سێیەمیش سودم لەڕێگەکانی فەلسەفاندن و لەمەشدا سودم لە شێوازو تەریقەتی صۆفیگەری وەرگرتووە، سودیشم لەپشکنینە زۆرەکانم لەقسەکانی خەڵکی بۆ ناوەڕۆکی حەق وەرگرتووە کە بۆم دەرکەوتووە)[٦٤].

---

[٦٣] المنقذ لا ٨٠.

[٦٤] المنقذ لا ٧٧– ٧٨.

ئەگەر لەم پلانەی غەزالی وورد ببینەوە دەتوانین حەقیقەتی ئەو پرۆژەیەی کە ئەیەوێت ئەنجامیبدات یان ئەوەی کە ئەنجامیداوە بزانین، چوونکە باسی کارێکی رابوردوو دەکات، لەبەرئەوەی مونقیز باسی شتێك دەکات کە روویداوە و وەسفدانی رووداوانێکە کە روویانداوە و هەڵوێستگەلێکە کە گیراونەتە بەر.

لەگرنگترین ئەو دەر ئەنجامانەش کە دەتوانین باسیانبکەین بریتین لەوەی کە:

– حەق لەنێو گروپەکاندا هەیە بەڵام ئامانج دەرهێنان و رزگار کردن و پاڵفتەکردنیەتی لەنێویاندا.

– هەڵوێستی غەزالی لەبارەی زانستی کەلامەوە لەئاستی سود وەرگرتن تێپەڕ ناکات.

– هەڵوێستی لەبارەی ئەهلی فێرکردن و فەلسەفەو تەسەووفەوە یەك هەڵوێستە و ئاراستەی رەخنەگرتنە لەتەریقەت و شێوازەکە.

– هاوڕابوونی لەگەڵ ئەو حەقەدا کە هەیە لەهەموو قسە جیاوازەکانی خەڵکیدا.

هەموو ئەمانە مانایان ئەوەیە کە غەزالی هەرچەندە رەخنەی لەمەزهەب و گروپ و فەیلەسوفەکان و صۆفیەکان گرتووە، ئەمە مانای ئەوەنیە کە هیچ قسەیەکیان وەرناگرێت، بەڵکو کتێبەکانی غەزالی بەروونی ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکەن کە غەزالی خاوەنی(تهافت الفلاسفە) لەم کتێبەیدا گەڕاوەتەوە بۆ زۆرێك لەقسەو بەڵگەی فەیلەسوفەکان و ئاساییش بووە بەلایەوە، چوونکە رەخنەگرتنی لێیان لەئاستی حەقیقەتەکاندا نەبووە، بەڵکو لەئاستی رێڕەوو پرۆگرامدا بووە، گومانیشی تێدا نیە کە رەخنەگرتن لەتەریقەت و رێڕەو بەدوای خۆیدا رەخنەگرتنیش لەهەندێك فیکرو دەرئەنجام دەهێنێت، بەڵام دەرئەنجامگەلێکی تەسك و سنوردارن کە تێیاندا غەزالی فەیلەسوفەکانی کافر کردووە، هەروەك چۆن کاتێك غەزالی مەسەلەی باتینیەکانی

ئاشکرا کردوو ئابڕوی بردن، لەکارەکەیدا لەم ڕەخنە مەنهەجی و پرۆگرامیە دەرنەچوو، واتە مەنهەجی بیرکردنەوە لەلای باتینیەکان، ئەمەش بەبێ ئەوەی مانای ئەوە بگەیەنێت کە لەهەموو حەقیقەتەکانیاندا جیاوازە لەگەڵیان، بەڵکو ئەوەی سەلماندووە کە جیاوازیەکەی لەگەڵ باتینیەکاندا لەهەندێك حەقیقەتدا بووە.

هەروەك چۆن غەزالی لەتەریقەت و ڕێڕەوی صۆفیەکان ڕازیبووە، بەڵام ڕەخنەی لەزۆرێك لەحەقیقەتەکانیان گرتووە وەك فەنابوون و یەکبوون و چەندین چەمکی تر، هەموو ئەمانە مانای ئەوە دەگەیەنن کە غەزالی لە پەیڕەوە فەلسەفیە ڕەخنەییەکەیدا ڕوویکردووەتە پەیڕەوو پرۆگرامەکان و ڕەخنەی لێگرتوون و تانەی لێداون، نەك ڕووی کردبێتە خودی فیکرەکان، چوونکە هەر پرۆگرامێك کە مرۆڤ دەگەیەنێتە حەق ئەوە مانای ئەوەنیە کە ئەو مەنهەجە سەرکەوتوو دەبێت لەگەشتن بەحەقێکی تر، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە لە کتێبی(تهافت الفلاسفه) و(المنقذ من الضلال) دا غەزالی هێمای بۆ دەکات و دەڵێت: کە بەڵگەی فەیلەسوفەکان لەئیلاهیاتدا ئەو هێزەیان نیە کە لەماتماتیك و مەنتیقدا هەیانە، ئەمەش هۆکارێکی گونجاوو بەسە بۆ ڕەخنەگرتن لە مەنهەجی بیرکردنەوەیان و شێوازی تێڕوانینیان، چوونکە غەزالی ئامانجی ئاشکراکردنی حەقیقەت و ڕاستی شتەکانە، ئەم ئاشکراکردنەش مەرجدارە بەوەی کە دەبێت حەقیقەتی زانست بزانرێت، کە غەزالی بەمشێوەیە پێناسەی دەکات(ئەوەم بۆ دەرکەوت کە زانستی دڵنیایی و یەقینیە کە شتە زانراوو دیارەکانی تێدا ئاشکرا دەکرێت کە هیچ شك و گومانێکیان تێدا نامێنێتەوە و گریمانی هەڵە و وەهمی تێدا ناکرێت) [٦٥].

---

[٦٥] المنقذ من الضلال لا ٨٢.

ئەگەر فەیلەسوفەکان لەماتماتیك و مەنتیق و لۆژیکدا هاوڕابوون و لە ئیلاهیاتدا جیاوازبوون، ئەمە مانای ئەوەیە کە زانستەکانیان خاڵیە لە هەموو جۆرە متمانەیەك و گریمانی ڕوودانی هەڵە و وەهمیان تێدایە. کەوابوو زانستەکەیان یەقینی نیە، ئەوەی کە پێویستە لەو زانستەشدا هەبێت بریتیە لە ئاشکراکردنی ئەو دڵنیایی و یەقینە، لەگەڵ ئەو زانستەی کە دەمانگەیەنێت پێی، کە دواتر غەزالی لەبەشی تایبەت بەبنیاتناندا(التأسیس) هەوڵدەدات بەدەستی بهێنێت و بیگەیەنێتە ئەنجام، چوونکە مەرجەکانی لەهەمان ئەو پلانەوە وەرگرتووە کە لەمونقیزدا خستبوویە ڕوو، ئەویش بریتی بوو لەوەی کە سەرەتا خۆی لە چاولێکەری ڕزگار بکات، ئەمەش بوێریەکی پێویستە ئەگەر بێتەدی و بەهێز ببێت و کامڵ ببێت، ئەوا یەکسەر و لەپاش ئەم بوێریەوە بنیاتنان دەستپێدەکات، نیشانەکەشی ئەوەیە سەرەتا دەروونی خۆت و هێزو تایبەتمەندیەکانی بناسیت [٦٦] چوونکە ناوەڕۆکی مەسەلەکە بەپێی بۆچوونی غەزالی لەناسینی دەروونیدا کورتدەبێتەوە، لەبەر ئەوەی ئەم ناسینە وەك مەرجی یەکەم وایە بۆ هەرناسینێکی تر، وەك ناسینی ڕبوبیەت(پەروەرشیاری خودا) و ناسینی سروشت و موڵك و مەلەکوتەکانی ئاسمان و زەوی.

–بەدڵنیاییەوە سەرکەوتنی مەسەلەی مرۆڤ لەڕووی مەعریفە و هەڵسوکەوتەوە و شکستهێنانی پەیوەستن بەناسینی دەروون و پاڵفتە کردنیەوە، نەزانین و شارەزا نەبوون و پیس و لێڵ کردن لەبارەی ئەم ناسینەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە پرسیارکردن لەبارەی حەقیقەتی دەروون لەناوەڕۆکی قسەکەدا لەلای غەزالی ببێتە پرسیارێکی شەرعی و ڕێگە پێدراو.

---

[٦٦] میزان العمل لا ١٧.

## ١ – حەقیقەت و ڕاستی دەروون(بوونی دەروون)

مەسەلەی نەفس و دەروون پێگەیەکی گرنگی لەلای فەیلەسوفەکان داگیر کردووە، هەرلە سەردەمی یۆنانیە پێشینەکانەوە، بەڵام کێشەیەکی دیاری لەگەڵ ئەفلاتون و ئەرستۆدا دروستکرد، چوونکە هەریەکەیان چەندین بابی سەربەخۆیان لەبارەیەوە باسکردووە، کە مانای قورسی و گرنگی و ووردی بابەتەکە دەگەیەنێت، ئەفلاتون ئیشکالیەت و دەروون و هەرەریەتەکەی(خلود) لەچەندین کتێبدا خستووەتە ڕوو، لەگرنگترین ئەو کتێبانەش کتێبی(فیدون) کە تێیدا موناقەشەی لەگەڵ(سیمیاس) و(قابس) دا کردووە لەسەر مەسەلەی هەرهەریەتی دەروون، بەچاوپۆشی لە هەڵوێستە باسکراوەکان، بەڵام هەستێکی گشتی زاڵبووە بەسەر فیکرەکانیاندا کە بریتی بووە لە قورسی کێشەکە و ئاڵۆزبوونی تا ئەو ئاستەی کە سیمیاس باسیکردووە و دەڵێت: زانیاری لەبارەی حەقیقەت و ڕاستی ئەم شتانەوە نەگونجاوو زۆر قورسە لەم ژیانەدا، بەڵام ترسنۆکیە کە لەباسەکە بێ هیوا ببین، پێش ئەوەی بگەینە کۆتا ئاستی عەقڵ، ئەوکات دەبێت متمانە لەحەق وەربگرینەوە، ئەگەر ئەمەش نەگونجاو بوو، ئەوا دەبێت بەڵگەی بەهێزتر ئاشکرا بکەین و ملی بۆ کەچ بکەین بۆ تێپەڕاندنی ژیان، هەروەك چۆن مرۆڤ لەترسی نغرۆبوون سواری پارچە تەختەیەکیش دەبێت مادەم شتێکی لەنێو دەریادا دەستنەکەوێت بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات، ئێمەش بەو جۆرەین بۆ گەشتن بە وەحی خودایی، بەڵام سیمیاس سور بوو لەسەر ئەم هەڵوێستەی، سەرەڕای باوەڕبوونی بەوەی کە لە گفتوگۆکاندا هاتبوو کە نەفس نامرێت چوونکە هەستێکی دووجەمسەری هەیە بەپێی گەورەیی مەسەلەکە، مرۆڤیش لەبەر لاوازی ناچار

دەبێت هەندێك خۆ پارێزی بكات، هەربۆیە دەڵێت: : بەڵكو خودی پێشەكیەكان پێویستیان بەباسێكی دڵنیاتر و جەخت لەسەر كراوەتر هەیە [٦٧].

هەرچەندە ئەرستۆ لە ناوەڕۆكی فەلسەفەكەیدا جیاوازی هەبوو لەگەڵ ئەفلاتونی مامۆستایدا، بەڵام هەستی بەگرنگی ئەم بابەتە كردبوو، هەوڵی ڕوونكردنەوەی دابوو بەشێوەیەكی وورد كە لەئەفلاتونیش تێپەڕی كردبوو، ئەمەش بەپشت بەستن بەقسەكەی بە هەیولی و شێواز، نەفس دەكاتە هەمان شێواز یان هەمان ئەو(كامڵبوونی یەكەمی تەنێكی سروشتی ئامێری گیاندارە بەشێوەیەكی ناكرداری) [٦٨] لەگەڵ ئەوەی كە نەفس شێوازێكە بۆ تەنێكی سروشتی، بەڵام بەهیچ شێوەیەك نەفس لە تەن و جیسم جیا نابێتەوە، بەڵكو لەگەڵ تەن و جەستەدا یەك گەوهەرو ناوەڕۆك پێكدەهێنن، كە بریتیە لەو بوونەوەرە زیندووەی كە مرۆڤی لێوە دروستدەبێت، واتە پەیوەندی نێوان جەستە و نەفس شتێكی خودیە و عەرەزی و ناخودی نیە، فەیلەسوفانی ئیسلام وەك فارابی و ئیبن سینا هەوڵیانداوە بەقوڵایی ئەم مەسەلەیەدا بچنە خوارەوە، بەڵام دیانبینین جارێك لەگەڵ ئەفلاتوندا بوون و جارێكیش لەگەڵ ئەرستۆدا، چوونكە باوەڕیان بە ڕێكخستن و لێكنزیككردنەوەی نێوان ئەم دوو فەیلەسوفە هەبووە، بۆ ئەوەی زیاتر لەچەمك و مانای نەفس تێبگەن، هەروەك چۆن دەتوانرێت لەڕێگەی ڕاسپاردەكانی ئیسلامیشەوە بەباشی لێی تێبگەین، بەڵام ئیبن سینا لەباسەكانیدا ووردترە كاتێك باسی منیەتی دەكات و خود و ناوەڕۆكەكەی دەسەلمێنێت لەبەرامبەر سەلماندنی جەستە و ناوەڕۆكیەوە.

---

[٦٧] محاورة الفيدون – افلاطون لا ١٦٠ ترجمة زكى نجيب محمود – تأريخ الفلسفة اليونانية – يوسف كرم، دار القلم بيروت لا ٩١.

[٦٨] ارسطو فى النفس – عبد الرحمن بدوى لا ٥٧.

بەپێی ئەم ئیعتیباراتانە غەزالی بەڕاشکاوانە دەڵێت: نەفس پەیوەستە بەخوداوەو بەم ئایەتە قورئانیەش قسەکەی ڕووندەکاتەوە و بەڵگەی بۆ دەهێنێتەوە(ویسألونك عن الروح قل الروح من امر ربی) [٦٩]واتە لەبارەی ڕۆحەوە پرسیارت لێدەکەن، تۆش بڵێ ڕۆح پەیوەند بەخوداوە هەیە.

خودای گەورە جەخت لەوە دەکاتەوە کە دروستبوونی نەفس و دەروون بەهۆی فوی ئیلاهیەوە بووە بەناو هەموو جەستەدا، هەروەك دەفەرمێت(ونفخت فیه من روحی) [٧٠] واتە: لەڕۆحی خۆم فوم بەجەستەی ئادەمیدا کرد، هەروەك بڵێی غەزالی لەچارەسەرەکەیدا لەم خاڵەوە دەستپێدەکات کە لەلای سوقرات و سیمیاس بوونی نەبووە، ئەمەش ئەو وەحی و سروشەیە کە غەزالی کردوویەتیە بەهێزترین بەڵگە کە دەتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت لەمجۆرە مەسەلانەدا، بەڵام ئەم بەڵگە بەهێزە نائامادە و نادیارەی لای یۆنانیەکان، لەلای موسوڵمانەکان دیارو ئامادەیە و ناکرێت غەزالی سودی لێ نەبینێت و پشتی پێ نەبەستێت، چوونکە بەهێزترین و پایەدارترینی بەڵگەکانە، بەڵام ئەم بەڵگە بەهێزە دەتوانرێت بە چەندین شێواز باسبکرێت، غەزالی هەوڵیداوە بە کورتی باسیبکات کە پێویستی بە باسکردنێکی دوورو درێژ هەیە، بۆ کەسانێك کە بیانەوێت زیاتر متمانەیان هەبێت، لەم باب و بەشەشدا غەزالی خۆی تەیار کردووە بە چەکێکی نەقلی و گواستنەوەیی کە بریتیە لەوەحی نادیار لەبەرامبەر یۆنانیەکانەوە، کە ئەگەر لەلای ئەوانیش هەبوایە زیاتر متمانەیان پێ دەکرد(واتە ئەگەر ئاینی ئیسلامیان لەنێواندا هەبووایە متمانەیان بە و ئایەتانە دەکرد کە لەبارەی دەروونەوە هاتوون)، وە هەروەها خۆیشی بەچەکێکی عەقلی تەیار کردبوو کە بریتی بوو لەبەڵگە و بورهانی فەلسەفی هاوبەش لەلای

---

[٦٩] س الأسراء ئا ٨٥.

[٧٠] س الحجر ئا ٢٩.

فەیلەسوفەکان، هەربۆیە غەزالی لەو باسانەی کە دواتر دەیانخاتە ڕوو نوێگەر نیە، هەرچەندە نوێگەرە لەچۆنیەتی نیشاندان و خستنە ڕوویان، چوونکە ووردەکاریەکانی ئیبن سینا و بەڵگەکانی لەلای غەزالیش بەچەندین ڕوو شێواز باسکراون، هەرچەندە غەزالی گەڕەلاوێژکانی ناوبراوی لەتهافتدا سەلماندووە، بەڵام ئاشکرا کردنی ئەم گەڕەلاوژێیانە ئامانج لێیان بەتاڵکردنەوەی قسەکانیان نەبووە، بەڵکو ئامانج لێیان بەتاڵکردنەوەی ڕێرەوەکانیان بووە، چوونکە پڕبووە لەدژیەکبوونەکان، ئەگەر ڕێڕەو قسەکانیان لەو گەڕەلاوژێیانە پاکبکەینەوە، ئەوکات دەبنە بەڵگەی متمانە پێکراو لەمبارەیەوە، کە غەزالیش هەمان ئەوکارەی کردووە، کاتێك کە دووبارە بەڵگەکانی ئیبن سینا دادەڕێژێتەوە یان دووبارە لەڕووی پیتیەوە داڕشتنەوەیان بۆدەکات، لەهەندێك کتێبی وەك(معارج القدس – قسطاس المستقیم – یان خودی احیاء علوم الدین) دا.

بەڵگە هێنانەوە لەسەر بوونی نەفس و دەروون لەڕێگەی میزان العمل وە شتێکی ئەستەمە، لەبەر ئەوەی ئەم کتێبە بەڵگەی لەسەر بوونی نەفس و دەروون پێشکەش نەکردووە، چوونکە ئامانجی کتێبەکە هێندە گرنگی بەم مەسەلەیە نادات، بەڵام غەزالی ئاماژە بەوە دەکات کە ناسین و درککردنی نەفس بەهەست نابێت، ئەمەش دیاریکردنێکە بە نەرێنی کە بەدوایدا دیاریکردنێکی ئەرێنی دێت کە دوو ڕێگەی جیاوازی بۆ ناسین و دەرککردنی نەفس تێدا دادەنێت: یەکەمیان ئەوەیە کە بەعەقڵ دەرك دەکرێت و دەناسرێت، دووەمیشیان ئەوەیە کە بەهۆی شوێنەوارو کارو کردارەکانی خودی نەفس و دەروونەوە دەناسرێتەوە [٧١].

---

[٧١] غەزالی لەکتێبی میزان العمل لا ٢٠ دا دەڵێت( بەگشتی نەفس بەرێتر و گەورەترە لەوەی کە بە پێنج هەستەکە دەرك و هەستی پێبکرێت، بەڵکو بەعەقڵ هەست و دەرکی پێدەکرێت یان لەڕێگەی شوێنەوارو کارو کردارەکانیەوە دەناسرێتەوە.

دواتر غەزالی گرنگی بەئاستی دووەم دەدات(کە نەفس و دەروون لەڕێگەی شوێنەوارو کارو کردارەکانیەوە دەناسرێتەوە و هەستی پێدەکرێت) چوونکە بریتیە لەناوەڕۆکی مەبەستی کتێبەکە، واتە باسکردن و زانینی شوێنەواری نەفس و کردارەکانی. ئەمەش باب و بەشێکی گەورە و بەپیتە کە تێیدا غەزالی بلیمەتیەکی بێ ووێنە نیشاندەدات، چوونکە وەك زانایەکی دەروونناسی شارەزا بەسروشتی دەروون و ئاگادار بەدەردو دەرمانەکانی و زاڵ بەسەر بارودۆخەکانیدا خۆی نیشاندەدات. ئەم کارەی کە دواتر غەزالی دەیکات، بەڕاستی دەیکاتە کەسێکی نوێگەری ڕاستەقینە، چوونکە بنەماکانی باسی دەروونی گشتی و باسی دەروونی خۆپارێزی(الوقائی) دەکات و چارەسەری(العلاجی) دوور لە چارەسەرە میتافیزیکیەکان دادەنێت. هەربۆیە لە هۆکاری دەست نەبردنی غەزالی بۆ ئەم لایەنە لەکتێبەکەیدا بەباشی تێدەگەین، چوونکە کتێبێکی زانستی تایبەتە بە چالاکیە دەروونیەکان کە تێیدا ڕووداوە نەفسیەکان لێکۆڵینەوە دەکات و سروشتی هەڵسووکەوتیش دیاریدەکات و حەقیقەتی پاڵنەرەکان و پەیوەندیان بە ئیرادە و کۆنترۆڵی مرۆڤەوە ڕووندەکاتەوە، لەگەڵ لێکۆڵینەوە و شیکاری ژیانی ویژدانی و کاردانەوە و سۆزو عاتیفەکان و پەیوەندی هەریەکە لەم هێزو دیاردانە بە ئیدراك و هەست و مەعریفە و داواکردنی دڵنیایی و ئاشکرا کردن و گومانبردن و عەقڵگریەوە دەکات.

بەڵام ئەم لێکۆڵینەوە دەروونیە بوێرانەیە باسێکی سەبارەت بەبەختەوەری و پەیوەندی بەڕۆژی دواییەوە تێدایە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە دیدی مرۆڤ بۆ جیهان یەکبوون و کامڵبوون حوکمی بەسەردا دەکەن. بەڵام ئەگەر دابەزینە ئاستی بیرکردنەوە لەبارەی حەقیقەتی دیدو بۆچوونەوە، ئەوکات بەهۆی پڕۆگرام و

مەنهەجەکەوە ناچارین کە سنورگەلێك دروستبکەین بۆ ئەوەی مەسەلەکان لەیەکتری جیابکەنەوە، ئەمەش مانای ئەوەنیە کە غەزالی تەنها باوەڕی بەبوونی نەفس هەبووە، بەڵکو کتێبەکانی تری پڕن لە بەڵگە عەقڵی و نەقڵیەکان لەوبارەیەوە، هەرچەندە لەم کتێبەدا ئاماژەی بەبەڵگەی عەقڵی کردووە کە بەڕوونی لە کتێبی معارج القدسدا دەیبینین، کە تێیدا غەزالی بوونی خود(الذات) ی سەلماندووە بەپشتبەستن بەفیکرەکەی ئیبن سینا کە لەڕێگەیەوە دەرگای فەلسەفەی خود و هۆشیاری لەبارەی هەردوو بەشەکەیەوە کردووەتەوە، چوونکە یۆنانیەکان هێندە گرنگیان بەئیشکالیەتی خود نەداوە، چوونکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئاراستەی شتەکان دەکرێت، هەروەك چۆن چاوپۆشی دەکات لە پەیوەندی نێوان شتەکان بەو جۆرەی کە بوونیان هەیە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە فەیلەسوفانی یۆنان جیاکاریان نەکردووە لەنێوان خودی و بابەتیی بووندا، یان جیاکاریان نەکردووە لەنێوان هەستکردنیان بەسروشتی ناوەوە ,و سروشتی دەرەکی، واتە ئینکاری بەشێکی گەورەی هۆشیاریان کردووە لەبارەی تەسەوورکردنی شتەکان و تەسەووری بوونی شتەکانەوە، واتە یۆنانیەکان نەگەشتوونەتە ئەوەی کە بڵێن جیهانی دەرەکی لە دروستکراوی عەقڵەکانی ئێمەیە و هیچ بوونێکی نیە مەگەر لەسەر بنەمای ئەوەی کە خودێك دایدەنێت و دەیسەپێنێت[٧٢].

ئەم خودە نادیارو نائامادەیە لەفەلسەفەی یۆنانیدا کە سەردەمی نوێ لەپاش ئەو شەپۆلە شك و گومانەی کە بەسەر سەردەمی نوێدا زاڵبوو لەگەڵ بیکون و دیکارتدا لەبارەی بەهای زانستی یۆنانیەوە ئاشکرابوونی ڕاگەیاند، کە دواتر بوویە

[٧٢] عبدالرحمن بدوی – ربیع الفکر الیونانی لا ٤٤ – ٤٨.

هۆی دامەزراندنی خود، ئیتر لەگەڵ کوجیتوی دیکارتیدا بێت یان لەگەڵ فەیلەسوفەکانی سەر دەمی نوێگەریدا بێت وەك کانت و نیچە. ناوەڕۆك و گەوهەری قسەکەیان بریتی بوو لەوەی کە: بوونێکی ڕۆحی هەیە کە بناغە و بنەڕەتی هەموو تەسەوورەکانە، یان هەموو بوون بریتیە لەهێزێکی ڕۆحی کە خۆی وێنادەکات و تەسەووریش دەکرێت.

نوێگەری لەسەدەی حەفدەیەم و دوای ئەویش لەسەر فەلسەفەی خود وەستابوو، بەپێچەوانەی بیرکردنەوەی یۆنانیەوە، دۆزینەوە و ئاشکراکردنی خود وەك شتێکی هەبوو ڕوویدا، وە هەروەها باسکردن لەبارەی چیەتیە کەیەوە(ماهیة) بەوەی کە ناوەڕۆك و گەوهەرە کە ئەمەش فیکرێکی ڕووتە سەریهەڵدا، ئەوەی کە دۆزینەوە و ئاشکراکردنی بوون لەپاش دۆزینەوەی خودو دامەزراندنیەوە دێت، چوونکە مەرجی تێگەشتن و دەرککردنی بوون(وجود) بەشێوەیەکی گەرم و گوڕ کەوتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، بەمشێوەیە ئەوە سەلمێنرا کە(ناسینی نەفس ئاسانترە لەناسینی تەن و جەستە)[٧٣].

خود لەلای دیکارت بریتیە لە ناوەڕۆکێك بە فراوانیەکی ڕەهاوە، کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ خۆی بەخۆی دەناسرێتەوە، کە سەرچاوەی هەموو مەعریفەیەکە، کە زەینیە و لەجەستە جیاوازە، ڕۆحانیە و بەبەشەکانی تر جیا دەبێتەوە، بەڵام کانت پێی وایە ناگەینە لای خود مەگەر بەشیکاری و لێکۆڵینەوەیەکی گێڕانەوەیی(استردادی) واتە لەڕێگەی شیکاری کرداری مەعریفەوە، چوونکە کوجیتو گرنگیەکی هەیە کە لەوەدا دیاریدەکرێت کە هۆکاری یەکگرتنە، ئەگەر مەسەلەی خود لەلای دیکارت لەسەر بیرۆکە و فیکرەی بەڵگە

---

[٧٣] کتێبی( تأملات)ی دیکارت( التأمل الثانی).

نەویستی(البداهە) وەستابێت، ئەوا خود لەلای کانت لەسەر بیرۆکە و فیکرەی پێکهاتن(التکوین) وەستاوە.

گومانی تێدا نیە کە فەلسەفەی نویێ کە لەکوجیتۆی دیکارتیەوە دەستیپێکرد، تووشی هەژانێکی توند دەبێت لەگەڵ باسە دەروونیەکاندا کە قوتابخانەی فرۆییدی بەرهەمی هێناون، کە باسی ناهۆشیاری و بێئاگایی دەکات، لەگەڵ ئەمەشدا بیرۆکە و فیکرەی خود بەبەردەوامی وەك خولگەو ناوەندە دەمێنێتەوە کە فیکرو بیرکردنەوەی بەدەوردا دەسوڕێتەوە، ئیتر بەنەرێنی بێت یان بەئەرێنی، یان دانمان بەوەدا نا کە خاتوونی ماڵی خۆیەتی یان بەپێچەوانەوە، ئەکم جیاکاریەی کە لەفەلسەفەی نوێدا هەیە، ڕگ و ڕیشەی لەکارەکانی ئیبن سینا و غەزالیدا هەیە، هەرچەندە ئەم قسەیە پێویستی بە سەلماندن هەیە و دەبێت لەرێگەی باسێکی مێژوویی قوڵ و بوێرانەوە ئەم کارە بکرێت، بەڵام ڕۆڵی ئێمە لێرەدا لە دۆزینەوە و ئاشکراکردنی حەقیقەت و ڕاستیەتی خود تێپەڕ ناکات کە غەزالی پێناسەی کردووە بەچاوپۆشی لە بۆچوونی باو کە پێیانوایە ئەو پێناسەیە لەبنەڕەتدا قسە و دەستەواژەیەکی دیکارتیە.

## ٢ — حەقیقەت و ڕاستیەتی خود(الذات)

بێگومان باسکردنی ئەم مەسەلەیە تەنها دەبێت بەشێوەیەکی میتافیزیکی بێت، هەربۆیە گووتمان غەزالی لە کتێبی میزان العمل دا جێگە و پێگەیەکی سەربەخۆی بۆ دیاری نەکردووە، بەڵکو زیاتر قسەو باس و تێڕوانینەکان لەبارەی نەفس و دەروون و خودەوە لەچەندین کتێبدا قوڵکردووەتەوە، بێگومان باسکردنی ئەم مەسەلەیە تەنها بەشێوەیەکی میتافیزیکی دەبێت، هەربۆیە گووتمان غەزالی شوێنێکی لەکتێبی

میزان العمل دا تایبەت نەکردبوو پێیەوە، بەڵکو دەبیبنین کە لە چەندین کتێبدا باس و تێڕوانی لەمەسەلەی نەفس و خوددا کردووە، گرنگترینی ئەوکتێبانەش معارج القدس فی مدارج معرفه النفس، و احیا علوم الدین و معراج السالکین و الرساله الدنیه و چەندانی تر.

هەر بۆیە غەزالی دەڵێت: : (پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێکی ئاقڵ کە خودای گەورە سەرەتاو کۆتایی هەموو فیکرەکانی و نهێنی و ئاشکرای هەموو ئیعتیبارەکانی بێت، ئەوکات چاوی نەفس و دەروونی کلرێژ دەکات بەسەیرکردنی خودا و قاچەکانیشی لەبەردەمیدا دەوەستن و بەعەقڵیشی بەناو مەلەکوتی خودایی و ئەو ئایەت و نیشانە گەورانەی کە تێیدایە گەشت دەکات) [٧٤].(مرۆڤیش ناتوانێت ئەمە وەدەست بهێنێت مەگەر لەڕێگەی مەعریفەی دەروونەوە نەبێت، هەروەك چۆن لەحەدیس و فەرموودەی ڕاشکاوی پێغەمبەردا هاتووە(من عرف نفسه فقد عرف ربه) واتە هەرکەسێك نەفس و دەروونی خۆی بناسێت ئەوا خوداش دەناسێت، (اعرفکم بنفسه اعرفکم بربه) واتە: ئەو کەسەتان کە زیاتر و باشتر خۆی دەناسێت ئەوا خوداش باشتر و زیاتر دەناسێت. غەزالی لەناسینی نەفس و دەرووندا پشتی بە مۆخی ئەو شتانە بەستووە کە لەڕێگەی بەڵگەکانەوە و ناوەڕۆکی ئەو شتانەی کە باسەکە لەسەریاندەوەستێت بەدەستدێن، کە دوورو پاکە لە سیفەتەکانی جەستە و ناسینی هێزەکانی و ناسینی تازەیی و کۆنی و بەختەوەری و بەدبەختی لەپاش جیابوونەوەی لەجەستە کە پەردە لەسەر نهێنی و زانستە شاراوەکانی ئەوکەسانە

---

[٧٤] معارج القدس لا ٦.

لادەدرێت کە شیاوی ئەو ئەرکە نەبوون). [٧٥] ئەم دەقە سروشتی بابەتەکە و سروشتی پرۆگرامەکە و سروشتی دەرئەنجامەکە ئاشکرا دەکات.

بەلأم خودی بابەتەکە بەتەواوەتی میتافیزیکیە و پاك و بەدووره لە هەموو سیفەتەکانی جەستە. بەلأم سەبارەت بە پرۆگرامەکە بریتیە لەبەلگەیی و عەقلی، وە هەروەها دەرئەنجامەکەش بریتیە لەو یەقین و دلنیاییەی کە بەلگەیە لەسەر لادانی پەردەکە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئاشکراکردن و دۆزینەوە لەمجۆرە شوێنانەدا عەقلی و بەلگەییە و پێویست ناکات کە صۆفیانە بێت، مەگەر ئەوکاتەی کە صۆفیەکی عەقلگەرا بێت، لەوانەیە ئەم مانایەش نزیکترینی ماناکان بێت لەتێگەشتنی غەزالیەوە لەپێناسەکردنیدا بۆ زانستی دلنیا و یەقینی کە دەلێت: : بریتیە لەو زانستەی کە شتە دیارو زانراوەکانی تێدا ئاشکرا دەکرێت بەبێ ئەوەی هیچ شك وگومانێکیان تێدا بێت [٧٦]. ئێستە کەواتە ئاشکرا کردن و دۆزینەوە لەم ئاستەدا شتێکی عەقلی و بەلگەییە، هەروەك چۆن بە ڕاشکاوانە لەقسەکەی غەزالیدا باسکراوە، هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد.

ئەگەر مرۆڤ بتوانێت ئەم ئاشکراکردنە بەلگەییەی بۆ بگاتە ئەنجام، ئەوکات دەتوانێت لابکاتەوە بەلای ناسینی خودای حەق تەعالا، چوونکە هەرئەوە ئامانج و کۆتایی، هەر زانستێکیش ئامانج و مەبەستێك بەدەست نەهێنێت، ئەوە زانستێکی بێ کەلك و زایەیە، بەهاتنە دی ئەو ناسینەش دەبێتە یەکێك لەو کەسانەی کە کارئاسانیان بۆ کراوە کە بەناو مەلەکوتی خوادا بگەڕێت، کە دەبێتە هۆی ناسینی ڕووی ڕاستەقینەی مەعریفەت و ناسینی خودا و تیشکەکانی ڕووناکی تێکەلی دەبن

---

[٧٥] معارج القدس لا ٦.

[٧٦] المنقذ من الضلال لا ٨٢.

[٧٧]. وە هەروەها خەڵكی لەم پلەیەدا جیاوازیان هەیە، ئەو كەسە عەقڵ چەقبەستووەی كە زانست بەچاولێكەری وەر دەگرێت، زۆر دوورە لەفێربوونی ئەم زانستانەوە، چوونكە هەموو ئاسانكاریەكانی بۆ نەخولقاوە، بەلاّم هەركەسێك چاولێكەری لەخۆی دابڕێت و زانراوە بەرزو بالآكە داوا بكات و بەشوێنیدا بگەڕێت، ئەوا دەبێتە یەكێك لەوكەسانەی كە خودا تەواوی هەست و دەركی پێ بەخشیوە، هەر لە فراوانی عەقڵ و ساف و بێگەردی زەین و تەندروستی غەریزە و بیر تیژی و زیرەكی و بۆچوون باش و تێگەشتنی پەسەند، تەنها هێندەی لەسەرە كە ئەم فیكرەیە بەكار بهێنێت و بەبیركردنەوەی درێژ و قوڵی تێڕوانین وەبەرهێنان لەم عەقڵەدا بكات، ئەمەش بەیارمەتی وەرگرتن لەخەڵوەت و گۆشەگیری و تەنیایی و دووركەوتنەوە لە سەرقاڵی و قەرەباڵغی و جێبەجێكردنی پەرستشەكان، تاوەكو دەگاتە پلەی كامڵبوون لەزانستەكاندا [٧٨].

تەندروستی و نەخۆش نەبوونی عەقڵ بەخششێكی خوداییە و شتێكی بەدەستهاتوو نیە، بەلاّم غەزالی بۆ پەیڕەوكردن و بەدەستهێنانی چەند مەرجێكی بۆ داناوە [٧٩] بەمشێوەیە دەزانین كە بنەڕەتی زانست، بریتیە لە هەستكردن بەخود بەشێوەیەكی عەقڵی كە لە زۆری بیركردنەوە و تێفكرانەوە دروستدەبێت و دەچێت بەرەو زانستی ئیلاهی و گەشت كردن تێیدا و بەدەستهێنانی بەختەوەری، لەوانەیە هەندێكجاریش ئەمە حاڵەتی صۆفیەكان بێت كە غەزالی لە مونقیزدا لەبارەیانەوە

---

[٧٧] معارج القدس لا ٧.

[٧٨] معارج القدس لا ٨، بیری ئەو قسەیەمان دەخاتەوە كە دیكارت لە بیركردنەوەكانیدا وەك مەرجێك هێناویوی( التأمل الأول الطبعة الثالثة ١٩٨٣ لا ٤٧ بۆ ٥٠.

[٧٩] كتێبەكانی غەزالی پڕن لەمجۆرە مەسەلانە، بەتایبەت احیا، وە هەروەها پەیامی( ایها الولد) ی تەرخانكردووە بەم مەسەلیەوە و ئەوەی شێولزی بەدەستهێنانی زانست و دەركەوتنی تێدا سەلماندووە.

دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: : (ئەوانە پیاوی بارودۆخن نەك پیاوی قسە بن)، ئەوەی کە دەکرێت لەڕێگەی زانستەوە بەدەست بێت ئەوا بەدەستی دەهێنێت، تەنها ئەوە دەمێنێتەوە کە لەڕێگەی بیستن و فێربوونەوە بەدەست نایەت، بەڵکو تەنها بە زەوق و هەڵسووکەوت بەدەستدێت [٨٠].سەرەتا زانست و دواتریش زەوق و حەزو ئارەزوو. ئەم دووانە دووجەمسەری نێو فەلسەفەی غەزالین، وەهەروەها مەسەلەکە تەنها لە گەڕان بەشوێن ڕاستیەتی باوەڕی غەزالیدا بەزانست قەتیس ناکرێت، ئەمەش شتێکی یەقینیە هەروەك لەدەستەواژە ڕاشکاوانەکان و ڕاستگۆیی پەیڕەوکردنەکانیەوە دەردەکەوێت. بەڵام من پێموایە دەبێت مەسەلەکە بەئاراستەی باسکردن بڕوات لەبارەی سروشتی ئەو پەیوەندیەی کە لەنێوان زانست و عەقڵدا هەیە لەلایەك و زەوق و عەقڵیش لەلایەکی ترەوە. پێشتر زانیمان زانست پەیوەستە بەعەقڵ و بەڵگەوە هەروەك پێشتر غەزالی ئاماژەی پێکرد، لەزانستیشدا دۆزینەوە و دڵنیاییەك هەیە کە هیچ شك و گومان و دوودڵیەکی تێکەڵ نابێت، وەك ناسینی نەفس و سروشتەکەی و بنەڕەتی و چارەنوسی و هێزو تواناکەی، بەڵام ئێمە بەدڵنیاییەوە ئەوە نازانین کە ئایا زەوق پەیوەستە بەعەقڵەوە یان پەیوەستە بە شتێکی ترەوە، بەتایبەت کە لەلای بیرمەندەکان نەریت وابووە کە زیاتر زەوق لەمەسەلە عاتیفیەکانی لای صۆفیەکان کە لە عەقڵگریەوە دوورن بەکاریان هێناوە، وە هەروەها ناتوانین لەم ئیشکالیەتە دەربچین، مەگەر بە ناسینی حەقیقەتی عەقڵ نەبێت لەلای غەزالی، ئەمەش ناکرێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بچینە ناویەوە، بەڵکو پێشتر دەبێت لێکۆڵینەوەی سروشتی خودەکە لەلای ئەو بکەین، چوونکە عەقڵ

---

[٨٠] المنقذ من الضلال لا ١٣٣.

پەیوەستە پێیەوە، ئەگەر نەبێتە یەکێك لەڕووەکانی و هێزێك لەهێزەکانی، ئێستە بابزانین خود(الذات) چیە؟

## ٣ — هۆشیاری لەبارەی خودەوە:

## أ — هۆشیاری خودی:

غەزالی کاتێك نەفس و دەروونی مرۆڤ دەناسێت، لەگەڵیشیدا جەستەی دەناسێت، لەڕێگەیەوە ماناکەی دەردەهێنرێت و بوونی دەسەلمێنرێت، ئێستە سەرەتا بابزانین جەستە چیە؟

غەزالی لەمعیار العلم دا جەستەی پێناسەکردووە بەوەی کە(ناوێکی هاوبەشە کە هەندێك جار بۆ ناونراوێك بەکاردێت لەو ڕووەوەی کە پەیوەست و سنوردارە و دەتوانرێت دەست بدرێت لەهەرسێ چەمکەکەی بەشێوەی(بالقوە) و ناکرداری هەرچەندە بەشێوەیەکی کرداریش نەبێت).

هەندێکجار دەگوترێت تەن و جەستە بۆ وێنەیەك کە بکرێت هەرسێ چەمکەکەی مادەی تێدا نیشان بدرێت(پانی و درێژی و قوڵی) کە سنورێکی دیاریکراوی هەیە، ئەمەش جیاوازە لەگەڵ یەکەمیندا کە ئەگەر بەهەموویەوە سنور دار نەبوایە و بەکردار و ناکردار دەستی لێنەدرایە، یان باوەڕی وابوایە کە تەن و جەستەکانی جیهان کۆتاییان نیە ئەوکات بەمشێوازە هەموو بەشێکی پێی دەگوترا جەستە و تەن، وە هەروەها دەگوترا جەستەیەکە بۆ ناوەڕۆکێکی پێکهاتوو لەهەیلوی و شێواز و وێنەیەك، ئەویش بەو سیفەتانەی کە باسمانکردن پێی دەگوترێت تەن و جەستە، جیاوازی لەنێوان چەندیەتی و ئەم شێوەیەدا ئەوەیە کە پارچەیەك لەئاوو مۆم هەرچەندە شێوەکانیان بگۆڕێن ئەوا چەمکە دەستلێدراوو

سنوردارەکانیشیان دەگۆڕێن، هیچ چەمکێکی وەك خۆی نامێنێتەوە لەڕووی ژمارەوە، بەڵام ئەو شێوازەی کە ئەم حاڵەتانەی لێ دروستبووە هەریەك دانەیە و ناگۆڕێت [٨١] و شێوازێکی گونجاوە لەگەڵ ئەم حاڵەتانەدا، وەهەروەها ئەگەر تەن و جەستەکە چڕبوونەوە، وەك گۆڕانی هەوا بە چۆنیەتی هەور یان ئاو یان وەك سەهۆڵ ئەوکات نەگونجاو نەبوو کە شێوە تەنی و جەستەییەکەی کە لەبەشی چەندیەتیدایە و ئەو شێوەیەی کەلەبەشی ناوەڕۆکدایە دەر بکەوێت [٨٢]. مانای ناوەڕۆکیش لێرەدا هەروەك ئەوەی کە غەزالی پێناسەی دەکات و چوار پێناسەی بۆ دەخاتە ڕوو، ئەوەیە کە گونجاوە لەگەڵ شێوازەکەدا بەوەی کە ناوەڕۆك و گەوهەرە، بریتیە لە پێناسەی چوارەم کە دەڵێت: (بوونی جەوهەر لەهەموو خودێکدایە کە دانراو نەبێت، ئەمەش قسەی فەیلەسوفانی پێشووە(هەبوو کە لەشوێنێکدا نەبێت) [٨٣]. ئەوەش ئەو گەوهەرو ناوەڕۆکەیە کە شوێنی ئەڵگرەکانە و لەجیهانی مەلەکوت و فەرمانی خودایە. هەندێکجاریش پێی دەگووترێت نەفس و دەروونی بێخەم(مطمئنة) یان نەفس و دەروونی فەرمانکەر بەخراپە(امارة بالسو)،

---

[٨١] ئەم قسەیە لەگەڵ پارچە مۆمی لای دیکارت بەراوورد بکە کە پێناسەی مادەی دەکات و دەڵێت: تەنها بریتیە لەکشان( التأمل الثانی).

[٨٢] معیار العلم لا ٣٠٠.

[٨٣] معیار العلم لا ٣٠٠: کە دەڵێت گەوهەر ناوێکی هاوبەشە:

أ – دەگوترێت گەوهەرو ناوەڕۆك بۆ هەموو شتێك وەك مرۆڤ و سپیەتی. دەگوترێت گەوهەری سپیەتی و خودەکەی.

ب – دەگوترێت گەوهەر و ناوەڕۆك بۆ هەموو هەبوویەك کە خودەکەی لەبوونیدا پێویستی بەبوونێکی تر نیە کە بەرابەری لەگەڵدا بکات تاوەکو ببێتە کرداری، ئەمەش مانای ئەو قسەیانە کە دەڵێن: گەوهەرو ناوەڕۆك لەسەر پێی خۆی وەستاوە.

ج – دەڵێن: ئەگەر گەوهەر و ناوەڕۆك ئەم سیفەتەیان نەبوایە ئەوکات دژەکانی قبوڵدەکرد و بەشوێنیدا دەهاتن.

د – یان پێناسەی گەوهەرو ناوەڕۆك ئەوەیە کە لەم دەقەی خۆماندا باسمانکردووە.

بەڵام غەزالی ئاماژە بە ووشە گەلێکی تر دەکات، کە پێی وایە دوورنیە لە مانای نەفس و دەروونەوە، دەڵێت: : (ئێمە کاتێك لەم کتێبەدا زاراوەی نەفس و ڕۆح و دڵ و عەقڵمان بەکار هێنا مەبەستمان پێیان نەفس و دەروونی مرۆڤایەتیە کە شوێنی شتە عەقڵگرەکانە) [٨٤].

لەمەوە تێدەگەین کە غەزالی لەپێناسەکەیدا بۆ نەفس و دەروون لەهەڵچوون و هەڵەشەی میتافیزیکی خۆی دادەماڵێت و پێیوایە کە نەفس بریتیە لەحەقیقەتی ئادەمیزاد کە دەکاتە خودی خۆی، لێرەدایە کە مانای خود دەردەکەوێت کە مانای حەقیقەت و ڕاستەقینەیی مرۆڤ دەگەیەنێت، نەفس و دەروون گەوهەرو ناوەڕۆکە و مەعقولاتەکانیش پێویستیان پێیەتی، چوونکە بوونی خۆی لەو وەردەگرێت واتە لە نەفس و دەروونەوە، وەهەروەها گەوهەریشە کە لەجیهانی فەرمانی خودایيە چوونکە بنەمایەکی جیاوازە لەجەستە.

ئەگەر ئەم مانایانە پەیوەستن بە نەفسەوە و بەشدارن لە پێکهاتنی سنورەکانی و حەقیقەت و ڕاستیەکەی کەواتە دەبێت ڕێگەیەك هەبێت بۆ تێگەشتن لێی، بەتایبەت کە غەزالی پێی وایە لەو شتە دیارانەیە کە شەرع ڕووی گووتارەکەی تێدەکات، خۆناکرێت و شتێکی عەقڵگریش نیە کە قسە لەگەڵ شتێکی نەبوودا بکرێت، یان قسە لەگەڵ شتێکدا بکرێت کە لەقسە تێناگات وەك جەستە و تەنی بێگیان، بەڵام دەکرێت بەڵگەی عەقڵی بخرێتە ناو ئەم ڕوونکردنەوەیەوە، بۆ ئەوەی زیاتر ڕوون و نزیکی بکاتەوە بەتایبەت کە نەفس ناکرێت بناسرێت مەگەر بەشێوەیەکی بەڵگەیی نەبێت [٨٥].

---

[٨٤] معارج القدس لا ١٨.

[٨٥] میزان العمل لا ٢٠.

بەڵگەش بۆسەدادەنێت بۆ ناسینی حەقیقەتی شتەکان بەگشتی، کەواتە بەڵگە لەهەندێك شتدا هاوبەشە و لەهەندێك شتی تردا جیاوازە، ناشکرێت شتێك لەیەککاتدا هەم هاوبەش بێت و هەمیش دژو جیاواز، چوونکە کۆبوونەوەی دوو دژ شتێکی نەگونجاوە، ئەگەر هەموو تەنەکان هاوبەش بن لەوەی کە تەن و جەستە بن بەپێی پێناسەی تەن و جەستە کە پێشتر باسمانکرد، واتە سێ چەمکی پچڕ پچڕ بەسەریدا فەرز دەکرێت، کە بەجوڵە و ئیدراك جیاوازن، بابزانین هۆکاری جوڵەکەی چیە؟ ئایا لەبەر ئەوەیە کە تەن و جەستەیەکە؟ ئەگەر جوڵە لەبەر تەن بوونەکەی بێت ئەوکات هەموو تەنێك دەبوایە جوڵاو بوایە، چوونکە حەقیقەتەکان لە پێداویستیەکانیاندا ناگۆڕێن و ئەوەی کە بۆ جۆرێکیان پێویستە ئەوا بۆ هەموو ئەوانە پێویستە کە بەشدارن لەگەڵ ئەو جۆر و حەقیقەتەدا، کەواتە دەبێت جوڵەکە لەبەر مانایەکی تر بێت بەدەر لە تەن بوونیەکەی، کە بنەمای کردارە، ئەم بنەمایەش بریتیە لە نەفس و دەروون، ئەگەر تەنە ڕووەکیەکان گەشە دەکەن و خۆراك دەخۆن و هاوشێوە بەرهەمدەهێنن و جوڵەی جیاواز جیاواز دەنوێنن، وەك تێری و ئاو دەردان... ئەگەر ئەم مانایانە لە تەن بوونیەوە دروستبوبن، ئەوکات دەبێت هەموو تەنەکانی تریش وابن، ئێمەش دەزانین کە هەموو تەنەکان بەوجۆرە نین چوونکە تەن بوون لەپێناسەکەیدا ئەم جوڵە تایبەتەی تێدا نیە، کەوابوو لە بنەمایەکی بێجگە لە تەنداری و تەنبوونەوە دروستبووە(واتە جوڵە) و زیادەیە لەخۆی کە پێی دەگوترێت نەفس و دەروونێکی ڕووەکی و....هتد [٨٦].

کەواتە دەروون و نەفس بنەمای کردارە لەتەنداریدا چوونکە لێی تێپەڕدەکات، کرداری دەروون و نەفسیش لە تەنبوونەوە نیە، بەڵکو لەخودی خۆیەتی، چوونکە

---

[٨٦] معارج القدس لا ١٩.

جوڵە لەو شتە خودیانەی جەستەیە، واتە پێیەوە دەلکێت و ڕووتی دەکاتەوە لەو ڕووەوەی کە جەستەیە نەك لەبەر مانایەکی گشتی تر یان تایبەتر لەو، بەڵکو تەنها لەبەر خودی خۆیەتی [٨٧]. ئەگەر مرۆڤ بەنمونە وەر بگرین ئەو مانایانەی کە لە ڕووەك و گیانەوەراندا هەن لەویشدا بوونیان هەیە، بەڵام مرۆڤ بە دەرککردن بەو شتانەی کە لەدەرەوەی هەستن لەو دوانەی تر(ڕووەك و گیانەوەران) جیادەکرێتەوە، هەربۆیە شتە ناسەرەکی و لقیەکان بەپێنج هەستەکە دەرکدەکات و شتە گشتی و سەرەکیەکانیش بە هەست و نەستەعەقڵیەکانی دەرك پێدەکات، کەوابوو شێوەی گشتی گەوهەرو ناوەڕۆکێکە کە نە تەنە و نە ناخودیشە لەجەستەیەکدا، کە نەبۆی دانراوە و نە لە شوێنێکەوە بۆی هێنراوە، تاوەکو ئاماژەی بۆ بکرێت، بەڵکو بوونەکەی بوونێکی عەقڵیە و لەلای هەست لەهەمووشتەکان شاراوەترە و بەلای عەقڵەوە لەهەمووشتەکان ئاشکرا ترە، بەمشێوەیە بوونی نەفسی مرۆڤایەتی سەلمێنرا و ئەوەش سەلمێنرا کە گەوهەرو ناوەڕۆکە و جیایە لەمادە و شێوەی جەستەیی، بەپشتبەستن بە پێوانەیەکی لۆژیکی کە لەسەر بنەمایەکی مەرجی پەیوەست، غەزالی دەڵێت: : (ئەگەر یەك زانست دابەش نابێت هەرشتێکیش کە دابەش نابێت، شوێنێکی نیە کە تێیدا دابەش ببێت. بەڵام هەموو تەنێك دابەشدەبێت و زانستیش لەنێو نەرێنیدا، کەواتە نەفس جەستە نیە) [٨٨]. لەگەڵ ئەوەی کە پێشەکیەکان نەگۆڕی خودین ئەوکات نەفس تەنێکی پێویست نیە، بەپشتبەستن بە لۆژیکی دابەشکردن، غەزالی پێنج جۆر جیادەکاتەوە کە بنەماکانی کردار لەشتەکاندا دیاریدەکات و دەڵێت: : ئەوەی کە هەستی نیە و کرداریە، ئەوەشی کە هەستی نیە کردارەکانی جیاوازن و ئەوەشی کە هەستی هەیە و

---

[٨٧] معيار العلم لا ٩٩.

[٨٨] معارج القدس لا ٢٥.

عەقلگری نیە، وە ئەوەی کە هەست و عەقلگری هەیە و کردارەکانی یەکن، وە ئەوەی کە هەست و عەقلگری هەیە کردارەکانی جیاوازن.

ئەوەی کە کردارەکەی یەکە و هەستی نیە، ئەم بنەمایە پێی دەگوترێت، بنەمایەکی سروشتی، هەروەك لەتەنە قورسەکاندا هەیە لەکاتی دابەزین و لەتەنە سوکەکانیشدا لەکاتی بەرز بوونەوەدا.

ئەگەر کرداریشی جیاواز بوو هەستی نەبوو ئەوە ڕووەکیە، چوونکە ڕووەك بەشێوەی جیاواز دەجولێتەوە. ئەگەر هەستی هەبوو بەلاّم عەقلگری نەبوو ئەوە بریتیە لەنەفس و دەروونی حەیوانی.

ئەگەر عەقلگری هەبوو لەگەلّ عەقلگریەکەشدا ئازادی و سەر پشکی هەبوو لەکارکردن و نەکردندا، ئەوە نەفس و دەروونی مرۆڤانەیە، ئەگەر عەقلگری هەبوو کردارەکەی لەسەر یەك ڕێڕەوی یەکگرتووە ئەوە نەفس و دەروونی فەلەکیە [89].

ئەوەی لەم ڕووپێویەدا مەبەستمانە بریتیە لە نەفس و دەروونی مرۆڤانەیە کە هەست و عەقلگری هەیە و سەرپشکە لەکردارەکانیدا، ئەوکات پێناسەی نەفس و دەروونی مرۆڤانە لەسەر سێ مانا وەستاوە: هەست، (الشعور) عەقلگری(التعقل) ئازادی و سەرپشك بوون(الارادە اولاختیار). هەربۆیە بەشێوەیەکی تر پێناسە دەکرێت، بەلاّم نەفسی مرۆڤایەتی بریتیە لە یەکەمین کاملّبوون بۆ جەستەیەکی سروشتی ئامێری لەو ڕوەی کە لەلایەك کارەکانی بە ئازادی و ئیختیار و بۆچوونی خۆی ئەنجام دەدات، لەلایەکی تریشەوە بە شتە گشتیەکان هەستی پێدەکرێت [90].

---

[89] معارج القدس لا ٢١.

[90] معارج القدس لا ٢٥.

لەم پێناسەیەوە ئەوە ڕوونبویەوە نەفس لەپەیوەندیدایە لەگەڵ جەستەدا و جەستەش ئامێری نەفس و دەروونە، هەروەك لەبەشەکانی داهاتوودا ڕووندەبێتەوە.

بۆ تێگەشتنی زیاتر لەم پەیوەندیە، غەزالی پێناسەی حەقیقەتی مرۆڤ و خودەکەیمان بۆ دەکات لەڕێگەی تێکەڵکردنی کۆمەڵێك مانا کە بریتیە لەوەی کە نابێتە مرۆڤ تاوەکو گەوهەر و ناوەڕۆك نەبێت و دەبێت لەچەند چەمکێکەوە بەپانی و بەدرێژی درێژ ببێتەوە و خۆی بسەپێنێت، لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت خاوەن نەفس بێت، لەگەڵ ئەوەشدا نەفسێك بێت کە بەهۆیەوە خۆراك بخوات و بەوویست و ئیرادە بجولێتەوە و بتوانێت لە شتە عەقڵگرەکان تێبگات و پیشەکان فێر ببێت و فێری خەڵکانی تریشیان بکات، ئەگەر لەدەرەوە و بێجگە لەڕووی مرۆڤایەتیەوە هیچ ڕێگریەکی نەبێت.

کاتێك هەموو ئەمانە لێك ئالآن بەهەموویانەوە یەك خود پێکدەهێنن، کە بریتیە لەزات و خودی مرۆڤ، ئەم خودە دەمێنێتەوە، ئەوەی کە لەمرۆڤدا نەگۆڕە بریتیە لەنەفس و دەروونی ئەوەی کە بەسریدا دێت و دەڕۆن و تەواو دەبن بریتین لەشتە ناخودیەکان.

کەواتە مرۆڤ پێکهاتووە لەتەن و جەستە و نەفس و دەروون، نەك جەستە و نەفس و دەروون، چوونکە لەجەستەدا هەندێك ماناکانی نەفس ئامادەییان هەیە وەك خۆراك و هەستەکان، هەربۆیە ناکرێت و دروست نیە کە بەڵگە بۆ نەفس بهێنرێتەوە لەڕێگەی لاشەوە، بەڵکو دەبێت لەڕێگەی جەستەوە ئەو کارە بکرێت، لەگەڵ گەڕان بەشوێن ئەوەی کە لەدەرەوەی ئەوە و کاریگەرە تێیدا، ئەگەر جەستە و تەن گەوهەرو ناوەڕۆك بێت [٩١] و نەفس و دەروونیش بەهەمان شێوە

---

[٩١] معيار العلم لا ٣٠٠.

گەوهەر و ناوەڕۆك بێت، ئەوکات مرۆڤ لە دوو ناوەڕۆك پێکدێت بەتێکەڵبوون و ئاوێتە بوونیان یەك خود دروستدەبێت، کە بریتیە لەحەقیقەتی مرۆڤ، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ناونانی نەفس و دەروون بەخود، باشترە چوونکە دەمێنێتەوە، ئەمە لەکاتێکدایە جەستە لەمرۆڤدا سیفەتی مانەوەی نیە، بەڵکو سیفەتی جوڵە و گەڕانی هەیە، چوونکە جەستەی مرۆڤ لەلاشەی پێکهاتووە، کەواتە هەموو لاشەیەك جەستەیە بەڵام هەموو جەستەیەك لاشە نیە، لاشەیی لەنێو جەستەیی بووندا وەستاوە، چوونکە لاشەیی تایبەتترە، بەڵام جەستە گشتی ترە، ئەم لاشەیی بوونە ڕووبەڕوی گۆڕانکاری دەبێتەوە، و لەناویش دەچێت، ئەمە لەکاتێکدایەنەفس و دەروون لەمرۆڤدا نەگۆڕن، کەواتە شیاوترن بەمانای خود، لاشەش شێوەیەکی جەستەییە لەنێو شێوە جەستەییەکانی تردا، وەهەروەها گۆڕانکاریشی بەسەردا دێت لەڕووی چڕبوونەوە و چەندیەتیەوە، جەستەیی بوون لەمرۆڤدا فەنابونی بەسەردا دێت و بەگشتی بەدەر لەو جەستەییەیە، کەوابو خود بریتیە لەنەفس و دەروون واتە(ئەوەی کە لەنێو تۆدا نەگۆڕە هەرلەو ڕۆژەوەی کە هەیت) [٩٢]. بەپشت بەستن بەبەڵگەی پیاوی فڕیوی لای ئیبن سینا کە بەشێوەیەکی تر لەلای غەزالی ئامادەباشی هەیە، بەڵگە هێنانەوەکە قوڵدەبێتەوە و مانای خودیش ڕۆشن دەبێتەوە، چوونکە پێویستی بە هەست و ئەندامەکان نیە، لەگەڵ ئەمەشدا(تۆ لە من بون و حەقیقەت و تەنانەت لە خەونی خۆشت بێئاگا نێت) [٩٣]. ئەوکات خودی لەخودی خۆی جیا نیە، چوونکە مانای عەقڵگری وەدیهاتنی چیەتیەکی ڕووتە بۆ کەسی ئاقڵ، خودیشی ڕووت و جیایە لەبەر خاتری خودی خۆی، ئەوکات پێویستی

---

[٩٢] معارج القدس لا ٢٤.

[٩٣] معارج القدس لا ٢٤.

بە ڕووت بوونەوە و توێکڵ گرتنەوە نیە، هەربۆیە چیەتیەك نیە کەلەدوایەوە عەقڵگری هەبێت، بەڵکو چیەتیەکەی عەقڵگری و مەعقولیەتەکەیەتی و عەقڵگری و مەعقولیەتەکەشی چیەتیەکەیەتی [٩٤].

بەمشێوەیە غەزالی ئیدراکێك بەخود بۆ خود دادەمەزرێنێت، واتە هۆشیاریەکی ڕاستەو خۆی بەبێ نێوەند و بەبێ ئەوەی لەڕێگەیەوە تێپەڕێت بۆ بوونی بینراوو عەینی، چوونکە بەڵگە نیە لەسەر گونجانی تێپەڕین. لەبەر ئەوەی ئەم وەحیە

---

[٩٤] سەیری نوسینەکانی دیکارت بکە لەبارەی مانای کوجیتۆ کە بریتیە لە: لکانی فیکر بەخودەوە لە مندا بەلکانێکی گومانی نەك بەلگە هێنانەوەیی، ئەمەش هەمان ئەو قسەی دیکارتە کە چیەتی خود چیەتیەکەی دەیبەستێتەوە و دەیکاتە عەقڵگریش، بەلاّم دیکارت لەم سەلماندنە مەعریفیە لایداوە بۆ سەلماندنێکی بوونی( وجودی) ئەمەش لەلای غەزالی دەستمان ناکەوێت، چوونکە بەراشکاوانە دەڵێت: ئەم بوونە تەنها شتێکی زەینیە، غەزالی لە معیار العلم لا ١٠١ دا دەڵێت( ئەگەر ئاماژە کرا بۆ شتێك و گوترا ئوە چیە ؟ جوان نیە بگوترێت کە ئەوە هەبوویەکە( موجود) یان شتێکە، بەڵکو بوون وەك و ناخود وایە، ئەمە سەرەڕای ئەو چیەتیە مەعقولەی کە هەیەتی، چوونکە شتێکی دروستە کە چیەتی شت لەعەقڵدا وەدی بێت لەگەڵ گومان لەوەی کە ئەم چیەتیە ئایا بوونی لەنێو شتە دیارەکانداً هەیە یان نا ؟).

لێرەدا دەتوانین ئاماژە بکەین بۆ کانت کە ڕەخنەی لە کوجیتوی دیکارتی و بەڵگە عەقڵیەکانی بوونی خودا گرتووە: واتە( ڕەخنەی عەقڵی تیۆری) چوونکە چیەتی سێگۆشە کە شێوەیەکە بەسێ پاڵو دەورەدراوە و دەکرێت ئەم چیەتیەش لەنەفس و دەروونی ئێمەشدا ڕوویدات و سێگۆشەکەش هیچ بوونێکی نەبێت، ئەگەر بوونەکە لەنێو چیەتیەکەدا بێت و حەقیقەتی خود بەهێز بکات ئەوکات تەسەووری بوونی تێگەشتن لەسێگۆشەکە و وەدیهاتنی چیەتیەکەی لەلەعەقڵدا نەدەکرا لەگەڵ! نەبوونیدا، پایە بەهێزەکانی خود لەگەڵ عەقڵدا دەچنە ناو عەقڵەوە هەروەك چۆن تەسەووری ئەوە ناکرێت کە شێوەی مرۆڤ لەعەقڵدا بێتە دی، مەگەر ببێتە گیانەوەرێکی ئامادە و چیەتی سێگۆشەش نایەتە دی مەگەر قەبارەیەکی سێگۆشە هەبێت، بەهەمان شێوەش ناکرێت شێوەی شتێك لەعەقڵدا هەبێت ئەگەر بێت و بوونێکی دەرەکی ئامادەی نەبێت لەعەقڵدا، ئەگەر بوونەکە بەهێزکەری خود بێت وەك گیانەوەری و شێوازی بۆ مرۆڤ، بەلاّم مەسەلەکە بەو شێوەیە نیە.

بەگشتی بوونی شتێك یان لە شتە بینراوەکاندایە، کە خوازیاری ئامادەباشیە بەهێزکەرەکان، یان لەبیرو زەینەکاندایە کە نمونەی بوونە بینراوەکانە کە هاوشێوە و گونجاون لەگەڵیدا، چوونکە مانای زانست ناکرێت مەگەر بە سەلماندنی شت و حەقیقەتەکەی نەبێت) معیار العلم لا ١٠١.

پەیڕەوی تاکبوونەوە ناکات، ئەگەریش پەیڕەوی بکات ئەوکات هۆشیاری عەینی هەیە لەگەڵ عەقڵگری چیەتیدا، چوونکە چیەتی هەمان عەقڵگریە. واتە غەزالی بەرابەرکاریەك لەنێوان چیەتی و عەقڵگریدا بەکار دەهێنێت، نەك لەنێوان چیەتی و بووندا. ئەو خود لەسەر ئاستی ئیبستمولوجی بەکار دەهێنێت، بەبێ ئەوەی بڕوات بۆ ئاستی ئەنتۆلۆجی، چوونکە ئەنتۆلۆجی مەرجی ئامادەی دیاریکراو نیە بۆ ئیبستمو لوجی.

لەم مانایەدا غەزالی لەئیبن سینا تێپەڕدەکات کە لە من و لە بنەمای شوناس منێکی لۆژیکی دیار و دەرکەوتووی بۆ زانستەکان دروستکردووە، چوونکە بنەڕەتی عەقڵی زەروری و پێویستە، واتە عەقڵ لەو ڕوانگەوەی کە ئامێرێکی تێگەشتن و ئیدراك و هەستکردنە، ئەم ئاستە لە منی سینویە کە لەلای دیکارت لەکوجیتودا دەیبینین لۆژیکێکی بەس نەبووە لەلای غەزالی، هەرچەندە دانیناوە بەبوونیدا، چوونکە لێی تێپەڕ دەکات و دەگاتە عەقڵێکی بالاتر کە ناوگەلێکی جۆراو جۆری لێ دەنێت، وەك: ڕووناکی غەریزە ڕۆحی عەقڵی، بەلام ئێمە لەم ئاستە لە لێکۆڵینەوە ناتوانین بگۆڕێین و بگەینە ئەم عەقڵە بالایە، مەگەر دوای ئەوەی لەحەقیقەتی خود تێبگەین و بنەڕەتەکەی بناسین، کە غەزالی چەندین بەڵگەی لەسەر خستووەتە ڕوو بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە خودێکە خۆی هەست بەخۆی دەکات بەبێ هیچ نێوەند گیرێك، ئەوەش گەوهەرو ڕۆحێکی جیاوازە و هیچ ئەندازە و ڕووبەرێکی نیە و بە هەست ناناسرێت و جەستەش هەستی پێناکات، دەرککردنی خودیش بەئامێرگەلێکی جەستەیی نابێت.

غەزالی زۆر بەووردیەوە پێنج بەڵگەی لەسەر شیکاری گەوهەرو ناوەڕۆك بوونی نەفس و دەروون خستووەتە ڕوو لێکۆڵینەوەی کردوون، ئێمەش لێرەدا تەنا

لێکۆڵینەوە لە چوارەم و پێنجەمیان دەکەین، چوونکە غەزالی تێیاندا شێوازی بەراوردکردنی لەنێوان جەستە و نەفس و جۆری پەیوەندی نێوانیان بەکار هێناوە و باسدەکات، ئەمەش شتێکی بەسودە وەك پێشەکیەك بۆ لێکۆڵینەوە لەسروشتی مەعریفە لەفەلسەفەی غەزالیدا.

بەڵگەی چوارەم لەسەر گریمانی بەکارهێنانی هێزی عەقڵی بۆ ئامێری جەستە دەکات بۆ ئەوەی لەو زاتەی خۆی تێبگات و بیکاتە عەقڵگر کە ناکرێت جێبەجێ بکرێت مەگەر کاتێك نەتوانێت خودی خۆی و ئامێرەکەی و عەقڵگری عەقڵگریەکەشی بکاتە عەقڵگر، چوونکە لەحەقیقەتیدا لەنێوان ئەم و خودی خۆیدا و لەنێوان ئەم و ئامێرەکەیدا و لەنێوان ئەم و ئەوەی کە عەقڵگری کردووە ئامێریك بوونی نیە، بەڵام خۆی عەقڵگری بۆ ئامێرو خودی خۆیشی کردووە، کە پێی دەگوترێت ئامێرە عەقڵگرەکەی، کەوابوو عەقڵگربوونی بەهۆی خودی خۆیەوەیە نەك بەهۆی ئامێرێکەوە بوبێت [٩٥]. لەم بەڵگەیەدا غەزالی دەگاتە ئەوەی کە دان بنێت بە دەرئەنجامێکی قوڵی چەند چەمکی فەلسەفی گەورەدا ئیتر لەفەلسەفەکەی خۆیدا بێت یان لەنێو فەیلەسوفانی سەردەمی نوێگەری هاوچەرخدا بێت، کە خۆی لەبارەی ئەم دەرئەنجامەوە دەڵێت: : (ناکرێت دەرککەر ئەو ئامێرەی کە ئامێری خۆیەتی بۆ دەرککردن و هەستپێکرن دەرکی بکات، هەربۆیە هەست لەبەر ئەوەیە کە شتێکی دەرەکی هەستپێدەکات و هەست بەخۆی و ئامێرەکەی و کردارەکەی ناکات، بەڵکو بیرکردنەوە لەئامێرەکەی نەك لەسەر شێوەیەکی تایبەت بەخۆی کە بەبێ ئەو هیچ ناکرێت، بەڵکو هەست شێوەی ئامێرەکەی بۆ نیشاندەدات، ئەگەر ئەم گونجاو بوایە ئەوکات باسی خەیاڵێکی دەکرد کە لەهەستەوە وەرگیرابێت کە

[٩٥] معارج القدس لا ٣١.

لەلای ئەو نەدرابێتە پاڵ شتێکی تر کە ئەگەر ئامێرەکەشی بەو شێوەیە نەبێت بەخەیاڵیدا نەیەت و بیری لێ نەکاتەوە [٩٦].

ئەوەی لەم قسەیەدا جێگەی تێڕوانینە بریتیە لەزیرەکی غەزالی لەتێگەشتنی ئەم مەسەلەیەدا کە ئەمڕۆکە وەك دەرئەنجامێکی بیری ڕواڵەتی دادەنرێت، بەتایبەت لەلای سارتەر، بەڵام خاڵی جیاکەرەوە لە نێوانیاندا ئەوەیە ئەوەی کە ئەم فەیلەسوفە جەختی لەسەر دەکاتەوە و غەزالی ڕەتیدەکاتەوە و مەحاڵبوونی ڕووندەکاتەوە، چوونکە سارتەر پێیوایە کە جەستە مەرجە بۆ هەستکردن و دەرککردنی جیهان، هەروەك چۆن مرلیوبونتی [٩٧] لەسەر ئەو بیروباوەڕەیە، ئەمەش بۆ نمونە چاو ناوەندە بۆ ئاماژەی بابەتی، یان بریتیە لەخاڵێك کە تێیدا هێڵە بابەتیەکان بەیەکدەگەن، هەموو شتەکەش ئەوەیە کە ئێمە ئەم ناوەندە نابینین بەڵکو زیندووی دەکەینەوە یان خۆمان دەبینە ئەو. بەمشێوەیە بابەتەکان لەجیهاندا دەمانبەن بۆلای بابەت گەلێکی تر، ئەم بابەتەش لەهەمانکاتدا جیهانی تێدا دەردەکەوێت، چوونکە بەئاراستەی شتەکان بەرەو لای ئەو دەناسرێتەوە و بەغەیری خۆی شتەکان ئاراستەیەکی دیاریکراو وەرناگرن، هەموو شتەکانیش ئاماژە بەم بابەتە دەکەن، بەبێ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕەها بتوانم بیگرم، واتە ئەم بابەتە بابەتێکی nou objet هەربۆیە پێویستە لەجیهاندا خۆم وونبکەم بۆ ئەوەی جیهان بدۆزرێتەوە [٩٨]. سارتەر دەڵێت: (من جەستەم تائەوکاتەی کە نەفسی

---

[٩٦] معارج القدس لا ٣٢ لێرەدا تێبینی جیاوازیەکی ڕوون بکە لەلای غەزالی کە لەنێوان جەستە ی دانراودا هەیە( هەست ئەوەیە کە دەستبدات لەشتێکی دەرەکی) لەگەڵ جەستە و تەنێکی تایبەت( ئەگەر بیر لەئامێرەکەی بکاتە ئەوا بیری لێکردووەتەوە نەکگ لەسەر شێوەیەکی تایبەت بەخۆی).

[٩٧] ڕواڵەتیەکانی ئیدراکی هەستی. سارتەر( بون و نەبوون).

[٩٨] الغیر فی فلسفة سارتر – فؤاد کامل دار المعارف مصر لا ٤٨.

خۆم بم، من جەستەی خۆم نیم ئەگەر نەفسی خۆم نەبم، من واتە من ڕزگارم دەبێت بەلەسێدارەدانی لەبەر ئەوەی کە من لەسەریمی) [٩٩]. ئەوەی کە سارتەر دەیداتە پاڵ جەستەی خۆی لەوەی کە خودی خۆیەتی یان منەکەیەتی هەرئەوەیە کە ئێمەش لەگەڵ غەزالیدا دەیدەینە پاڵ خود واتە نەفس و دەروون، نیشانەی ئەمەش ئەوەیە کە سارتەر دان بە هەڵوێستەکەی غەزالیدا دەنێت لەوەی کە جەستە ناوەندی ئاماژەیە ناکرێت کە ببینین بەڵکو دەتوانین زیندووی بکەینەوە چوونکە من ئەوم واتە جەستەم. داننانی سارتەر بەوەی کە ناکرێت دەرك و هەست بەم جەستەیە بکرێت بەڵکو تەنها دەتوانین بەزیندوویی بیهێڵینەوە لەڕێگەی خزمەتە مادیەکانەوە، ئەگەریش دەرکمان پێکرد ئەوا لەڕێگەی یەکێکی ترەوە دەبێت، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە غەزالی باسیکردووە، لەکۆتایی بەڵگەی چوارەمدا، لەبارەی نەفسەوە کە ناکرێت دەرککەر ئەو ئامێرە دەرکبکات کە خۆی لەئیدراکدا بەکاری دەهێنێت، بۆ نمونە چاو تەنها مێزێك دەبینێت بەلاّم نەفسی نابینێت، واتە ناتوانێت دەرك بەخود و زاتی بکات ئەگەر بیەوێت دەرکی خودەکەی بکات ئەوا لەڕێگەی خەیاڵەوە دەبێت ئەوەش بەوەی کە ئامێری ئیدراکەکەی بێنێتە بەرچاوی خۆی، بەلاّم نەك لەسەر شێوەیەك کە تایبەت بێت پێیەوە، واتە جیاوازیەکی جەستەیی هەیە لەنێوان جەستە و تەنی من لەجیهان و ئەو جەستەیەی کە من بەزیندوویی ڕایدەگرم و دەیژێنمەوە، کاتێك تێبینی ئامێری ئیدراك دەکەم لەڕێگەی هەستەوە، ئەوا لەجیهاندا تێبینی دەکەم، واتە بابەتێکی پێکهاتوو دەرك دەکەم کە بەشێوەیەکی تێرو تەواو تێکەڵ بوبێت و پێکهاتبێت، وەك شتێك لەناو شتەکانی تردا نایگێڕمەوە

---

[٩٩] الوجود والعدم – سارتر لا ٣٩١.

بۆلای نەفسی خۆم مەگەر تەنها لەڕێگەی بیر کردنەوەوە نەبێت تێیدا، ئەوکات دەبێتە موڵکی من زیاتر لەوەی کە ببێتە بوونم [١٠٠].

بەلاّم غەزالی پێی وایە ئێمە خودی خۆمان زیندوودەکەینەوە چوونکە ئێمە خۆمان ئەو خودەین. واتە من هەم نەفس و دەروونم و هەم عەقڵیشم، هەروەك سارتەر دەڵێت: من جەستەم، ئەوەی کە غەزالی دەیداتە پاڵ نەفس سارتەر دەیداتە پاڵ جەستە و تەن. هەروەك بڵێی لەم ئاستەدا غەزالی دەبینین موجادەلە دەکات لەگەڵ سارتەردا لەسەر مانای تەنداری و جەستەیی بوون، ئایا دروستە ئەم مانایەی بدەینە پاڵ کە پێشتر مانای جەستەیی بوونمان لەلای غەزالی ڕوونکردەوە. یان قسەیەکی تر بکەین و بڵێین جەستەی تایبەت بریتیە لەنەفس و دەروون، لەمکاتەشدا یەکسانیمان خستووەتە نێوان هەردوو ناوەکەوە، چوونکە هەردوو ماناکەمان وەك یەك سەیر کردووە، ئەو مانایەی کە غەزالی دەیدات بە نەفس سارتەر داویەتی بەجەستەی تایبەت، یان خودی بوون، هەروەك بڵێی مەسەلەکە تەنها جیاوازیە لە زمانەوانی و زاراوەدا، یان ئەوەیە کەبڵێین هەموو فەلسەفەیەك کاتێك وویستی لەمانای خود دوور بکەوێتەوە وەك نەفس و گەوهەر و ناوەڕۆك، ئەوکات ناچارە کە ئەم حەقیقەتەی نەفس بۆ ماناگەلێکی تر بەکار بهێنێت، وەك جەستە بەلای سارتەرەوە، کەمانای جەستەی تایبەت دەگەیەنێت، نەك ئەو جەستەیەی کە لەجیهاندا هەیە، واتەی ئەوەی کە دانراوە بۆ ناسین و توێکاری، جەستە تایبەت بەلای خودی ئێمەوە وەك نەفس وایە بەلای خودەکانمانەوە، مانای جەستەی تایبەت تاشین و هەڵکۆڵینی لەلای ئەوانەوە بلاّو بوویەوە کە ئینکاری مانای نەفسیان دەکرد بەمانا کۆنەکەی، هەروەك ئەو مانایەی لەلای دیکارت هەیە، بەلاّم

---

[١٠٠] الوجود والعدم لا ٣٦٦.

بۆ ئەوەی ماناکە ڕاسبکەنەوە لەلای خۆیان ماناکانی نەفس بەسەر ئەم دەستەواژە و زاراوە نوێیە(واتە جەستەو تەنی تایبەت) دا دەدەن کە جەستەیەکی نادیار و ئاماژەییە و جەستە و تەنێکی بابەتیانە نیە.

بەلاَم غەزالی لە بەڵگەی پێنجەمدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێشتر لەنێو موناقەشەکانمان لەبارەی سارتەرو شوێنکەوتوانی و ئەو پێشینانەی کە پێیانوایە دەروون و نەفس بریتیە لەجەستە باسکرا، ئەگەر مەسەلەکە وایە، کەواتە یان دەبێت نەفس حاڵەتێك بێت لەجەستەدا، ئەگەر لەدەرەوەی بێت ئەی چۆن دەستێوەردان دەکات لەجەستەدا و پێکهاتەکانی جەستە چۆن دەبن و چۆنیش لەنێو مەعریفە و زانیاریە عەقڵیەکاندا کار دەکات، وەئەگەر لەحاڵەتی جەستەشدا بێت ئەوکات یان لەحاڵەتێکدایە لەهەموو جەستە یان لەهەندێکیدا، ئەگەر لەهەموویدا بێت یان زیاد دەکات وەیان کەمدەکات یان درێژ دەبێتەوە، بەپێی پێویستی ئەندامەکانی لەجوڵە، ئەمەش شتێکی مەحاڵە، وەئەگەر حاڵەتێك بێت لەهەندێکیدا ئەمەش دەبێتە هۆی دابەشبوونی نەفس و دەروون، ئەمەشیان دیسانەوە هەر مەحاڵە.

ئەو دەرئەنجامەی کە غەزالی پێیوایە کە پێویستە ئاقڵەکان پابەند بن پێیەوە ئەوەیە کە نەفس گەوهەرو ناوەڕۆکە لەجەستەدا و بەشێك نیە لەجەستە، نەخوێنە و نە هەڵمە و نە میزاجە و نە شتەکانی ترە، وەهەروەها تۆ دە زانی کە نەفست لەو ڕۆژەوەی کە هەیت گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، دیارو ئاشکرایە کە سیفەتەکانی جەستە و بەدەن هەموویان دەگۆڕێن، چوونکە ئەگەر نەگۆڕێن کەواتە خۆراك ناخۆن، چوونکە خۆراك خواردن جەستەیەك لەنێو جەستەدا تێکەڵدەکات، کەوابوو نەفسی تۆ بەشێك نیە لەلاشەو بەدەن، و لەهیچ سیفەتیکیشیدا هاوبەشیناکات

لەگەڵیدا [١٠١]. ئەمەش مانای ئەوە نیە کە نەفس هیچ پەیوەندیەکی بەجەستەوە نیە، چوونکە نەفس دووکرداری هەیە کردارێك بەپێوانە کردن(القیاس) بۆلای خودی خۆی، کە بریتیە لەعەقڵگری، کردارێکیشی بەپێوانە کردنە بۆ لای جەستە و بەدەن ئەویش سیاسەتە ئەم دوانەش دژی یەکن، چوونکە ئەگەر کار لەسەر یەکێکیان بکات واز لەویتریاندەهێنێت، قورس و ئاستەمە هەردووکیان کۆبکاتەوە، ئەگەر بەدەن و لاشە نەخۆش بێت ئەوە مانای ئەوەنیە کە نەفس و دەروونیش نەخۆشە یان لەکار کەوتووە، چوونکە ئێمە زانیمان کە ئیدراکەکەی لەزات و خودی خۆیەتی و هیچ ئامێرێکی جەستە کاریگەری تێدا ناکات، کەوا بوو لەکار کەوتنی کرداری نەفس لەڕووی سەرقاڵبوونی بەجەستەوە یەکسەر لایەنی دووەم پشتگوێ دەخات، بەڵگەشمان لەسەر ئەمە ئەوەیەکە کاتێك جەستە چاکدەبێتەوە پێویستی بە دووبارە بنیاتنانەوەی مەعریفە و زانست و زانیاریەکانی نیە، واتە نەفس بەگشتی ئامادە بووە و هیچ کەموکورتیەك ڕووی تیّ نەکردووە، بەڵکو تەنها سەرقاڵبووە بەشتی ترەوە.

کەوابوو پەیوەندی نەفس بەجەستەوە تەنها پەیوەندی کارەکەری و کارکردنە [١٠٢]، ئەمەش مانای ئەوەیە کە غەزالی لەشوێنکەوتوانی ڕۆحانیەتی دەروونە واتەزات و خود بەبێ ڕۆحی حەیوانی، لەم مانایەشدا جیاوازە لەموتەکەلیمەکانی پێش خۆی کە گوتوویانە مادەیە، هەروەك نەزام پێی وابووە کە ڕۆحی مرۆڤ تەن و جەستەیەکی نەرم و نۆڵە(جسم لطیف) باشترین و بەڕێزترین شتی ناو جەستەی مرۆڤە کە بووەتە ئامێری لکاندنی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ بەیەکەوە،

---

[١٠١] معارج القدس لا ٣٣.

[١٠٢] معارج القدس لا ٣٥.

حەقیقەتی مرۆڤیش بریتیە لەڕۆح [١٠٣]. غەزالی هاوڕایە لەگەڵ بۆچوونەکەی کندی [١٠٤] و فارابی [١٠٥] و ئیبن سینادا [١٠٦] بەلآم ئیبن ڕاشد پارێزگاری لەئەرستۆییەتی خۆی کردووە لەم مانایەدا، هەروەك چۆن د ئیبراهیم مدکوریش ئەو بۆ چوونەی هەبووە، واتە(ئەوەی کە شێوەی نەفس لەجەستە جیا نابێتەوە و فانیە، بەلآم ڕۆحانیەتی عەقڵی کارای سەلماندووە [١٠٧]. بەپێی د نجاتی جیاوازی نێوان بیرمەندانی ئیسلام لەسەر سروشتی نەفس پەیوەستە بەجیاوازی یۆنانیەکانەوە لەسەر ئەم بابەتە، ئەفلاتون و ئەفلوتین قوتابخانەی ئەسکەندەرانی دەڵێن: نەفس ڕۆحانیە، هەروەك چۆن ئیبقوری و ڕواقیەکان دەڵێن: نەفس شتێکی مادیە، بەلآم ئەرستۆ هەڵوێستێکی نێوەندی لەنێوان مادی و ڕۆحانیەکاندا هەیە و چارەسەرە بەناوبانگەکەی ئەوەیە کە نەفس شێوەی جەستەیە بەلآم لەواقیعدا نزیکترە لەوەی کە بگوترێت نەفس شتێکی مادیە، هەربۆیە فەیلەسوفانی ئیسلام دژایەتیان لەگەڵدا کردووە، لەبەر شوێنکەوتنی ئەفلاتون و ئەفلاتونیەتی نوێ [١٠٨]. بەلآم غەزالی هەرچەندە دەبینین لەهەندێك شوێندا باسی مادیەتی نەفس دەکات [١٠٩]، ئەمەش باسکردنە لەو نەفسە حەیوانیە کە بەمانای ژیان دێت کە جەستەکەی لەناو دەچێت و جیایە لەنەفسی ڕۆحانی.

---

[١٠٣] الملل والنحل ب ١ لا ٤٥.

[١٠٤] رسائل الكندي تحقيق د ابوريدة.

[١٠٥] مبادي اراء اهل المدينة الفاضلة للفارابي.

[١٠٦] بە شیفاو چارەسەر ب ١ لا ٢٨٥ – وە بەئاماژەکان بەشی ٢ لا ٢٢٤.

[١٠٧] تلخيص النفس – ئیبن ڕاشد لا ١٠.

[١٠٨] د – نجاتي: الادراك الحسي عند ابن سينا لا ١١ – ١٢.

[١٠٩] الاحياء ب ٤ لا ٤٤٦ – ٤٤٧ – ٤٥٧.

## ب — هۆشیاری بابەتی:

غەزالی باس لەقۆناغی دووەم دەکات کە بەدوای هۆشیاری خوددا دێت و دەیسەلمێنێت ئەویش ئەو قۆناغەیە کە لاردەبێتەوە بەلای ناسینی حەقدا، چوونکە هەموو زانستەکان پێشەکی و هۆکار گەلێکن بۆ ناسینی خودای حەق تەعالا، هەرکەسێك خۆی ناسی ئەوا خوداکەشی دەناسێت، بۆ ئەوەی ببێتە ئاشکرا بوونی ڕووی مەعریفە، بەمانایەکی تر لێرەدا خود بەمانای عەقڵ دێت کە ئامێرێکی تێگەشتن و دەرککردنە، واتە ئامێرێکە کە زانست پێکدەهێنێت.

# بەشی دووەم

# دامەزراندنی زانست

## ١ – زانست چیە؟

غەزالی لەمونقیزدا پێناسەی کردووە بەوەی کە: (زانستی یەقینی ئەو زانستەیە کە زانراوەکانی تێدا ئاشکرا دەبێت بەئاشکرابوونێك کە هیچ گومانێکی تێدا نامێنێتەوە و گریمانی ڕوودانی هەڵەو وەهم لەبەرابەریەوە نیە) [110] لەمعیار العلم و لەچەندین شوێنیدا پێناسەی کردووە بەوەی کە(ئەو زانستەیە کەلەسەر ئەو نەفسە وەستاوە کە حەقیقەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵی نەفس بەنمونەیەکی بەرابەر لەگەڵ زانراودا) [111] بەهەمان مانا لەمعارج القدسدا پێناسەی دەکات و دەڵێت: (ئیدراك و هەست بریتیە لە وەرگرتنی وێنەی هەستپێکراوو دەرککراوەکە) بەدەستەواژەیەکی تر(ئیدراك و هەست وەرگرتنی نمونەی حەقیقەتی ناوەوەی شتێکە نەك حەقیقەتی دەرەوە، چوونکە ووێنەی دەرەکی لەشوێنی هەستپێکرا و

---

[110] المنقذ من الضلال لا ٨٢.

[111] معيار العلم لا ١٨٣.

دانانیشێت بەڵکو دەبێتە نمونەیەك لەو) [١١٢] دواتر غەزالی ئەم هەستپێکراوو مودریکاتە جیاوازانە لە التجریددا لەچوار قۆناغی جیاوازدا ڕێکدەخات:

یەکەم هەست و ئیدراکی هەستی، دووەم ئیدراکی خەیاڵی، سێیەم ئیدراکی وەهمی، چوارەمیش ئیدراکی عەقڵی، ئەمەش ڕووتکردنەوە و داڕنینی تەواوە لە هەموو پەردەیەك [١١٣].

بەپێی ئەوەی کە ڕابورد زانست بریتیە لەشتێکی بەڵگەیی، بزانە کە بەڵگەی ڕاستەقینە ئەوەیە کە مانای دڵنیایی پێویستی هەمیشەیی ئەبەدی دەگەیەنێت، کە گۆڕانی بەسەردا نایەت، وەك زانیاری تۆ سەبارەت بەوەی کە جیهان دروستکراوو حادیس و تازەیەو دروستکارێکی هەیە و چەندین نمونەی لەم شێوەیە، کە نەگونجاوە پێچەوانەکەیان ڕووبدات، چوونکە هیچکات کاتێك نایەت کە ئێمە حوکم بکەین بە قیدەم و کۆنی جیهان [١١٤]. ئەگەر زانست بەڵگەیی بێت ئەوا حەقیقەتەکەی نەگۆڕو ڕەهایە و لەبەرامبەریەوە زانستی گوماناوی و زەننی وەستاوە، واتە زانست بەوەی کە زۆربەی زۆرە. بەڵام زانستە بەڵگەیی و دڵنیاکەر و یەقینی و نەگۆڕەکان بریتین لەو زانستانەی کە پێشەکی و مەرجە پێویستەکانی بەڵگەیان تێدا کۆبووەتەوە، بابەتەکەشی زانیاریە لەبارەی خودا و سیفەتەکانی و هەموو مەسەلە ئەزەلیەکان کە گۆڕانکاریان بەسەردا نایەت، وەك ئەوەی کە دەڵێین دوو زیاترە لەسێ، ئەمە لەکاتێکدا زانست و زانیاری لەبارەی شتەکانی ئاسمان و زەوی و

---

[١١٢] معارج القدس لا ٦١، پێویستە ئاگاری ئەوەبین کە مەعریفەی کرداری تەنها وێنەیەکی جیهانە و بریتی نیە لەحەقیقەتەکەی، ئەمەش سروشتی ئیدراکی زانستیە کە حەقیقەتەکەی دەڵێت: زانست ئاوێنە نوێنی ئێمەیە بۆ جیهان نەك حەقیقەتی جیهان بێت.

[١١٣] معارج القدس لا ٦٢.

[١١٤] معیار العلم لا ٢٥٥.

ئەستێرە و چەمك و ئەندازە و چۆنیەتی ڕێڕەویان شتێکی بەڵگەیی و نەگۆڕ نیە، وەهەروەها زانستە زمانەوانی و سیاسیەکانیش هەربەو جۆرەن، چوونکە بەپێی کات و شوێن دەگۆڕێن، وە هەروەها مەسەلە فیقهی و شەرعیەکانیش هەر بەو جۆرەن و تەنها گوماناوی و زننین و گۆڕانیان بەسەردا دێت، وەهەروەها بارودۆخە مرۆییەکانیش کە دروستدەبن حاڵەتی ئەوانیش شتێکی نەگۆڕ نیە و نابنە بەڵگەیی [١١٥]. بەمشێوەیە تێبینی دەکەین کە غەزالی جیاکاری دەکات لەنێوان دووجۆری زانستدا بەپێی ڕاستیەتی بەڵگە و دڵنیایی و یەقینیەکەی، ئەوەی کە بەڵگەیی و یەقین و نەگۆڕە ئەوە ڕاستی ڕاستەقینەیە و بابەتەکەشی میتافیزیکی و پشتەوەی سروشتە، وەك زانست لەبارەی خودا و سیفەتەکانیەوە... لەگەڵ ئەوەی کە زەننیە و گۆڕانکاری بەسەردا دێت بەپێی کات و شوێن، ئەوە زانستی ڕاستەقینە نیە و بابەتەکەشی مەسەلە مرۆیی و سروشتیەکانە، ئەم دوو بەشەش لەزانست غەزالی بەپێی ڕێکخستن و پێویست بوونی هەریەکەیان بەوی تر و بەپێی پەیوەندیان بە نەفس و دەروونەوە باسیاندەکات و دەڵێت: : (کاتێك نەفس بەهەمیشەیی دەمێنێتەوە ئەوا ڕزگاری و بەختەوەریەکەی بەهەمیشەیی دەبێت کاتێك لە زانستە حەقیقی و ڕاستەقینەکاندا بێت، وەك زانست لەبارەی خودا و سیفەتەکانی و فریشتەکانی و ڕێکسازی بوونەوەران و ڕیزبەندی هۆو هۆکارەکان(الاسباب والمسببات)، ئەو زانستانەی کە یەقینی و دڵنیایی هەمیشەیی نین ئەگەر داوا بکرێن ئەوا لەبەر خودی خۆیان نیە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە لەڕێگەیانەوە مرۆڤ بتوانێت بگات

---

[١١٥] معیار العلم لا ٢٥٧، ئێستە لەوە تێگەشتم کە غەزالی جیاکاری دەکات لەنێوان زانست لەبارەی خوداوە( واتە زانستی ڕەها لەبارەی حەقیقەتەوە) و زانستەکانی تردا وەك: زانستی سروشتی و مرۆیی و زمانەوانی و سیاسی و زانستی نەسەبی و گریمانی و مێژووییدا.

بەزانستەکانی تر) [116]. هەربۆیە ناکرێت بەزانستی حەقیقی و ڕاستەقینە ناوزەدیان بکەین، بێجگە ئەو زانستەی کە فەلسەفە بەدەستیهێناوە، هەروەك هیگڵ لەسەر ئەو باوەڕەیە، چوونکە زانستەکانی تر ناتوانن ئەم شێوازە لەحەقیقەت وەدی بهێنن، چوونکە بەردەوام بەرێژەیی و گۆڕاو دەمێننەوە، لەچارەسەرەکانیشیاندا بەبابەتی دەمێننەوە و نابنە ڕەها لەحەقیقەتیشیاندا تەنها نمونەیەکی خودی هاوبەشن بۆ جیهان INTERSUDGECTIF.

## ٢ – حەقیقەتی بەڵگە:

(زانستە ڕاستەقینە و حەقیقیە تەسدیقیەکان بریتین لەمادەو کەرەستەکانی بەرابەر کردن(القیاس) ئەگەر لە زەیندا بەپێی ڕێکخستنی تایبەت ئامادەباشیان هەبێت، ئەوکات نەفس و دەروونیش ئامادە دەبێت بۆ ئەوەی لەلایەن خوداوە زانستی تێدا دروستببێت) [117]. لەم قسەیەدا غەزالی مەزهەبەکەی خۆی بەتەواوەتی لەبارەی هۆکارو سەبەبیەتەوە ووێنا دەکات و خودا دەکاتە ئافرێنەری ڕاستەقینەی هەموو شتەکان کە دروستیاندەکات لەنێو ئەو نەفس و دەروونانەی کە ئامادەباشیان تێدایە، کەواتە ئامادەباشی لەلایەن مرۆڤەوە و ئافراندن و دروستکردنیش لەلایەن خوداوە. بۆ تێگەشتن لە حەقیقەتی ئەم قسەیە دەبێت شیکاری ئەم ڕاهێنانە تایبەتە بکەین، واتە ئەو پێشەکیانەی کە لەمونقیزدا

---

[116] معیار العلم لا ١٨٥.

[117] معیار العلم لا ١٨٥ – ٢٥٨.

باسیاندەکات و دەڵێت: : شتانێکی سەرەتایی سەلمێنراون [١١٨]، غەزالی درێژەی داوە بەم بابەتە و گێراویەتیەوە بۆ چوار بەشەکەی:

**بەشی یەکەم:**

شتە سەرەتاییە عەقڵیە ڕووتەکان، کە بابەت گەلێکن لەڕووی هێزە عەقڵیە ڕووتەکانەوە کە لەزەیندا ڕوودەدەن، یان لەبەر یارمەتی هەست یان خەیاڵ یان لایەنێکی تر، وە بەشێوەیەکی ناچاری دەردەکەوێت بۆ ئەو زەینەی کە باوەڕی پێدەکات، هەروەك بڵێی زانا بووە پێی، هەروەك ئەو نمونەی کە دەڵێت: : دوو لەیەك گەورەترە.

بەم دیاریکردنە غەزالی دان نانێت بە فیکرە فیتریەکاندا کە دیکارت باسی بۆ کردوین کە لەخودی بیرکەرەوەدا بوونیان هەیە، چوونکە خودی بیرکەرەوە لەلای غەزالی هەڵگری فیکرە یەقینیەکانی حەقیقەتە لەلای دیکارت، چوونکە فیکرە دروستکراوەکان لەوانەیە هەڵەیان تێکەڵ ببێت، بەڵام فیکرە یەکەمینەکان(خوداییەکان) بەهیچ شێوەیەك هەڵەیان تێکەڵ نابێت، ئەمە لەکاتێکدا غەزالی نەرێی خودی هۆشیار دەکات بەخودی خۆی، بەڵام کاتێك بچێتە ناو پەیوەندیەوە لەگەڵ جەستە و کاتدا بنەماکانی بەدەستدەهێنێت، بەبنەماکان دەستپێدەکات و لەپاش گەشتە دووروودرێژەکەی بە ڕەها کۆتایی پێ دێت.(ئەم ڕەگەزە لە زانست زەین لە بەڕاستزانین و تەسدیقیدا ناوەستێنێت مەگەر لەسەر

---

[١١٨] لەمونقیزدا لا ٨٦ دا هاتووە: هیچ بەڵگەیەك ناهێنرێتەوە مەگەر لە زانستە سەرەتاییەکان پێکهاتبێت ئەگەر سەلمێنراو نەبن ئەوا بەڵگە ڕێکناخرێت.

تەسەوورکردنی شتە سادە و بەسیتەکان، واتە سنورو پێناسە و خودە تاکەکان)
[١١٩].

بەشی دووەم: هەستپێکراوەکان(المحسوسات):

کاتێك عەقڵ تێکەڵ بە هەست دەبێت، ئەوکات سەرەتاییە هەستیەکان هەستپێدەکات و دەیانزانێت، هەروەك زانیاری ئێمە کە فیکرو ترس و توڕەیی و ئارەزوو حەزوو تێگەشتن و دەرك و هەستەکانمان هەیە، تێکەڵ نەبوونیش لەگەڵیدا دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەم تێگەشتن و ئیدراکەدا، ئەمەش بەیارمەتی هێزە عەقڵیە ناخی و شارەوەکان کە پەیوەندیان بە ڕۆحی حەیوانیەوە هەیە دێتە دی.

بەشی سێیەم: ڕێڕەوەکان(المجریات)

ئەمانەش لە دەرئەنجامی هەستپێکراوەکانن، بەیارمەتی پێوانەیەکی شاراوە وەك حوکمی ئێمە بەوەی کە لێدان ئێشی هەیە، شکانی مل مرۆڤ دەکوژێت، ئاگر سوتێنەرە، هەست لەکاتی ڕوودان و دووبارە بونەوەیاندا هەستی بەم مانایانە کردووە، واتە غەزالی دڵنیاو بێخەمە لە مەسەلە ئەزموونیەکە و بەبنەمایەکی یەکەمی دادەنێت لەبنەماکانی عەقلگری، بەوەی کە ئەزموونەکە هاوڕێ بێت لەگەڵ دووبارە بوونەوەدا، چوونکە دووبارە بوونەوە ڕێگەی دڵنیابوونەوەیە لە مەسەلەی ئەزموونیدا، هەندێکجاریش غەزالی باسی لێکۆڵینەوە و شیکاری دووبارە بوونەوە دەکات، بۆ زانین و ناسینی ئەوەی کە چۆن دەگاتە یەقین و دڵنیابوون[١٢٠].لەڕاستیدا غەزالی لەم بەشەدا ئیشکالیەتێك دەوروژێنێت کە لەکتێبی(تهافت الفلاسفه) دا بەشێکی سەربەخۆی بۆ تەرخانکردووە و تێیدا موناقەشەی لەگەڵ

---

[١١٩] معیار العلم لا ١٨٧.

[١٢٠] تعلیق د سلیمان علی معیار العلم لا ١٨٨.

فەیلەسوفەکاندا کردووە لەسەر هەڵوێستەکانیان و تێگەشتنیان لە مەسەلەی هۆکاری و سەبەبیەت، موناقەشەیەکی زۆر توند بووە بەجۆرێك کە دووژمنانی غەزالی تاوانباریانکردووە بەوەی کە ئینکاری هۆکاری و سەبەبیەت دەکات، چوونکە باوەڕی بە موعجیزە و پەرجو هەیە، بەڵام شتەکە بەپێچەوانەی ئەوەیە کە ئەوان باوەڕیان پێیەتی، چوونکە هۆکاری و سەبەبیەت مەسەلەیەکی ئەزموونیە و دەچێتە ناو ئەم چوارچێوەیەوە، هەربۆیە پێویستە چارەسەر بکرێت، نەك وەك مەسەلەیەکی عەقڵی ڕووت، هەردوو لێکۆڵینەوەکە لەڕووی زەرورەت و پێویستیەوە جیاوازن، هەربۆیە غەزالی پێیوایە کە کێشەی هۆکارو سەبەبی ناگەڕێتەوە بۆ خودی پەیوەستبوونەکە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ڕووی ئەو پەیوەستیە و دەڵێت: (گومان لەمردنی کەسێك کە گەردنی پەڕێنراوە تەنها دڵڕاوکێ و وەسوەسەیەکی ڕووتە، باوەڕبوون و بەمردنەکەی دڵنیاییەکی حاشا هەڵنەگرە) [١٢١]. لەنێو ئاقڵەکانیشدا کەسێك نیە گومان لەمەدا بکات، بەڵام تێڕوانین لەڕووی پەیوەستبوونەوە شتێکی ترە کە ماناکەی(ئایا شتێکی پێویست و زەروریە کە نەکرێت گۆڕانی بەسەردا بێت، یان بەحوکمی ڕێڕەوی نەریتی خودا دەجوڵێتەوە بەهۆی وویستی ئەزەلیەوە لەنێو دروستکراوەکانیدا کە گۆڕان قبوڵناکات [١٢٢]. ئەم وەڵامەش لەماناکەیدا دەبینین و بەزوترینی کاتیش لە زاراوەکەشیدا لەلای ئیبن ڕوشد کە زۆرێك دژایەتیانکردووە تێیدا بەڵام کۆتاییەکەی گەشتووەتە ئەم قسەیەی خۆی، ئەمەش هەمان ئەو قسەی ئیبن ڕوشدە کە دەڵێت: (پێویستە بزانین ئەوەی کە ئینکاری ئەوەبکات کە هۆکارەکان بەیارمەتی خودا کاریگەرن لە شتەکاندا ئەوە دانایی و حیکمەت و

---

[١٢١] معيار العلم لا ١٩١.

[١٢٢] معيار العلم لا ١٩١.

زانستی بەتاڵ کردووەتەوە) [١٢٣]. بەمشێوەیە غەزالیش هۆکارو سەبەبیەتی گێڕاوەتەوە بۆ قوڵاییەکی تر کە بەخۆی نەوەستاوە لەسروشتدا، کە بریتیە لەوویستی خودا، جیاوازی نێوانیشیان تەنها شێوازێکە کە شەڕی پێگەکان پێشەنگی دەکات نەك حەقیقەتی زانست [١٢٤] لەنێو ئەم بەشەشدا واتە ڕێڕەوەکان غەزالی بەشێك تەرخاندەکات بەگومان و حەدسیاتەکان، کە(بریتین لەمەسەلەکانی بنەمای حوکم کە حەدس و گومانێکە لەنەفس و دەرووندا کە بەهۆی بێگەردی زەین و هێزەکەیەوە ڕوودەدات) [١٢٥].

بۆ وەدیهاتنی ژیریش غەزالی پەیڕەو کردنی زانستەکانی کردووەتە مەرج و دەڵێت: (هەرکەسێك سەرقاڵی زانستەکان بێت ئەم ڕەگەزەی بۆ وەدی دێت لەڕێگەی ژیری و ئیعتیبارەوە کە مەسەلە گەلێکن ناکرێت بەڵگەیان لەسەر بهێنرێتەوە و گومانیشیان تێدا بکرێت و ناشکرێت خەڵکی تریش بەشدار بێت لەگەڵیدا لەڕێگەی فێربوونەوە. مەگەر ئەوکاتە نەبێت کە فێرخواز ئەو ڕێگەیە

---

[١٢٣] لێرەدا تێبینی ئەوە بکە کە ئیبن ڕوشد خودا دەکاتە نێوەند لەنێوان هۆکاری شتەکاندا( الكشف عن منهاج الادله لا ١٢٧.

[١٢٤] پێموایە پێویستە چاوێك بخشێنینەوە بە سروشتی ئەو دژوایەتیەی کە لەنێوان ئیبن ڕوشد و غەزالیدا هەیە، ئەویش لەڕێگەی دووبارە خوێندنەوەیەکی بۆ حەقیقەتی ڕەخنەی غەزالی لە فەیلەسوفەکان و ڕەخنەی ئیبن ڕوشدیش لە غەزالی، چوونکە ئیبن ڕوشد باوەڕی بە حەقیقەتی تهافت الفلاسفه نەبووە( فارابی و ئیبن سینا) بۆ ئەوەی پشتگیری غەزالی بکات، بەڵام نەك لەبەر ئەو هۆکارەی کە غەزالی باوەڕی پێیەتی بەڵکو لەبەر هۆکارێکی ترە کە ئیبن سینا و فارابی فەلسەفەی ئەرستۆیان بەلاڕێدا بردووە، وە هەروەها ڕەخنەکەش ئاراستەی فەیلەسوفانی ئیسلام کراوە نەك ئەرستۆ بەڵام لەم حاڵەتەدا پێویستە نوسینەکەلامی و فیقهیەکانی ئیبن ڕوشد بخوێنینەوە بۆ ئەوەی هەڵوێستی لەبارەی هەموو نوسینەکانیەوە ئەوە دیاریبکەین، وەهەروەها نابێت پەیوەندی ئیبن ڕوشد لەگەڵ ئەرستۆدا وەك پەیوەندی غەزالی سەیر بکرێت لەگەڵ فەیلەسوفەکاندا لەئامانج و مەبەستەکانیاندا.( اربعين في اصول الدين لا ١٣ – ١٤ – ١٥ – ١٦).

[١٢٥] معيار العلم لا ١٩١.

بگرێتەبەر کە ئەم گوتوویەتیە تاوەکو خۆی سەرپەرشتی هەڵسووکەوتەکانی خۆی دەکات و ئەو هەڵسووکەوتە دەبیات بەرە و ئەو بیروباوەڕە، ئەگەر زەینی لەهێزو بێگەردیدا لەسەر پلەی کامڵبوون بێت) [١٢٦]. بەچوونە ناو ئەم بەشەوە لەوە تێدەگەین کە ئەو شتە یەقینیانەی کە ناتوانین بەڵگەیان بۆ بهێنینەوە مەگەر کاتێك نەبێت کە داوا لەغەیری خۆمان بکەین کە ڕێگەکەمان بگرێتە بەر(ناکرێت هەموو موجادەلەچیەك ببەزێنرێت پێویست ناکات لەتواناهان بەسەر موجادەلەدا تەماعی ئەوە بمانگرێت لە هەموو حەقێکدا موجادەلە بکەین. هەندێك لە عەقیدە و بیروباوەڕی یەقینی هەن کە بێجگە لەئێمە کەس ناتوانێت پێناسەیان بکات مەگەر لەڕێگەی بەڵگەوە نەبێت یان مەگەر بەشداری پێبکەین لەپەیڕەوکردندا بۆ ئەوەی لەزانستە بەسودەکاندا بەشداریمان لەگەڵدا بکات) [١٢٧]. هەرکەسێك نەچێژێت نازانێت، هەرکەسێکیش نەگاتە دەرك و هەست ناکات.

کەواتە ژیری لەبەشی زەوقە، هەربۆیە مەرجە کەزانستەکان و هێزی زەین و بێگەردی و سیفەتەکانی پەیڕەوبکرێن، چوونکە ژیری و حەدس حاڵەت و پلەیەکە کە لەپاش ماوەیەك لە عەقڵگری و فێربوون و ئەزموون پێی دەگەین، ژیری هێزێکە لەنەفسدا ڕوودەدات، بەهۆی یەکەمین عەقڵگریەوە، هەرکەسێك نەگاتە پلەو گەشاوەییەکانی یەکەم، هەست بەحەقیقەت و ڕاستی ئەم هێزە ناکات، هەرکەسێکیش ئینکاری بکات ئەوە بێتوانایی زەینی خۆی سەلماندووە نەك مەحاڵی هەبوونی(واتە مەحاڵی هەبوونی زەینی خۆی).

## بەشی چوارەم:

---

[١٢٦] معيار العلم لا ١٩٢.

[١٢٧] معيار العلم لا ١٩٢.

ئەو مەسەلانەن کە لەڕێگەی خۆیانەوە نەناسراون، بەڵکو بەهۆی نێوەندێکەوە، بەلاّم زەین جیانیە لە نێوەندەکانی، هەروەك دەڵێین دوو یەك لەسەر سێی شەشە، ئەمە دیارو ئاشکراو زانراوە بەنێوەندێك کە هەموو شتێك کە دابەشدەبێت بەسەر سێ جۆری یەکساندا یەکێك لەبەشەکانی دەبێتە سێ یەك.

ئەم بەشەش پێکهاتووە، بەلاّم پێکهاتنەکەی لەپلەی یەکەمە، وە هەروەها بەڕێڕەوی ئەوەلیات و شتە سەرەتاییەکاندا دەڕوات.

پێشەکیەکانی بەڵگە و تەوەرەکانی زانست دەرئەنجامگەلێکی پەیوەندی ڕاستەوخۆن لەنێوان خود و لاشەو جیهاندا، دەرئەنجامی ئەم پەیوەندیە وەدیهاتنی ئەوەلیاتە عەقڵیە ڕووتەکان و ئەوەلیە هەستپێکراوو ئەزموونکراوەکانن، لەوانەش ژیریەکان و مەسەلەکان، کە بەهۆی نێوەندێکی ڕاستەوخۆوە ناسراون کە ئەم زانستە ئەوەلیانە ئەگەر لەزەیندا ئامادەباشیان هەبێت بەپێی ڕێکخستنێکی تایبەت، ئەوکات نەفس و دەروونیش ئامادە دەبێت بۆ ئەوەی زانستی تێدا ڕوودات وەك دەرئەنجامێك لەلایەن خوداوە، ئەنجامی قسەکە ئەوەیە کە زانستە یەکەمینەکان سەبارەت بە شتە تاکەکان دەبێتە تەسەوور، ئەوەشی کە دەدرێنە پاڵ شتانێکی تر دەبنە تەصدیق، کە لەنەفسدا و لەلایەن خوداوو یەکێك لە فریشتەکانیەوە لەکاتی ڕوودانی هێزی عەقڵ بۆ نەفس ڕوودەدات، نمونەی هەستپێکراوەکان لەخەیاڵ و خوێندنەوەی و هێزی عەقڵی هەروەك هێزی بەسیرەت و بینایە لەچاودا [١٢٨].بەمشێوەیە ئامادەباشی تایبەت سەرەتا لەنەفس ودەروونەوە دەبێت و دواتریش وەدیهاتنی زانستەکان، ئەمەش مانای ئەوەیە کە وەدیهاتنی زانست چەند مەرجێکی دەروونی هەیە سەرەڕای مەرجە خودیەکان کە

---

[١٢٨] معيار العلم لا ٢٣٥.

دەیانسەپێنێت، مەبەستیشمان مەرجەکانی بەڵگە و دڵنیابوونەوەیە لەیەقین، چوونکە ئێمە دەبینین کە ئاقڵەکان لەتێڕوانینەکانیاندا هەڵە دەکەن، بزانە کە خەیاڵ و وەهم و عەقیدە و بیروباوەڕگەلێکیان تێدایە کە پێیانوایە کە حوکم و یاساکانی هی عەقڵن، هەربۆیە هەڵەکە دەدرێتە پاڵ عەقڵ [١٢٩].

ئەگەر عەقڵ پەردەی وەهم و خەیاڵی لەسەر لابرێت تەسەووری هەڵەی لێ ناکرێت، بەڵکو شتەکان وەك خۆیان دەبینێت [١٣٠].

عەقڵ ناتوانێت زانست بنیات بنێت و دایبمەزرێنێت، مەگەر لەنێو کۆمەڵێك مەرجدا نەبێت کە بکرێت دیاریبکرێن، لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی کە پێشتر ڕوونمانکردەوە بەمەرجەکانی خودی و مەرجە نەفسی و دەروونیەکان بۆ وەدیهاتنی زانست.

## ٣ – مەرجە خودیەکان بۆ وەدیهاتنی زانست:

ئەم توخمە بەپرسیارێکی ناوەندی و بنەڕەتی و لەفەلسەفەی غەزالیدا بەگشتی و لەمیزان العمل یشدا بەشێوەیەکی تایبەت، دەناسرێتەوە، ئەویش بریتیە لەوەی کێ وایلەزانست کردووە کە بێتەدی؟ یان مەرجەکانی هاتنەدی زانست چین؟ ئەم مەرجانە لەڕێگەی جیاکاری لەنێوان نەفسی حەیوانی و نەفسی مرۆییەوە جیادەکرێتەوە، یەکەمیان(نەفسی حەیوانی) بریتیە لەحەقیقەت و ڕاستی جەستە، دووەمیشیان(نەفسی مرۆڤانە یان مرۆیی) بریتیە لەخودی مرڤانە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە خود لەبیناکردنیدا بۆ زانست دەچێتە نێو پەیوەندیەکی بەهێزەوە لەگەڵ

---

[١٢٩] مشكاة الانوار لا ١٢٧.

[١٣٠] مشكاة الانوار لا ١٢٧ – تێبینی بکە لێرەدا غەزالی مەرجی نەکەوتنە ناو هەڵەوە دادەنێت، چوونکە عەقڵ لەحەقیقەتی خۆیدا هەڵە ناکات، هەڵەش نابێت مەگەر ئەوکاتەی کە وەهم و خەیاڵ شێوەی عەقڵ تێکبدەن.

نەفسی حەیوانیدا، واتە لەگەڵ هێزەکانی جەستەدا، هەربۆیە ناکرێت هەست بەمەرجەکانی وەدیهاتنی زانست بکەین مەگەر لەڕێگەی ناسینی هێزەکانی جەستەو هێزەکانی خودەوە نەبێت.

## أ – ڕۆڵی جەستە:

غەزالی ڕۆڵێکی گرنگ و ئەوەلی دەدات بە جەستە لەبەدەستهێنانی زانستدا، بەلای ئەوەوە جەستە زانراوە لەڕووی تاقیکاریە پزیشکی و زانستە توێکاریەکانەوە، بەڵکو غەزالی تەنانەت بەڕاشکاوانە لەچەندین جێگە لەکتێبەکانیدا داندەنێت بەوەی کە سودێکی زۆری لەزانستی پزیشکی بینیوە کە پەیوەندیان بەجەستەو هێزەکانیەوە هەیە، هەروەك لەمیزان العمل دا دەڵێت: (ئەمەش بەزانستی پزیشکی ناسراوە) [١٣١]. زانستی پزیشکی پێناسەی دەکات بەوەی کە نەفسی حەیوانی(واتە هێزەکانی جەستە) دوو هێزە، یەکێکیان جوڵێنەرە و ئەویتریشیان هەستپێکەرە، هەستپێکەرەکە دووبەشە: وەدیهێنەر(باعث) و دەستپێشخەری جوڵە. بەتێڕوانین و بیرکردنەوە لەو دابەشکاریەی کە هێناویەتی [١٣٢] کە کۆك و گونجاوە لەگەڵ فەیلەسوفەکانی پیش خۆیدا وەك ئیبن سینا، دەبینین غەزالی بیرکردنەوەیەکی قوڵ و وورد دەکات بۆ ئامێری جەستە، چوونکە حەقیقەت و ڕاستەقینەیی جەستە ئامێرێکە کە هێزە بابەتیەکان حوکمی تێدا دەکەن، کە دەکرێت هەستیان پێبکرێت و چۆنیەتی ڕۆشتنیشیان بزانرێت.

هێزی وەدیهێنەر و جوڵێنەر لەهێزە نەزعەیی و شەوقیەکاندا بەرجەستە دەبن، واتە ئەوان ناوەندی پاڵنەرە جوڵێنەرەکانن کە لەخەیاڵدا کۆدەبنەوە، بەجۆرێك

---

[١٣١] میزان العمل لا ١٩.

[١٣٢] میزان العمل لا ١٨ – ١٩.

شێوەیەکیان ڕوودەدات هەروەك بڵێی ئەو شتە خوازراوە یان مرۆڤ لێی ڕادەکات و بێزراوە، ئەوکات هێزی ڕاستەوخۆی جوڵەی وەدیهێنەر لە دەمار و ماسولکەکاندا، ماسولکەکان توشی ڕەقبوون دەبنەوە دەمارە پەیوەستە تاکەکانی لکاو بە دەمارەوە دەبەن بەرەو لای شوێنی دەستپێك یان وازیان لیّ دەهێنێت، هەرکە وەدیهێنانێك ڕوویدات یەکسەر وەڵامدانەوەیەکی جوڵەیی دەبێت، ئەو پەیوەستە ئامێریەش ئەرکێکی قورس دەگرێتە ئەستۆ کە لەکاتی گونجانی تەواودا جەستە دەکاتە ئامێر، بەڵام ئەم پاڵنەر و وەدیهێنەرانە دابەشدەبن بۆ: پاڵنەری هەواو ئارەزوو، پاڵنەری توڕەیی [١٣٣].

پاڵنەرە ئارەزووبازانەکان(الشهوانیە) پەیوەستن بەسود و لەزەتەوە، بەڵام پاڵنەرە توڕەبوونیەکان پەیوەستن بە داواکردنی زاڵبوون و دەسەڵاتەوە، دەتوانین ئەم دوو هێزە بەمشێوەیەی لای خوارەوە کورتبکەینەوە:

وەدیهێنەر یان پاڵنەر ⟵ وەڵامدانەوەی جوڵەیی

پاڵنەرەکان ⟵ (١) ئارەزوو ⟵ بەدیهێنانی حەز: سودو لەزەت

یان

بەدیهێەرەکان ⟵ (٢) توڕەیی ⟵ بەدیهێنانی زاڵبوون

بەمشێوەیە غەزالی لەم ئاستەی دابەشکردنەدا جەخت لە بنەمای فیزیۆلۆجی دەکاتەوە بۆ جوڵە و دەڵێت: (ڕۆحی حەیوانی جەستە تەنێکی نەرم و نۆڵە، وەك چرایەکی داگیرساوە، ژیانیش بریتیە لەچراکە و خوێن زەیتی گڕگرتنەکەیەتی و

---

[١٣٣] تێبینی ئەو ڕاڤە هەڵسووکەوتیە بکە کە غەزالی لەڕێگەی پەیوەندی ئامێریەوە دروستیدەکات لەنێوان وەدیهێنەر و پاڵنەردا، کە پەیوەندیەکی ئامێری پێویستە.

جەستە و جوڵەش رووناکیەکەیەتی و ئارەزووش گەرماکەیەتی و تورەیش دووکەڵەکەیەتی. لەلای هەموو گیانەوەران و مرۆڤیش جەستە و تەن و شوێنەوارو نیشانەکانی هەیە، ئەم رۆحەش رێنوێنی ناکرێت بۆلای زانست و رێگەی دروستکراویش ناناسێت و مافی دروستکەریش نازانێت، بەڵکو تەنها خزمەتکارێکی دیلە) [١٢٤].ئەم شیکاریە فیزیۆلۆجیە زیاتر جەختی لەسەر دەکرێتەوە کاتێك غەزالی پێناسەی مردن دەکات و پەیوەستیدەکات بە هۆکارگەلێکی وەستاو لە پێکهاتەی ئەندامیی(العضوی) جەستەدا.لاشە دەمرێت ئەگەر رۆن و زەیتی خوێن زۆر ببێت، دەشکوژێتەوە لەبەر زۆری گەرماکەی، ئەگەر گەرماکەی کەم بێت لەبەر زۆری ساردی و سەرما دەکوژێتەوە و کوژانەوەکەشی دەبێتە هۆکاری مردنی جەستە [١٢٥]. ئەگەر ئەمە حاڵی جوڵە بێت ئەی چۆن هەست و ئیدراك دیاریدەکرێت و پێناسە دەکرێت؟ غەزالی ئیدراك وەك هێزێکی حەیوانی (واتە جەستەیی) پێناسە دەکات و پێی وایە کە ئیدراك و هەست دوو بەشن: دیار و نادیار، واتە بەشێك دەگەرێتەوە بۆ پێنج هەستەکە، بەشەکەی تریش خۆی لە هێزە ناخیەکانی ئیدراکدا دەبینێتەوە، ئەم دابەشکاریەش پێویستە بۆ وەدیهاتنی ئیدراك و تێگەشتن، چوونکە غەزالی پێناسەی دەکات بەوەی کە(وەرگرتنی نمونەی حەقیقەتی شتەکانە، نەك حەقیقەتە دەرەکی و خاریجیەکەی بێت) [١٢٦].

---

[١٢٤] مجموعة الرسائل — الغزالي، طبعة دار الكتب العلمية بيروت ١٩٨٦.

[١٢٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٢٦] غەزالی دەڵێت: بزانە کە تێگەشتن و ئیدراك بریتیە لە وەرگرتنی وێنەی هەستپێکرا و، بەدەستەواژەیەکی تر ئیدراك بریتیە لە وەرگرتنی نمونەی حەقیقەت و راستەقینەیی شتێك نەك حەقیقەتە دەرەکیەکەی، چوونکە شێوازی دەرەکی لەبری دەرککراوەکە دانانیشێت بەڵکو نمونەیەکە لەو، ئەوەی کە بەراستی هەستپێدەکرێت ئەوەنیە کە لەدەرەوە هەیە، بەڵکو ئەوەیە کە لەهەستی دەرەکیدا نمونەکەی دەبینین. معارج القدس ل ٦١.

بەڵام لەبارەی پێنج هەستەکەوە غەزالی خۆی لەڕۆچوون بەناویاندا دەپارێزێت، چوونکە باسکردنی حەقیقەت و ڕاستیان زۆر دووورودرێژە [١٣٧]، بەڵام وەك هەنگاوی یەکەمە لەبنیاتنانی مەعریفەدا، واتە لەوەدیهێنانی ئیدراك و هەستدا.

بەڵام هێزە شاراوە و ناخیەکان غەزالی بەجۆرێك درێژە بەباسکردنیان دەدات کە یارمەتیدەر دەبێت بۆ تێگەشتن لە ئامێربوونی جەستە لەوکاتەی کە کرداری ئیدراکەکە ئەنجامدەدات، هەربۆیە غەزالی پێی وایە هێزە شاراوە و ناخیەکان لەپێنج هێز پێکهاتوون:

– خەیاڵی: کۆپی بوونی شێوەی بینراوە کە پێی دەگوترێت هەستی هاوبەش.

– حافیزە و ئۆرگان کە جێگەکەی بۆشایی یەکەمە لە پیشەوەی مێشك(بیرگە و ئۆرگانی وێنەکان).

– وەهمیەکان شوێنەکەشی کۆتایی بۆشایی ناوەڕاستی مێشکە کە مانا نەبینراوو هەستپێنەکراوەکان دەرك پێدەکات لە هەستپێکراوە ناسەرەکیەکان وەك دەرککردن و هەستکردن بەوەی کە منداڵ سۆزی بەرامبەر بەکار دەهێنرێت.

– بیرگە و زاکیرە کە بریتیە لە ئۆرگانی پاراستنی ئەم مانایانە شوێنی بۆشایی دواوەی مێشکە.

– هێزی بیرکەرەوە(المفکرة): شوێنەکەی ناوەڕاستی مێشکە کە لەنێوان کۆگای وێنەکان و کۆگای ماناکاندا ڕێکخراوە، ڕۆڵی پێکهێنان و وردەکاری دەبینێت بەپێی وویست توانای دانانی شتێکی نوێی نیە کە لەخەیاڵدا بوونی نەبێت مەگەر بە درێژە پێدان و پێکهێنان نەبێت [١٣٨].

---

[١٣٧] میزان العمل لا ١٩. کە لە کتێبی دا معارج القدسدا غەزالی لێکۆڵینەوەیەکی دووورودرێژی بۆ تەرخانکردووە.

[١٣٨] میزان العمل لا ١٩ – تێبینی گرنگی تەفسیری دەماری بکە بۆ هەست و ئیدراك، بەڵکو هێزە دەماری و ئەعصابیەکان هێزی بیرکردنەوەن و جیاوازن و شوێنەکەشیان ناوەڕاستی مێشکە.

ئەم درێژەدانە تایبەتە لەبارەی هێزە جەستەییە مەعریفیەکانەوە، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە غەزالی باوەڕی پێیەتی لە حەقیقەتی بەڵگەدا کە دەڵێت: پێشەکیەکان بنەمایەکی هەستی و ئەزموونیان هەیە، نەك فیتری و سروشتی، چوونکە خود ئەم هێزانە بەکار دەهێنێت وەك ئامێرگەلێك بۆ بەدەستهێنانی مەعریفە یەکەمینەکان کە بۆ پێکهێنەری ئەو پێشەکیانەن کە زانست پێویستی پێیانە و بەڵگەیان لەسەر وەستاوە و غەزالیش سورە لەسەر ئەوەی کە هێزگەلێکی جەستەیی پاڵفتە و تەواون، ئەمەش داننان و باوەڕبوونێکە کە هەموو جارێك دووبارە دەبنەوە کە جەستە کارایە لە کرداری ئیدراکدا، بەڵکو هێزی بیرکردنەوەی تێدایە کە لەشوێنەکانی تردا ناویناوە هێزی بیرکەرەوە کە جیاوازن لە هێزە خەیاڵیەکان.

هێزی بیرکەرەوە ئامێری عەقڵە، واتە مەرجی کارکردنی عەقڵە، هەر کێشە و خراپبوونێك لەمدا یان لەوانیتردا ڕوویدات کاری عەقڵ نەگونجاو دەکات، چوونکە خراپبوونی ئامێر دەبێتە هۆی خراپبوونی ئیدراك و هەست، نەك خراپبوونی عەقڵ، چوونکە عەقڵ یان خود لەسەر پێی خۆیان وەستاون و پێویستیان بە غەیری خۆیان نیە. تەندروستی فیزیۆلۆجی و سروشتەکەی مەرجێکی بنەڕەتیە بۆ دەرکەوتنی کاری ئیدراك. واتە جەستە مەرجێکی خودیە کە وا لەزانستدەکات بێتەدی، بەڵام ئەم مەرجە بەس نیە چوونکە هێزی بیرکەرەوە بۆ نمونە دەبێت(بەشێوەیەکی سروشتی کارێکی ڕێك یان نارێك بکات ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە نەفس و دەروون بەکاری بهێنێت بۆ هەر سیستەمێك کە ئەیەوێت، خۆ ئەگەر وانەبوایە ئەوا شتێکی سروشتی دەبوو، کاتێك پێویستە لەسەر مرۆڤ کە پیشەسازیە جیاوازەکان و نەخش و نیگارە سەر سوڕهێنەرەکان و هێڵە ڕێکخراوەکان فێر ببێت، بۆ ئەوەی لەسەر

کارێك رابێت وەك گیانلەبەرانی تر، ئەم هێزەیە کە نەفس و دەروون جارێك بەکاریدەهێنێت لە پێکهێنان و درێژە پێداندا بەپێی عەقڵی کرداری، وەجارێکیش بەپێی عەقڵی تیۆری بەکاریدەهێنێت، کە لەخودی خۆیدا پێکدەهێنێت و درێژە پێدەدات و هەست و دەرکیش ناکات [١٣٩].

هێزی بیرکەرەوە(شوێنەکەی ناوەڕاستی مێشکە هەروەك پاشایەك کە لەناوەڕاستی شانشینەکەیدا دانیشتووە، هێزی خەیاڵیش شوێنەکەی پێشەوەی مێشکە هەروەك پۆستەچی وایە چوونکە بریتیە لە کۆمەڵگەی هەواڵەکانی، حافیزە و ئۆرگانیش شوێنەکەی پشتەوەی مێشکە هەروە خزمەتکار وایە) [١٤٠]، بەلاّم هێزی گۆیا یان عەقلْ واتە نەفسی مرۆیی وەك پاشایەکی ڕاستەقینە وایە [١٤١]. وە هەروەها نەفس لەڕاستیدا هێزی عاقڵی ڕاستەقینەیە و هێزی بیرکردنەوە و هێزەکانی تری جەستە واتە مێشك تەنها خزمەتکارو ئامێرن بۆی، فیزیۆلۆجی بیرکردنەوە دیاری ناکات هەرچەندە وەك مەرجێکی پێویست وایە بۆی، هەروەك چۆن فیکر هیچ فیزیۆلۆجیەك دیاری ناکات. لەپشتەوەی کاری هێزەکانی جەستەوە هێزێکی گۆیا هەیە لەمرۆڤ و خوددا.

ئەم مەسەلەی کە غەزالی تێیدا ڕۆچووە، مەسەلەیەکی مەترسیدارە و پێگەیەکی گرنگی هەیە لەتیۆرەکانی مەعریفەدا بەگشتی، کە هەندێك لەفەیلەسوفان پێیانوایە لەسەر بنەماو بنەڕەتێکی مادی فیزیۆلۆجی ڕووت وەستاوە، بیرکردنەوەش تەنها

---

[١٣٩] معارج القدس لا ٤٧.

[١٤٠] میزان العمل لا ٢٥.

[١٤١] میزان العمل لا ٢٥.

ڕژێنێکە لەڕژێنەکانی مێشك [١٤٢]. بەلاّم زانایانی دەماری هاوچەرخ ئەمڕۆکە پێچەوانەی ئەمەیان سەلماندووە، سیر چارلز شرنگتون کە(بە دامەزرێنەری فیسیۆلۆجیای ئەعصاب و دەماری نویٚ دادەنرێت) دەڵێت: : بەمشێوەیە جیاوازیەکی بنەڕەتی لەنێوان ژیان و عەقڵدا دروستبوو، ژیان مەسەلەیەکی کیمیایی و فیزیاییە بەلاّم عەقلٚ سەرپێچی لەکیمیاو فیزیا دەکات [١٤٣]، واتە(یەکبوونی ئەزمونی هۆشیار خودی عەقڵی هۆشیار فەراهەمی دەکات نەك شێوازو ئامێری ئەعصاب و دەمار) [١٤٤]، لەهەمان مەزهەبدا برگسون دانبەوەدا دەنێت کە(مێشك

---

[١٤٢] هیکسلی پەیوەندی نێوان عەقلٚ و جەستە پێناسە دەکات و دەڵێت: ( وانیارە هۆشیاری پەیوەستە بەئامێرەکانی جەستەوە وەك دەرئەنجامێکی پلەدوو بۆ کاری جەستە و هیچی تر، وە هیچ هێزێکی نیە لە ڕاستکردنەوەی کاری جەستەدا هەروەك بوقی هەڵمی لەکاتی ڕۆشتنی شەمەندەفەردا، بەبیٚ ئەوەی کە کاریگەری لەسەر ئامێرەکانی هەبێت) وە هەروەها ناوبراو دریژەی پێدەدات و دەڵێت( بەمشێوەیە زانستی ئەرکی ئەندامەکان لەداهاتوودا یەك لەدوای یەك فراوانتر دەبێت لەجیهانی مادە و یاساکانی تاوەکو وایلێدێت لەدرێژ بوونیدا یەکساندەبێت لەگەلٚ ڕووبەری مەعریفە و شیعر و کرداردا، باشترین ڕێگە بۆ لێکۆڵینەوە لەعەقلٚ لەگۆشە نیگای تێڕوانینی کۆنەوە( مادی) بریتیە لە دەرخستنی چۆنیەتی هەڵقولاّنی لەمادەوە). العلم فی منظوره الجدید – ترجمة د کمال خلایلی.

[١٤٣] هەمان سەرچاوە لا ٢٦.

[١٤٤] هەمان سەرچاوە لا ٤٢ بۆ ٤٣. بنفیلدی زانای دەمار دەڵێت: ( شتێکی لۆژیکەوە کە بلێین عەقلٚ گەوهەرو ناوەڕۆکێکی جیاوازە لەجەستە) خاوەنی لێکۆڵینەوەکەش دەڵێت: شتێکی گاڵتەجاڕیە کە بنفیلد باسەکانی بە ئامانجی سەلماندنی پێچەوانەی ئەمەوە دەستپێکردووە، دەڵێت: بەدرێژایی ژیانی زانستیم وەك زاناکانی تر هەوڵمداوە ئەوە بسەلمێنم کە مێشك ڕاڤەی عەقلٚ دەکات، بەلاّم لەم دواییانەدا بەڵگەکان وایان لێکردم کە دان بنێم بەوەی کە عەقلٚ و ئیرادەی مرۆڤ دوو حەقیقەت و ڕاستی نامادین. بانفلید دەڵێت: چەندە مەسەلەیکی سەیرە کە ئەوە ئاشکرا بکەین کە جیهان دەتوانێت باوەڕی بەڕاستیەتی و بوونی ڕۆح هەبێت. ئەگەر عەقلٚ و ئیرادە نامادی بن ئەوا بێگومان ئەم دو مەلیکەیە هەروەك نکلس دەڵێت بەمردنی مرۆڤ ملکەچناکەن بۆ توانەوە و لەناوچوونەی کە بەسەر جەستەو مێشکدا دێت.

فیکر دیاری ناکات، بەڵکو فیکر بەلایەنی کەمەوە لەبەشێکی گەورەدا سەربەخۆیە لەمێشك)[١٤٥].

## ب – ڕۆڵی خود(الذات)

ئەگەر خود خۆی بۆخۆی بریتیی بێت لە هۆشیاری، ئەوکات هۆشیاریەکەی سەربەخۆیە لەجیهان، چوونکە پێویستی بەنێوەندگیر نیە بۆ سەلماندنی خۆی و ئیدراك و هەستکردن بەحەقیقەتەکەی لەنێوان خۆیی و هۆشیاریەکەیدا [١٤٦]. بەلاّم ئەم هۆشیاریە بە شێوەیەکی خۆپەرستانە بەسەر خۆیدا داخراو نیە کە نەهێڵێت پەیوەندی دروستبکات. ئەم هۆشیاریە بەڕووی جیهاندا کرایەوە، چوونکە ئەیەوێت بەرزببێتەوە بۆ ئەویتر(واتە جیهان) وەدی بهێنێت، چوونکە هۆشیاری لەبارەی خودەوە تەنها هەنگاوێکی سەرەتایە کە وەك مەرجی وەدیهاتنی هەنگاوەکانی ترە، بەمشێوەیە خود بەردەوام داوای ئەویتر دەکات(واتە جیهان) بۆ ئەوەی هۆشیاریەکەی زیاتر قوڵ ببێتەوە، چوونکە هۆشیاری لەبارەی جیهانەوە پلەیەکی پێویستە کە خود داخوازی دەکات، چوونکە تەنها لەڕێگەی ئەوەوە کامڵبوونی خۆی دەزانێت، مەبەستم ناسینی خودایە(هەرکەسێك خۆی بناسێت خوداکەشی دەناسێت) کە بەرزترین و بەڕێزترینی مەعریفەکان.

کاتێك بۆمان ڕوونبوویەوە کە جەستە ڕۆڵی هەیە لەبنیاتنانی مەعریفە و زانستدا و ڕۆڵەکەشی خۆی بۆخۆی ناتوانێت بوەستێت، بەڵکو پێویستی بەهێزی عەقڵ هەیە بۆ ئەوەی هێزەکانی جەستە بکاتە هێزگەلێکی کارای ڕاستەقینە، کاتێك ئەوەی

---

[١٤٥] برگسون( الطاقة الروحية) ترجمة الى العربية سامي الدروبي الطبعة ٢ ١٩٦٢.

[١٤٦] سەیری بەشی یەکەم بکە لەبارەی حەقیقەتی نەفس و دەروون و بوونیەوە( وجود).

ڕوونبوویەوە کە جەستە خاڵیە لەهەموو مەعریفەیەك پێش ئەوەی پەیوەندیبکات بە لاشەو بەدەنەوە [١٤٧] کاتێك دەرك و هەستمان بەمە کرد، ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەوە دەزانین کە مرۆڤ لەڕێگەی یەکەیەکەوە کە ناکرێت لێی دوور بکەوێتەوە زانست دروستدەکات، مەبەستیشم پێی یەکبوونی نەفس و دەروون و جەستەیە، واتە هەر باسێك لەبارەی نەفس یان جەستەوە بکرێت دەبێت بێتە ناو ئەم یەکەیەوە، چوونکە مرۆڤی زیندوو ئاقڵ هەمان ئەم یەکەیەیە، واتە باسکردن لەبارەی نەفس و دەروونەوە کاتێك لەجەستە جیادەبێتەوە، تەنها قسەیەکی پرۆگرامیە و حەقیقی و ڕاستەقینە نیە، ئەگەر باوەڕیشمان وابوو کە ڕاستەقینەیە، ئەوا ئەم باوەڕەمان مانای ئەوەیە کە خراپ لەسروشتی مرۆڤ تێگەشتووین کە مرۆڤێکی ئاقڵە.

نەفس و دەروونی مرۆڤ دوو هێزی هەیە: یەکەمیان هێزی زانابوونە، دووەمیشیان: هێزی کارابوونە، بەهەردووکیان دەگوترێت عەقڵ لەسەر شێوازی هاوبەش. عەقڵی تیۆری وێنای شتە مەعقول و حەقیقەتەکان دەکات، عەقڵی کرداریش خزمەتیدەکات و بەفەرمانەکانی دەجوڵێتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە

---

[١٤٧] غەزالی لە مەعریفە عەقڵیەکان بەشی چوارەم لەسیفەتی قسە کردندا لا ٦٥ دەڵێت: نەفس و دەروونی مرۆڤ گەوهەرێکی زیندووی زانای کارای دەرککەرە، ئەم گەوهەرەش لەسەرەتای سروشت و فیترەت و یەکەم پێشوازیکردن لەپارچە گۆشتەکە( المضغة) گەوهەرێکی پێگەشتووی وێنا نەکراوە و توانای وەرگرتنی وێنەکان و فێربوونی زانستی هەیە چوونکە هیچ نەخش و نیگارێکی لەخێر شەڕ و زانایی و نەزانی تێدا نیە. کاتێك نەفس پەیوەستبوو بەلاشەو بەدەنەوە بەجۆرێك لەپەیوەستبوونەکان... وەئەگەر لەسەرەتای سروشت و فیترەتەوە پێشوازی لە نەفس و دەروونکرد، یەکەم شتەکان مانای شتە عەقلگرەکان قبوڵناکەن و وەریان ناگرن، هێزی ئەوەیان نیە کە هەستپێکراوەکان بزانن، هیچ وێنەیەکیش لە زانستە سەرەتاییەکانیان تێدا نیە....ئەم شتانە بەکەمترین بیرکردنەوە و تێڕوانین نەفس بەدەستیاندەهێنێت کاتێك کورپەلەکە بەرەو ئەوە چوو کە ببێتە منداڵ هەندێك لەهەستەکانی بەهێز دەبن و دەرك بەهەموو هەستەوەرەکانی هەستپێکراوەکانی خۆی دەکات، دواتریش نەفس شتە فیتریەکان فێر دەبێت و دەبێتە غەریزی و دواتر دەچێت بۆ گەنجیەتی، لەمکاتەدا نەفس و دەروون دەتوانێت هەندێك لەعەقلگرەکانی بەدەست بهێنێت.

عەقڵی کرداری ڕوودەکاتە لاشە و بەدەن، چوونکە دەستپێکی جوڵەکەی بۆ لای کردارە دیاریکراوە ناسەرەکی و لقیەکانی(الجزئیە) تایبەت بە فیکرو تێڕوانینەکانە، بەپێی پێویستی هێزی زانای تیۆری، لەبەرزبوونەوەی عەقڵ – خود – نەفس و دەروون – بەشێوەیەکی مەعریفی قۆناغ و پلەگەلێکی زۆرو بەپێی قوڵی و بەهێزی تێڕوانین و بەپێی ئامادەباشی شتە عەقڵگرە بەدەستهاتووەکان بەلای ئەوەوە دەزانرێن، ئەو هەرلەسەرەتاوە عەقڵێکی(بالقوە) یە واتە ناکردارە، هەروەك عەقڵ و ژیری لەمنداڵی ساوادا، کە عەقڵێکە وەك مەلەکە وایە لەکاتی وەدیهاتنی شتە ئەوەلیە پێویستەکان، وەك حاڵی تایبەتی منداڵ کاتێك بەرەو مێرد منداڵی و باڵغبوون دەچێت کە عەقڵێکی کرداریە لەکاتی وەدیهاتنی شتە عەقڵگرە بەدەستهاتووەکاندا کە هەموویان بەکردارن، هەموویان لەلای ئەو کۆگاکراون و هەڵگیراون، هەروەك ئەو نوسەرە زیرەك و ووردە وایە کە بێئاگایە لەنوسین.

ئەو لەم پلەیەی کۆتاییدا لەنێو چەندین ڕێکسازی جۆراو جۆرو پلەگەلێکی بێشوماردا گۆڕانی بەسەردا دێت، کە بەهۆی زۆری و کەمی و ڕێزو بێ ڕێزی زانیاریەکان و ڕێگەی بەدەستهێنانەوە ئایا بەخششی خودان یان بەدەستهێنراون دەگۆڕێت [١٤٨].

کاتێك مەعریفە و زانیاری بەمشێوەیەو بەپێی ئەم پلە و قۆناغانە بەدەستبێن، ئەوا بەدیهاتنیان لەسەر کۆمەڵێك هێزی جەستەیی و عەقڵی وەستاوە کە لە چنین و دروستکردنەکەیدا چیرۆکی مەعریفە و ژیان دروستدەکات، چوونکە عەقڵی تیۆری بریتیە لەسەرۆك و عەقڵی کرداریش وەزیرەکەیەتی کە ئەرکی بەڕێوەبردنی لاشەو بەدەنی لەئەستۆدایە، چوونکە لاشە و بەدەن ئامێری نەفس و دەروونە، ئەمەش ڕوونکردنەوەکەیەتی:

---

[١٤٨] میزان العمل لا ٢١.


خودا
عەقڵی تیۆری
عەقڵی کرداری
جەستە
نەفس و دەروونی حەیوانی
هێزی جوڵێنەر
هێزی هەستیار
دەستپێوەدانی هێزە بەدیهێنەرەکان لە دەمارەدا (الاعصاب)
بەدیهێنەری هێزە ئەزمەیی و شەوانیەکان
تووڕەیی زاڵبوون
ئارەزوو لەزەت
دیاردەی هەستەکان
ناخ(باطن)
(هێزی خەیاڵی) هەستی هاوبەش
(هێزی خەیاڵکەرەوە)
هێزی پەرەکی
خۆراک پێدەر (دوو خزمەتکار)
پەروەردەیار
بەرهەمهێنەر (سەر)
پاڵنەر: ئەوە کۆتا پلەی هێزەکانە لە جەستەدا
هەرسکەر
بگر
ڕاکێشەر

کەوابوو ئەم ئامێرە جەستەییە کارانابێت مەگەر لەژێر فەرمانڕەوایی عەقڵدا نەبێت، عەقڵ ناتوانێت زانست بنیات بنێت مەگەر لەگەڵ جەستەدا نەبێت، ناشتوانێت بچێتە پەیوەندیەوە لەگەڵ جیهاندا مەگەر لەگەڵ ناوبراوو بەهاوکاری ئەو نەبێت(جەستە)، کەوابوو ئەو واتە جەستە ئامێرێکە. ئامێریش پێویستی بە هۆکارێکی ڕێکخستن و یەکبوون و سیاسەت هەیە، هەربۆیە غەزالی بانگەشەی پێویستی بیرکردنەوە لەئامێری جەستە دەکات، هانی توێکاری جەستەکان دەدات کە ڕێگەیەکە بۆ ئاقڵەکان کە لەڕێگەیەوە هەستدەکەن بەدروستکراوەکانی خوداو لێیان تێدەگەن، ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات و خوداش بەگەورەتر دەگرن، (وفي الأرض ايات للموقنين وفي انفسكم افلا تبصرون) [١٤٩] واتە: لەسەر زەویدا ئایەت و بەڵگە و نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی کە دڵنیاییان دەوێت، ئایا بەچاوی بەصیرەت و بیناییەوە بۆچی سەیری نەفس و دەروونی خۆتان ناکەن.

کاتێك عەقڵ لە بنیاتنانی زانستدا جەستە بەکار دەهێنێت ئەوا ئەو مەعریفانەی کە پێیاندەگات بەیەقینی و دڵنیایی دەمێننەوە و شك و گومان ناتوانێت گرفت بۆ دڵنیایی و یەقینمان لەبەرامبەریانەوە دروستبکات، بەو مەرجە مەرجەکانی بەڵگە هەبن و ئاستی تێڕوانینەکان تێکەڵ بەیەکتری نەکرێن، هەربۆیە دەبینین غەزالی باوەڕی بە ڕاستیەتی ماتماتیك و مەنتیق و زانستە سروشتیەکان هەیە، بەڵام بەمەرجی داناوە کە دەبێت ئەم زانستانە لەزانستی ئیلاهیەوە بەدووربن واتە ئەگەر لەبەر خودی خۆیان داواکران، چوونکە عەقڵ ئامێری تێگەشتن و دەرککردنە، دەرککردنیش دەبێت شوێنی پێشەکیەکانی بەڵگە بکەوێت کە جەستە هەوڵیداوە

---

[١٤٩] س الذاريات ئا ٢٠ – ٢١ کە غەزالی لەميزان العمل لا ٢٦ هێناویەتی.

پێشکەشیان بکات، چوونکە عەقڵ لەڕاستیدا وەك لاپەڕەیەکی سپی وایە هیچ زانستێکی تیدا نیە، بەلاَم ئامادەباشە بۆ قبوڵکردنی زانست.

ئەم ئاستە زانستیەی کە عەقڵ توانیویەتی وەدی بهێنێت، بەردەوام وەك پارێزەرێکی یەقین و دڵنیاییەکەی دەمێنێتەوە مادەم پارێزگاری لەمەرجەکانی بەڵگە بکات، واتە تێپەڕکردنی بۆ جیهانی هەست یان بابەت و مەسەلەکانی زانست دەیخاتە حاڵەتێکی دوودڵیەوە کە قورسە ڕووبەڕوویان ببێتەوە، خودی ئاقڵ والیدەکات کە بکەوێتە گەڕەلاوژێوە، هەروەك فەیلەسوفەکان پێشتر تێی کەوتوون، کاتێك زانستە دانراوو زانستە میتافیزیکیە کانیان خستووەتە ناو یەك چوارچێوەوە، کە بریتیە لە چوار چێوەی عەقڵ، واتە لەگەڵ ئەوەی کە عەقڵ ئامێرێکی بنیاتنانە بۆ زانست، بەلاَم غەزالی پێیوایە کە لەپشتەوەی ئەو عەقڵەدا شتێکی تر هەیە کە ئەم عەقڵە ناتوانێت بیزانێت و دەرکی پێبکات، چوونکە لەنێو لاشە و جەستەدا کۆتکراوە و بەستراوەتەوە، هەڵەی فەیلەسوفەکانیش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئەم عەقڵەیان لەئاراستەی خۆی لاداوە بەرەو ئاراستەی میتافیزیك کە هی خۆی نیە، بەلاَم ئەمەش مانای ئەوەنیە کە عەقڵ دوورە لەم جیهانە غەیبی و نادیارەوە.

غەزالی بەئاشکرا و ڕاشکاوانە دەڵێت: کە عەقڵ نمونەیەکە لەڕووناکی خودای گەورە [١٥٠] کە هەست بەخۆی دەکات و هەستیش بە غەیری خۆی دەکات، هەست بەسیفەتەکانی خۆی دەکات و لەعەرش و کورسیەکەی و لەپشتەوەی پەردەی ئاسمانەکان و لە مەلەئی ئەعلادا و لە مەلەکوتی ئاسمان و زەویدا کارایە، هەروەك چۆن کارایە لە دەستوەردان لەجیهانە تایبەتەکەی و مەملەکەتە نزیکەکەی، واتە جەستە و لاشە تایبەتەکەی، بەڵکو هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکان لەعەقڵ شاراوە

---

[١٥٠] مشكاة الانوار لا ١٢٣.

نین [١٥١]. چوونکە هەموو بوونەوەران بواری عەقڵن، هەربۆیە هەست بەو بوونەوەرانەدەکات کە ژماردنمان و ئەوانەشی کە نەمان ژماردن. دەستێوەردان دەکات لەهەموویاندا و حوکمێکی یەقینی ڕاستیان بەسەردا دەدات، نهێنیە شاراوە و ناخیەکان و مانا نادیارەکان بەلای ئەوەوە دیارو ئاشکران [١٥٢]. وادیارە کە تێگەشتنمان بۆ حەقیقەت و ڕاستیەتی عەقڵ لەلای غەزالی کە لەبەشی سێیەم و چوارەمیشدا لەبارەی نرخ و بەهای عەقڵەوە باسیدەکەین، بەڵام لەم ئاستە لەتێڕوانین تەنها ئەوە دەڵێین کە زانست لەلای ئیمامی غەزالی یەقینی و دڵنیاییەو هیچ شك و گومانێکی تێکەڵ نیە، هەروەك لە مونقیزدا باسیدەکات(زەروریەت و پێویستیە عەقلّیەکانم گێڕایەوە کە قبوڵکراوو متمانە پێکراون بەشێوەیەکی بێخەم و دڵنیا) [١٥٣] بەو مەرجەی تێوە نەگلێت لە باسکردنی ئیلاهیات و هەموو ئەو شتانەی کە جەستە ناتوانێت ڕۆڵیان تێدا بگێڕێت، چوونکە هەرشتێك کە جەستە ڕۆڵی نیە تێیاندا نە وێنا دەکرێت و نە هەستیشی پێدەکرێت.

وادیارە کە خود کارایە لەجەستەدا و دامەزرێنەری زانستیشە، ئەم دامەزراندنەش لەدیاردەکانی ئەو کارایی و کردارەن، هەرچەندە پێشتر باسی ئەوەمانکرد کە زانستی یەقینیە و ڕوودانی هەڵە واقیعێکە و ناتوانین خۆمانی لێ لابدەین، غەزالی بەشێوەیەکی زیرەکانە باسی ئەم گریمانی هەڵەیەی کردووە کە لەوانەیە هەڵە لەزانستی یەقینیدا ڕووبدات و ڕاڤەیەکیشی بۆ کردووە کە کورتەکەی بریتیە لەوەی کە(هەڵەی ئاقڵەکان هۆکارەکەی خەیاڵات و وەهمەکان و ئەو بیروباوەڕانەیە کە هێزەکانی جەستە ئاشکرایان دەکەن بۆ ئەوەی مەعریفە

---

[١٥١] مشكاة الانوار لا ١٢٣.

[١٥٢] مشكاه الانوار لا ١٢٥.

[١٥٣] المنقذ من الضلال لا ٨٦.

پێکبهێنن بەپێی شوێن پەنجەکانی، بێگومان کە هێزەکانی جەستە لەمەدا کاریگەریان هەیە، هەربۆیە غەزالی عەقڵی کرداری کردووەتە ڕێکخەری کاروبارەکانی هێزەکانی جەستە، غەزالی دەڵێت: : (پێویستە کە هێزەکانی تری جەستە سەرکوت بکرێن و ببەزێنرێن، بەبێ ئەم هێزە کرداریە، کاتێك ئەو هێزانە بەزێنران شێوەگەلێکی ملکەچانەی ئارەزوویان تێدا دروستدەبێت، بەم شێوازانەش دەگووترێت ڕەوشتە پەستەکان [١٥٤]، واتە عەقڵ داوای ڕووتبوونەوە دەکات لەپەردەی وەهم و خەیاڵ بۆ ئەوەی بتوانێت شتەکان وەك خۆیان ببینێت [١٥٥]، ئەم قسەیەش وامان لێدەکات کە باسی مەرجە نەفسیەپێویستیەکان بکەین بۆ وەدیهاتنی زانست، چوونکە مەرجە خودیەکان هەرچەندە بنەڕەتی بن و پەیوەستبن بەکرداری ئیدارك و هەست و وەدیهاتنی زانستەوە، ئەوا مەرجە نەفسی و دەروونیەکانن کە گرنتی بەدیهاتنی یەقین و دڵنیایی دەدەن، زۆرێك لە بەتاڵ و ناڕاست وەك ڕاست و یەقین دەرکەوتووە، زۆرێك لەحەق و ڕاستیش بووە بەژێر پەردەی بەتاڵەوە و داپۆشیوە.

## ٤ – مەرجە دەروونیەکانی بەدیهاتنی زانست:

بێگومان هێزە جەستەییەکان گرنگی خۆیانیان هەیە لەبەدیهاتنی زانستدا، بەڵام ئەم هێزانە هەروەك پێشتر ڕوونمانکردەوە [١٥٦]، لەناخیدا هێزگەلێکی جوڵێنەر و هەستپێکەر پێکەوە دەژین، ئەم پێکەوە ژیانەش کاریگەرە لەسروشتی یەقیندا کە

---

[١٥٤] میزان العمل لا ٢٠.

[١٥٥] مشکاه الانوار لا ١٢٧.

[١٥٦] بگەڕێرەوەو سەیری مەرجە خودیەکانی وەدیهاتنی زانست بکە.

لەكۆتاييدا دەگەينەلای، ئەگەر هێزەكان كامڵبن و كردارەكانیشی تەواوبن دەرئەنجامەكەی بەشێوەيەكی جۆری جياواز دەبێت لە ئەنجامەكانی ئەگەر كەموكورتی يان بێسەروبەريەكی تێدا بێت، هەربۆيە جياوازی هەيە لەنێوان هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی مەعريفە، كە خۆی لەباسی سروشتی ئيدراك و هەست هێزەكەی و هەوڵدان بۆ وەديهاتنی مەرجەكانی مەعريفەدا دەبينێتەوە.(كاريگەری كاركردن بۆ لابردنی ئەوەی كە پێويست نيە و هەوڵدان بۆ زانست كە هەوڵێكە بۆ بەدستهێنانی ئەوەی كە پێويستە و لابردنی ئەوەی كە پێويست نيە، مەرجە بۆچۆڵكردنی شوێنەكە بۆ ئەوەی كە پێويستەشوێنی بگرێتەوە) [١٥٧]. غەزاليش كارو كردار پێناسە دەكات و دەڵێت: (مانای كردار بريتيە لە شكاندنی هەواو ئارەزوو بەچاوپۆشی لە ڕۆشتنی بەرەو لايەكی بالاّ بۆ ئەوەی شێوازە پيسەكان و ئەو شتە زيادە و خراپانەی كە بەلا پەست و خراپەكەی تريەوە لكاون بسڕێتەوە) [١٥٨].

جەستە بەم مانايە دەبێت ببێتە شوێنی پاككردنەوە، پێش ئەوەی ئامادە بێت بۆ چوونە ناو پەيڕەو كردنی باس و عەقڵگريەوە، ئەمەش نايەتەدی مەگەر ئەوكاتە نەبێت كە جەستە ملكەچبكات بۆ فەرمانەكانی عەقڵی كرداری كە فەرمانەكان لە عەقڵی تيۆريەوە وەر دەگرێت، چوونكە جەستە سەرچاوەی هەواوو ئارەزووەكانە، ئارەزووەكانيش لەهێزە بەديهێنەرەكانەوە سەرچاوەيانگرتووە، وە هەروەها هۆكارێكی ڕاستەوخۆيشە بۆ جوڵەی جەستە بەرەو لەزەت و خۆشی، مەگەر ئەو كاتە نەبێت كە ڕاهێنانی ئەم هێزە بەهۆی ئەو ڕاسپاردانەوە بێت كە لە عەقڵی كرداری بەرپرس لە سياسەتی جەستەوە بێت، هەروەك چۆن جەستەش سەرچاوەی

---

[١٥٧] ميزان العمل لا ٢٧.

[١٥٨] ميزان العمل لا ٢٨.

هێزەكانی وەهم و خەیاڵە كە هێزانێكی كاراو بەشدارن لە كرداری هەستپێكردندا، ئەگەر ئەم هێزانە ملیان بۆ پلان و فەرمانەكانی عەقڵ كەچ نەكرد، ئەوكات عەقڵ دەكەوێتە هەڵەوە و ڕێگەكانی لێ تێكدەچن و توانای هەستكردن و ئاشكراكردن و دۆزینەوەی یەقینی نامێنێت.

وە هەروەها پێویستە لەسەر عەقڵ كە خۆی لەپەردەی وەهم و خەیاڵ دابڕنێت، بۆ ئەوەی شتەكان وەك خۆی ببینێت [١٥٩].

غەزالی هەواوئارەزووی چواندووە بە بەندەی خراپ و فێڵبازو خەڵەتێنەرو پیسەوە كە توانای ئەوەی هەیە خۆی لەسەر شێوەی ئامۆژگاریكار نیشانبدات و لەژێر پەردەی ئامۆژگاریەكەیدا حەزكردن لەپلە و پایە و كێبەركێی وەزیری هەبێت، واتە ئەو هێزە عەقڵیەی كە كاروبارەكان ڕێكدەخات بۆ ئەوەی بۆ تەنها یەك كاتژمێریش بێئاگا نەبێت لە كێبەركێی و دژایەتیكردنی لە بۆچوونەكانیدا [١٦٠].

وادیارە غەزالی لەم چوارچێوەیەدا بەتەواوەتی هەست بەوە دەكات كە كاری تێكۆشان(المجاهده) دووماناو دەلالەتی هەیە: یەكەمیان ئەوەیە كە جەستە و عەقڵ ئامادەباشی و كاراییان هەیە. دووەمیش: كارایی جەستە ئەگەر دەستبگرێت بەسەر كارایی عەقڵدا، ئەوكات عەقڵ خراپ دەكات و یەقینەكەی كەمدەبێتەوە و خوداو ئیلاهی دەبێتە هەواوو ئارەزووەكانی، وەئەگەر كارایی عەقڵ زاڵبێت و دەستبگرێت بەسەر كارایی جەستەدا، ئەوكات نەفس و دەروون پاكدەبێتەوە و كۆتدەكرێت و پەردەكەی بۆ لادەبرێت(فكشفنا عنك غطائك فبصرك اليوم حديد) [١٦١]، واتە: پەردەكەمان لەبەردەمت لابرد، ئەمڕۆكە چاوەكانت زۆر تیژبینن. تێكۆشانی دەروون

---

[١٥٩] مشكاه الانوار لا ١٢٧.

[١٦٠] ميزان العمل لا ٤٠.

[١٦١] س ق ئا ٢٢.

هێندە پەیڕەوکردنێکی ئەخلاقی و ڕەوشتی نیە لەناخ و گەوهەریدا بەو ئەندازەیەی کە پەیڕەوکردنێکی مەعریفیە کە ئەیەوێت ئامێرەکانی هەست و ئیدراکی جەستەیی و عەقڵی لەحاڵەتی ڕێکوپێکی و گونجاویدا بن، هەموو هێزێك خزمەتکارو خزمەتکراوە لەنێو پەیوەندیەکدا کە لەیەکتر جیا نابێتەوە، وەهەروەها ئەم کارە شتێکی پێویستە بۆ بنیاتنانی زانست، غەزالیش نەیویستووە تەنها مەرجە خودیەکان باسبکات چوونکە بەس نین بۆ ئەوکارە ئەگەر بێت و دەروون خۆی ئامادەباشی تێدا نەبێت بۆ پەیڕەویکردنی کرداری فێربوون، بەڵکو عەقڵ چەندین پەردە لەبەر دەمیدا هەن کە کەوتوونەتە نێوان ئەم و هەست و عەقڵگریەکەیدا، غەزالیش ئەم پەردەیەی لە کتێبەکەیدا(مشكاة الانوار) لابرد و چەندین جۆر پەردەی تری ئاشکرا کرد، هەندێکیان بەتەواوەتی لەژێر تاریکیدا شاراونەتەوە کە دەکاتە مولحید و ملەجەڕێ کارانی خودا کە گوێڕایەڵی نەفس و دەروونی خۆیانن، هیچ تاریکیەکیش توندتر نیە لەتاریکی هەواوو ئارەزوو نەفس و دەروونی مرۆڤ.

هەندێکیش هەن کە داپۆشراون بە ڕووناکیەکی هاوشان لەگەڵ تاریکیدا، ئەمانەش سێ بەشن، بەشێکیان سەرچاوەی تاریکیەکەیان لەهەستەوەیە، بەشێکیشیان سەرچاوەی تاریکیەکەیان لەخەیاڵەوەیە، بەشی سێیەمیش سەرچاوەی تاریکیەکەیان لەپێوانە خراپ و ناپەسەندە عەقڵیەکانەوەیە [١٦٢]. گرنگیدان بەلایەنی دەروونی ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە ڕێگەی هەست و ئیدراك لەسەر تێکۆشان وەستاوە بۆ سڕینەوەی سیفەتە خراپەکان و بڕینی شتە لکاوو هەڵواسراوەکان پێیەوە و چوونە بەرەو خودا بە هیممەتێکی بەرزو گەورەوە، هەرکە ئەم چوونە ڕوویدا ڕەحمەتی خودا بەسەر بەندەدا دەڕژێت و نهێنی مەلەکوت و

---

[١٦٢] مشكات الانوار لا ١٧٧– ١٧٨ – ١٧٩ – ١٨٠ – ١٨١ – ١٨٢ – ١٨٣.

حەقیقەتەکانی بۆ ئاشکرا دەبێت، ئەمیش تەنها ئەوەی لەسەرە کە پاڵفتەیەکی ڕووتیان بکات و نیەت و ئیرادەی ڕاستگۆیانە و تینویەتی تەواوی بۆ ئەو مەسەلەیە تێدا بێت[١٦٣].

دوو ڕێگەشمان هەیە بۆ بەدەستهێنانی: یەکێکیان بەدەستهێنانی خودی ئەو ڕۆڵەیە کە دەیبینێت، دووەمیشیان ئامادەباشیە بۆ وەرگرتن و قبوڵکردنی ڕۆڵ و دەورەکەیە لەدەرەوە، ڕاستترو باشتر لەم دوو ڕێگەیەدا ئەوەیە کە هەردووکیان بەیەکەوە ئەنجامبدرێن، چوونکە ئامادەباشی مەرجێکە کە مرۆڤ بێنیاز نیە لێی و وەرگرتنی شتە مەعقولەکانیش مەرجێکی ترە کە مرۆڤ پێویستی بەویش دەبێت، کەواتە مەعریفەی تەواو لەلایەك تەنها بەزانست و بەدەستهێنان نەبێت نایەتەدی لەلایەکی تریشەوە بە دۆزینەوە و ئاشکرا کردن. غەزالی لەم بوارەدا تاکەکەسی سەردەمەکەی خۆی نەبووە کە ئەم کارەی کردبێت، چوونکە نیشانەکانی ئەم جۆرە تێڕوانین و ئاراستەیە لەلای فەیلەسوفە موسوڵمان و ئیغریقیەکانی تریش دەبینین، سوقرات دەڵێت: (نەفس و دەروون باشترین بیرکردنەوەی هەیە کاتێك کە بێگەردیەکەی لەلایەن بیستن و بینین و ئێش و خۆشی و لەزەتەوە لەکەدار نەبێت، بەڵکو پێویستە خۆی بۆ گەشتن بە تێگەشتنێکی دروست لە واقیع یەکلایی بکاتەوە و بەپێی توانا خۆی هەموو تێکەڵی و کارو کردار و پەیوەندیەکی هەوڵدان بێت بۆ ئیدراك و تێگەشتن لەواقیع[١٦٤].

بەڵام تێڕوانینی ئەفلاتون ئەیەوێت بەپێی توانا جەستە هەڵبوەشێنێتەوە، ئەمە لەکاتێکدایە کە غەزالی ئەیەوێت لەسەر جەستە بمێنێتەوە، چوونکە ئامێرێکی

---

[١٦٣] میزان العمل لا ٣١.

[١٦٤] الفیدون – افلاتون لا ٦٤ – ٦٦.

پێویستە بۆی بەپێی ئەوەی کە لەژێر دەسەلاّتی عەقڵدایە، ئەگەرهاتوو هەڵگەڕایەوە و لەژێر فەرمانی عەقڵ دەرچوو، ئەوکات پاککردنەوەی دەبێتە مەرجێکی بنەڕەتی، غەزالیش گرنگیەکی زۆریداوە بە چۆنیەتی ئەو پاککردنەوەیە ئیتر لە ڕووی باسکردنی ئاستی جێبەجێکردنیەوە بێت، واتە غەزالی دەرکی بەپێویستی چارەسەرکردنی ئەم مەسەلانە داوە بەشێوەیەکی ئەزموونی کە نزیکبێت لەبیرو زەینەکانەوە و نەفس و دەروونە ئاسایی و ئاقڵەکان لێی تێبگەن، هەروەك بڵێی کردارێکی شیکاری دەروونی پەیڕەودەکات بۆ مەسەلەی هەڵسووکەوتەکان، لەم ئاستەی شیکاریشدا دەتوانین بڵێین کە شیکاریەکی نەفسی بۆ خود و جەستە شتێکی پێویستە کە لەپێش کرداری دامەزراندنی زانستەوە بکرێت. پێویستە مرۆڤ پاك ببێتەوە لە مەعریفە خراپ و هەڵسوو کەوتە لادرەکان، وە پێویستە ڕاستبوونەوەیەکی پێویستی تێدا ڕوویدات بۆ پەیڕەو کردنی کرداری عەقڵگری و هەستکردن، غەزالیش ئەم کردارەی چواندووە بەچەندین شت، لەیەکێکیاندا دەڵێت: (ئەگەر ماڵێك لەبەرچاو بگرین کە بۆ پاشایەك بنیاتنراوە کە شیاوبێت بە پلەی پاشا بۆ مانەوەی ناوبراو تێیدا، بەلاّم مەیمون و بەراز داگیریانکردبێت، ئەوکات جوانی و کامڵی ئەم ماڵە لەسەر دووشت وەستاوە: یەکەمیان بێزارکەری مەیمون و بەرازەکانی ناویەتی، دووەمیشیان: ژیانی کەسە شیاوەکەیە تێیدا(کە پاشایە) [١٦٥].

خانوەکە بریتیە لە دەروون، لەبەشەکانی پێشوودا ڕوونمانکردەوە کە بنیاتی غەزالی لەسەر شێوازێکی فەلسەفی ڕەخنەیی بنیاتنانی وەستاوە.

ڕەخنەش لەلای غەزالی وەرگرتنی هەردوو ڕووەکەیە: ڕوویەکی زاڵ بەسەر مەعریفەی فەیلەسوفە یەکەمینەکاندا، واتە مەعریفە باوەکانی سەردەمی خۆی،

---

[١٦٥] میزان العمل لا ٢٨.

ڕووی دووەم کە زاڵە بەسەر خوددا، کە هەستکردنە بە پێویستی مانەوە و گۆشەگیر و پاککردنەوەی دەروونە لە هەموو ناشیرینیەك کە ڕووی تێدەکات.

بنیاتنانیش بەدیهاتنی زانستی یەقینیە لەلای لەڕێگەی عەقڵەوە، ئەو زاتەی کە پێی دەڵێت: (ڕووناکیەکە خودا خستوویەتیە دڵەوە) [١٦٦].بەدیهاتنی یەقینیش غەزالی بەدوای چەندین کێشانەو پێوەردا هێناویەتی و ناوی ناوە قیستاسی موستەقیم، کە هەرکەسێك ڕەچاوی هەنگاوەکانی بکات بەدڵنیاییەوە دەگاتە یەقین و دڵنیایی و لەکەوتنە ناو هەڵە دوور دەکەوێتەوە.

غەزالی دەڵێت: (چەندە دوورە من بانگەشەی ئەوە ناکەم کە تەنها مەعریفە ئاینیەکانی پێ کێشانە دەکەم، بەڵکو زانستە ماتماتیکی و هەندەسی و پزیشکی و فیقهی و کەلامی و زۆرێك لە زانستە ڕاستەقینە نادانراوەکان(غیر وضعی) یەکانی پێ کێشانە دەکەم، من بەم کێشانە و پێوانانە حەقیان لەبەتاڵیان جیادەکەمەوە، ئەی چۆن وانیە لەکاتێکدا بریتیە لەپێوانە و قیستاس و کێشانەیەکی ڕاست و ڕەوانە و هاوەڵی کتێب و قورئانە) [١٦٧].

کورتە و بەرهەمی قسەکە ئەوەیە کە زانست هەوڵی بەدەستهێنانی یەقین و دڵنیایی دەدات یەقینیش تەنها بە دۆزینەوەی زانراو زانیاری بەدەستدێت، زانراو زانیاریش نادۆزرێتەوە مەگەر بەدوو مەرج نەبێت: یەکەمیان ئامادە باشی دەروون بۆ دۆزینەوە و ئاشکرا کردن، دووەمیش: دەبێت زانراوو زانیاریەکە گونجاو بێت بۆ ئەوەی بدۆزرێتەوە و پەردەی بەسەرەوە لابرێت.

---

[١٦٦] المنقذ من الضلال لا ٨٦ سەیری بەشی داهاتووش بکە لەبارەی مانای نور و ڕووناکیەوە.

[١٦٧] القسطاس المستقیم لا ٨٢.

مانای یەکەمیان لەمەرجە نەفسیەکانی هاتنەدی زانستی یەقینیدا دیاریدەکرێت، کە ئامادەباشیەکی وەستاو لەسەر قوربانیدانیدان و تێکۆشان و ئابڕووبردنی هەڵەکان و هۆکارەکانی تێدا بێت، ئیتر ئەوانەی کە لکاون بەجەستە یان ئەوانەی کە لکاون بە خودی عەقڵەوە، لێرەدایە کە هێنانی پێوەر و کێشانە و پێوانەکان دەبێتە شتێکی پێویست، مانای دووەمیش بە مەرجە خودیەکانی بەدیهاتنی زانستی یەقینی و دڵنیایی دێتەدی، کاتێك عەقڵ بەتەواوەتی ئەرکەکەی خۆی جێبەجێدەکات لەڕووی بەکارهێنانی هەموو هێزە خودی و هێزە تایبەتەکانی جەستە بەشێوەیەك کە بتوانێت گشتیەك بنیات بنێت تەسەووڕە گشتیەکان بناسێت و ئەو یەقینەش دەرك پێبکات کە هیچ شك و گومانێکی تێکەڵ نەبێت، بەڵام مانای دووەم پەیوەستە بەمانای یەکەمەوە، وەك پەیوەندی مەرج بە دەرئەنجامەوە، وە هەروەها گرنگیدانی غەزالی بەلایەنی دەروونی بەتایبەت لەم کتێبەدا(میزان العمل) ئەوەیە کە وایلێدەکات لەسەر ئەم ڕێڕەوە بەردەوامبێت، بەو ئەندازەیەی کە سروشتی هەڵسووکەوت دەدۆزینەوە و حەقیقەتی پاڵنەر و وەدیهێنەرەکان و چۆنیەتی کارکردنیان لە هێزەکانی تری جەستەدا دەزانین، بەهەمان ئەندازەش توانای بەدیهێنان و بنیاتنان و دۆزینەوەی یەقین و دڵنیاییمان هەیە. هێندە بەس نیە کە مرۆۋ عەقڵی هەبێت و هێندەش بەس نیە کە بەباشی بەکاری بهێنێت، بەپێچەوانەی تەسەووری دیکارتەوە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە بتوانێت بەچ شێوەیەك دژەکانی عەقڵ و ڕێگریە دەروونیەکانی کە لەجەستەو دەروونیدا بوونیان هەیە بەشێوەیەکی یەکسان لاببات. وە هەروەها زانست بەلای غەزالیەوە دەبێت بە دووبەشەوە: زانستی تیۆری و زانستی کرداری، بەم دووبەشەش بەختەوەری دێتەدی، واتە کەماڵی خودی نەفس دێتەدی.

زانستی تیۆری مەبەست پێی ئەو زانراوەو زانیارییەیە کە زانیارییەکانی لەناوناچن و ناگۆڕێن، واتە هەموو شتێك کە دەبێتە هۆی یەقینێکی نەگۆڕ و کۆتایی و ڕەها وەك زانیاری لەبارەی خودا و سیفەت و فریشتەکان و کتێب و پێغەمبەرەکان و مەلەکوتی ئاسمان و زەوی و شتە سەر سوڕهێنەرەکانی دەروونی مرۆڤ و گیانەوەران لەو ڕووەوەی کە پەیوەستە بەهێزی خودای بەرزو بالأوە لەڕوانگەی خودی خۆیانەوە [١٦٨]. بەلأم زانستی کرداری بریتیە لە زانیاری لەبارەی چۆنیەتی کارکردن و مەرجەکانی، واتە ئەو زانستێکە کە بۆ خۆی نیە بەڵکو مەبەست پێی کارکردنە، لەم زانستەشدایە کە نیشانە کردارییەکانی غەزالی دەردەکەون و دوورن لە بیرکردنەوە عەقڵیە ڕووتەکان و نزیکن لەلێکۆڵینەوەی دیاردە عەینی و بینراوەکان و لەڕووی دەروونی و کۆمەلأیەتیەوە شیکاریان بۆ دەکرێت واتە بەگێڕانەوەیان بۆ هۆکارە ڕاستەوخۆکانیان.

پەیوەندیەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەم دوو زانستەدا کە دەتوانین ناوی لێبنێین پەیوەندی جەدەلی، چوونکە تیۆری کارایە لەکرداریدا کرداریش کارایە لە تیۆریدا، ئەم کردارە تێکەڵە بەشێوەیەکی بەرەو سەرەوە دەڕوات لەبنیاتنانی مرۆڤدا، واتە مرۆڤ تەنها بەرهەمی پێشکەوتنێکی جەدەلیە کە لەکارو کاردانەوەی نێوان تیۆرو کرداردا یەکدەگرێت، حەقیقەتەکەشی لەسەر گەوهەرو ناوەڕۆکی دەروونی مرۆڤ وەستاوە کە بەهەردوو مەلەکەی عەقڵی تیۆری و عەقڵی کرداری فەرمانڕەوایی بەسەرەوە دەکات.

---

[١٦٨] میزان العمل لا ٣٧ بگەڕێرەوە بۆ بەشی سێیەم( دامەزراندنی زانست).

لێرەدا تێبینی بکە کە غەزالی لە لێکۆڵینەوەی سروشتدا جیاکاریدەکات لەنێوان دوو لێکۆڵینەوەدا: یەکەمیان میتافیزیکیە و نەگۆڕە، دووەمیشیان سروشتیە کە یەقین و دڵنیاییەکەی زەننی گومانای و گۆڕاوە.

# بەشی سێیەم

# بەهای عەقڵ / تیۆر

غەزالی لەکتێبەکەیدا(معیار العلم) بەشێکی تەواوی تایبەت کردووە بە باسکردنی عەقڵەوە [169]. بەڵام لەم کتێبەدا ئەو بۆچوونانەی خستووەتە ڕوو کە باویان هەیە، ئیتر ئەوانەی کە درابنە لای زانایانی زانستی کەلام یان فەیلەسوفەکان یان جەماوەر، بەڵام ئەگەر بمانەوێت ماناو گرنگی و بەهای عەقڵ لەلای ئیمامی غەزالی بزانین، ئەوا کتێبی(میزان العمل) و کتێبی احیا و کتێبەکانی تریش چەندین بەشی جۆراو جۆری بۆ ئەم دەستەواژەیە(عەقڵ) تەرخانکردووە، کە تێیدا غەزالی هەم وەك لێکۆڵەرو هەم وەك دامەزرێنەر دەردەکەوێت، هەرچەندە لەم بنیاتنان و دامەزراندنەشدا سودی لەقسەی فەیلەسوفەکان و کەسانیتریش وەرگرتووە و بەرهەمەکانی خاڵی نیە لەبەرهەمی خەڵکانی تر کە لەنێو نوسینی نوسەرەکانی تردا ئەم سود وەرگرتنە لەبەرهەمی خەڵکانی تر زۆر کەمە، غەزالی لەکتێبەکانیدا لێچوو

[169] معیار العلم لا ٢٨٦.

لەیەکتر جیاوازەکانی بەیەکەوە کۆکردووەتەوە لەیەکەیەکی زۆر سەیردا کە سەرچاوەی سەرسامی و جێگەی پرسیارە لەلای زۆرێك لە خوێندەوارانی کۆن و نویٚ، بەجۆرێك لێکۆڵینەوەیەکی ئەم بوارە نیە کە باسی دژبوونی فیکر و بۆچوونەکانی غەزالی تێدا نەبێت، بەبۆچوونی من مەحکومکردنی فەیلەسوفێك بە دژ بوون لە بۆچوونەکانیدا کارێکی قورس و حوکمدانێکی خێرایە، چوونکە مانای دژبوون قورسە لەم ئاستەدا دیاریبکرێت، چوونکە هەموو گۆڕانێك لە بۆچووندا مانای دژ بوون نیە، بەڵکو هەندێکجار مانای پێشکەوتن یان بوونی ئاستگەلێکی تێڕوانینی جیاواز دەگەیەنێت بەتایبەت کە غەزالی لەکتێبەکانیدا ئاگادارماندەکاتەوە کە پێویستە ئاگامان لەخۆمان بێت لەکاتی خوێندەوەی کتێب و فیکرەکاندا، بۆ ئەوەی بزانین ئەمە ڕوویکردووەتە کیٚ؟ وەئایا دەربڕی خودی حەقە یان دەربڕی ڕوویەکە لەڕووەکانی؟ خەڵکی سیٚ بەشن، خاوەنی بۆچوونیش سیٚ هەڵوێستی هەیە[١٧٠].

## ١ – عەقڵ لەخودی خۆیدا چیە؟ چ پەیوەندیەکی بەشەرعەوە هەیە؟

عەقڵ یەکێکە لەو مەسەلانەی کە جیاوازیان لەسەرە، جارێك دەڵێین غەزالی باوەڕی بەعەقڵ هەیە، جارێکیش دەڵێین گومانی لەعەقڵ کردووە و باوەڕی بە گەڕەلاوژێی صۆفیەکان کردووە، لەوانەیە ئەم دژ بوونە لە حوکمداندا بگەڕێتەوە بۆ

[١٧٠] خەڵکی سیٚ بەشن: خەڵکی نەخوێندەوار، جەدەلیەکان، حەکیم و کەسە تایبەت و هەڵکەوتووەکان.

هەڵوێستەکانیش سیٚ شتن: ئەوەیە کە لە گفتوگۆو مونازەرەو خۆ هەڵکێشانەکاندا دەمارگیری نیشانبدرێت، ئەمەش مەزهەبی باوکان و مامۆستایە. ئەوەی کە لە ڕاسپاردە و ڕێنوێنیەکاندا مرۆڤ لەسەریان دەڕوات: ئەمەش لە ڕێنمایی و فێرکردندا بەکار دێت. ئەوەشی کە مرۆڤ باوەڕی پێیەتی لەو تیۆرانەی کە بۆی دەرکەوتوون: ئەمانەش ئەوانەن کە مرۆڤ بەنهێنی نێوان خۆی و خودایان دەزانێت و تەنها بەو کەسانەیان دەڵێت کە لەپلە و پایەی خۆیدان.( میزان العمل لا ١٣٥ – ١٣٦ – ١٣٧. قیستاس موستەقیم لا ٨٤ – ٨٥).

خودی دەقی نوسینەکانی غەزالی و مەزهەبی خوێنەر، ئەوەی کە لەم باسەدا بەلای ئێمەوە گرنگە بریتیە لەدەقەکانی غەزالی. غەزالی لەدەقەکانیدا دەستەواژەگەلێکی جیاوازی بەکارهێناوە کە هۆکارێکی ڕاستەو خۆو پشتگیرە بۆ فیکرەی جیاوازی و دژبەیەکی، غەزالی ووشەی عەقڵ و تێڕوانین و دڵ و بەصیرەت وبینایی و ئیمان و باوەڕو خود و دەروون و نورو ڕووناکی بەکاردەهێنێت.... بێگومان ئەم ووشانەش هەریەکە و سەر بە گروپێك لەتێڕوانینی جیاوازن، هەندێکیان صۆفین و هەندێکیشیان ئەقلانی و هەندێکی تریشیان ئەزموونی و هەندێکیان ئاینین، بەلآم ئێمە دەبێت مەسەلەکە لە لایەکی ترەوە وەربگرین و دەستیپێبکەین و دووربکەوینەوە لەوەی کە باوو بەناوبانگە، واتە ووشەی دڵ یان ڕووناکی و نور بەپشتبەستن بەهەندێك سەرچاوەی صۆفیەکان مانا نەکەین، چوونکە دەبێت باوەڕمان بەوە هەبێت کە ئەم دوو ووشەیە و هەندێك ووشەی تریش لەووشە بلآو بەناوبانگەکانن لەلای صۆفیەکان. کەواتە مەسەلەکە دەبێت بەپێچەوانەی ئەم ئاراستەیەوە بێت، چوونکە غەزالی لەچەندین شوێنی جیاوازی ناو بەرهەمەکانیدا ئاگادارماندەکاتەوە لەوەی کە لەوانەیە زاراوە ببێتە پەردە لەبەردەمی مانای مەبەستدا، ، یان دەبێت ماناکان لەزاراوەکانەوە وەرنەگیرێن [١٧١]، بەڵکو دەبێت لەخود و سنورەکانیانەوە وەربگیرێن. غەزالی هۆشیاریەکی تەواوی هەبووە

---

[١٧١] سەیری احیا بکە ب ١ لا ٨٩ کە دەڵێت( زۆربەی ئەم هەلآنە بەهۆی نەزانی کۆمەڵێکەوە بووە کە حەقیقەتەکانیان لەزاراوەکانەوە داوا کردووە، هەربۆیە کەوتوونەتە هەڵەوە تێیاندا، هەروەك هەڵەی زاراوەکانی خەڵکی لە دەستەواژەکاندا.

لەمشکاە الانوار لا ١٥٢ دا دەڵێت: ( ئەوەی کە لە زاراوەکاندا بە دوای حەقیقەتەکاندا بگەڕێت لەوانەیە لەبەر زۆری زاراوەکان سەرگەردان ببێت، ئەوکات وادەزانێت کە ماناکان زۆرن، ئەوەی کە حەقیقەتەکانی بۆ دەردەکەوێت ماناکان دەکاتە بنەما و زاراوەکان دەکاتە شوێنکەوتەیان، بەلآم مەسەلەی لاواز بەپێچەوانەی ئەمەوەیە واتە لەزاراوەکاندا بەشوێن مانادا دەگەڕێن.

سەبارەت بە جیاوازی خەڵکی لەسەر عەقڵ، ئەم جیاوازیەش بەلای ئەوەوە بریتیە لەو بنەمایەی کە لێیەوە دەستیپێکردووە، بۆ ئەوەی بۆچوونی خۆی دەرببڕێت و مانای عەقڵ دیاریبکات و بڵێت: (بزانە کە خەڵکی لەپێناسەی عەقڵ و حەقیقەتەکەیدا جیاوازن، زۆرێك سەرسام بوون و ئەم ناوەیان بۆ چەندین مانای جیاواز بەکار هێناوە و بووەتە هۆی جیاوازیان [١٧٢].

جارێك غەزالی پێناسەی عەقڵ دەکات لەڕووی پەیوەندی بەزانستەوە و جارێکیش لەڕووی پەیوەندی بەمرۆڤەوە پێناسەی دەکات، لەڕووی ئەوەی کە مرۆڤ واتە حەیوانێکی گۆیایە، جاری سێیەمیش لەڕووی ئەو ئەزموونانەوە پێناسەی دەکات کە مرۆڤ لەژیانی ڕۆژانەیدا ئەنجامیاندەدات، وە هەروەها بە چەندین شێوازیتر پێناسەی عەقڵ دەکات، بەڵام دەگەڕێتەوە بۆ حەقیقەتی یەکەمین کە مانای غەریزەیە، ئەمەش بەپێی ئەو پێناسە و دیاریکردنەیە کە غەزالی لە(حاریسی کوڕی ئەسەدی موحاسیبیەوە) وەریگرتووە کە لەپێناسەی عەقڵدا گوتوویەتی(بریتیە لە غەریزەیەك کە زانستە تیۆریەکانی پێ ئامادە دەکرێت و وەك ڕووناکی و نوورێك وایە کە دەخرێتە ناو دڵەوە کە بەهۆیەوە دڵ ئامادەباشی پەیدا دەکات بۆ هەستکردن بەشتەکان، خاوەنی وویژدان نیە ئەوەی کە ئینکاری ئەمە بکات و تەنها عەقڵ بگێڕێتەوە بۆ سەر زانستە زەروری و پێویستەکان، ئەوکات بێئاگاکان لەزانست و خەوتوەکان پێیاندەگوتریت ئاقڵ بەهۆی بوونی ئەم غەریزەیەوە تێیاندا، هەرچەندە زانستیشیان تێدا نەبێت) [١٧٣].

---

[١٧٢] الاحیا لا ٨٥.

[١٧٣] الاحیا لا ٨٥.

هەروەك چۆن هەمان ئەم هەڵوێستەش دەبینین لەبارەی عەقڵەوە و لەدەستەواژەیەکی زۆر نزیکیەوە لە کتێبی مونقیزدا، لەپاش ئەو شەپۆلە گومانەی کە بەهەموو هێزیەوە دەستیپێکردبوو کە بە گومان و شك کردن لەعەقڵ کۆتاییهات بەوەی کە منی لۆژیکی یان مەلەکەی تێگەشتن تەنها لەچوارچێوەی بەڵگە و دەلیلدا دەگونجێت [١٧٤]، چوونکە بریتیە لەو ڕۆحە فیکریەی کە سەرچاوەی دەرهێنان و هەڵگۆزینی زانستەکانە، لەبەر ئەوەی زانستە عەقڵیە ڕووتەکان وەردەگرێت و دانراویی و دووفاقی لەنێویدا ڕوودەدات و مەعریفە دەروونیەکان بەرهەم دێن [١٧٥]. لەپاش گومانکردن لەم عەقڵە لەپاش گفتوگۆیەکی ئاماژەیی ڕەوان لەگەڵ هەستەکاندا غەزالی عەقڵێکی گەشاوە دەسەلمێنێت کە وەك سەلماندنی یەکبوونی هۆشیاری جەدەلیە کە چەندین ناوی لێناوە وەك ڕووناکی، هەروەك لە مونقیزو بەتایبەت لەئەحیائدا هاتووە، یان ناویناوە غەریزە کە بەخاڵێکی میتافیزیکی دیارینەکراوی دادەنێت کە غەزالی قەڵای ئەقڵانی و زانستی و صۆفیگەریەکەی لەسەر بنیاتناوە و بەشێوەیەکی جوان پێناسەکەی مەحاسیبی تێدا بەرجەستە کردووە، [١٧٦] کە لە مونقیزدا غەزالی قسەکەی هێناوە و دەڵێت: (پێویستیە عەقڵیەکان قبوڵکراون و متمانە پێکراون بەیەقین و دڵنیاییەوە، ئەمەش بە سیستەمی بەڵگە و ڕێکخستنی قسە نەبووە، بەڵکو بەنورو ڕووناکیەك بووە کە خودا خستوویەتیە دڵیەوە، ئەم ڕووناکیەش کلیلی زۆربەی مەعریفەکانە، هەرکەسێك وا

---

[١٧٤] سەیری ئەوە بکە کە لە غەزالیەوە گێڕامانەوە لەبارەی بنەماکانی بەڵگە لەلای غەزالی لەبەشی دووەمدا.

[١٧٥] سەیری مشكاه الانوار لا ١٦٦ بکە.

[١٧٦] سەیری( عقلنه العقل) ی د محمد یاسین عوریبی لەگۆڤاری الوحده ی ساڵی چوارەم ژمارە ٤٣ ئەبریلی ١٩٨٨.

گومان ببات کە دۆزینەوە و کەشف لەسەر بەڵگە ئازادەکان وەستاوە ئەوا ڕەحمەتی فراوانی خودای تەسك کردووەتەوە) [١٧٧].

ئەم قسەیەی کە لە مونقیزدا هاتووە و دەربڕی ئەو یەقینەی کۆتاییە کە بەڕوونی مەسەلەیەکی گرنگ گەشتووەتە کۆتاییەکەی کە بریتیە لەوەی کە یەقینی غەزالی لەبارەی زەروریەتە عەقڵیەکانەوە لەسەر بنەمای خودی عەقڵ دانەمەزراوە، واتە بەوەی کە ببێتە مەلەکەی تێگەشتن و ڕۆحی فیکری هەڵگری پێویستیە عەقڵیەکانە، بەڵکو لەسەر بنەمای عەقڵی باڵا وەستاوە واتە ئەو عەقڵەی کە بەو نورو ڕووناکیە لەسنگیدا دەریدەبڕێت، چوونکە ئەو غەریزەیە کەمرۆڤە لەحەیوانەکانی تر جیادەکاتەوە.

لەمیزان العمل دا ڕوونکردنەوەیەکی غەزالی هاتووە کە دەڵێت: (بزانە کە عەقڵ دابەشدەبێت بۆ غەریزی و بەدەستهاتوو، غەریزی ئەو هێزەیە کە بۆ وەرگرتنی زانست بەکار دەهێنرێت... بەدەستهاتووش ئەوەیە کە لەزانستەکانەوە بەدەستدەهێنرێت) [١٧٨]. کەواتە ڕووناکی عەقڵی باڵایە نەك مەلەکەی تێگەشتن، بەڵکو مەرجی دروستبوونی مەلەکەی تێگەشتن بنەماکەیەتی، عەقڵی بەدەستهاتوو بارمتەی عەقڵی تەبیعی و ئاساییە واتە غەریزەی مرۆڤایەتی(ڕووناکی)، ئەم جیاکاریەش هیچ شتێك ئاراوتە ناکات لەوانەش شەرع(زانستە شەرعیەکان تەنها بەزانستە عەقڵیەکان مرۆڤ دەتوانێت لێیان تێبگات، زانستە عەقڵیەکان وەك دەرمان وەهان بۆ تەندروستی زانستە شەرعیەکانیش وەك خۆراکن و نەقڵ لەعەقڵەوە هاتووە و بۆت نیە پێچەوانەیان بکەیتەوە) [١٧٩] ئەم پەیوەندیەی نێوان عەقڵ و

---

[١٧٧] المنقذ من الضلال لا ٨٦.

[١٧٨] میزان العمل لا ٩٣.

[١٧٩] میزان العمل لا ٩٤.

شەرع عەقڵ دادەمەزرێنێت و شەرعیش دەکاتە شوێنکەوتەی چوونکە بەعەقڵ هەستی پێدەکرێت لەبەر ئەوەی کە سەرچاوەیەتی و ناتوانیت پێچەوانەکەی تەسەوور بکەین، بەڵکو غەزالی لە کۆمەڵێك شوێنی تردا لەمە زیاتر دەڕوات، هەروەك لەکتێبی معیار العلم دا هاتووە و دەڵێت: :

(بەم شێوەیە پێویستە دەرئەنجامەکانی بەڵگە بزانیت ئەگەر بەو شێوەی کە ئێمە دەیڵێین ناسیت و شتێکی پێچەوانەی ئەویان پێ گووتیت، کە چیرۆکێك بوو لەبارەی پلە بەرزترینی دروستکراوەکانی خودا و بەڕێزترینیان لەڕووی تێڕوانین و عەقڵەوە و ئەمەش بوویە هۆی دروستبوونی گریمانە لەلات ئەوکات یەقینەکەت تەواو نیە، بەڵکو ئەگەر پێچەوانەکەی لەپێغەمبەرێکی ڕاستگۆوە سەلمێنرا ئەوکات پێویستە دانبنرێت بەدرۆزنی گێڕەوەکەدا یان ئەو دەستەواژەیەی کە لەوەوە بیستراوە دەبێت تەئویل بکرێت، بەهیچ شێوەیەك گریمانی ڕاستبوونی بەبیرتدا نەیەت. ئەگەر تەئویلیشی قبوڵنەکرد و گومانیکرد لەپێغەمبەرایەتی ئەوەی کە ئەم لێیەوە گێڕاویەتیەوە بەپێچەوانەی ئەوەی کە عەقڵت دەیگرێت ئەگەر ئەوەی کە عەقڵت گرتوویەتی یەقین و دڵنیایی بوو ئەگەر هاتوو گومانت کرد لەڕاستبوونیدا ئەوکات نابێتە یەقین و دڵنیاییەکی تەواو) [١٨٠].

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە غەزالی هێندە پشتگیری بەڵگە دەکات بەجۆرێك وایلێدەکات ئامادەی بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەر یان چیرۆکێکی گێڕدراوە لەپێغەمبەرێکەوەبێت، ئەگەر بێت وقسەکەی پێچەوانەی بەڵگە و حەقیقەتی یەقین

---

[١٨٠] معیار العلم لا ٢٤٦.

بێت [١٨١]، هەروەها دەبینین غەزالی ڕووی ڕەخنەشی دەکاتە هەندێك لەصۆفیەکان کە ئینکاری بەها و گرنگی عەقڵ دەکەن و ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئینکاریکردنی عەقڵ تەنها دەبێتە هۆی ئینکاری خودی نەقڵ، چوونکە باوەڕبوون و حوکمدان بەڕاستیەتی نەقڵ حوکمێکی عەقڵیە، لە ئەحیائدا هاتووە(دەبێت حاڵی ئەو صۆفیانە چۆن بێت کە باسی خراپەی عەقڵ و شتە عەقڵگرەکان دەکەن؟ بزانە کە هۆکاری ئەمە ئەوەیە کە خەڵکی ناوی مەعقول و عەقڵیان بردووەتە ناو موجادەلە و گفتوگۆکان و دژ بەیەکی و ناچارکردنەکانەوە، ئەمەش پیشەی زانستی کەلامە، نەیانتوانیوە لەپاڵ خۆیاندا پێیان بڵێن ئێوە لەناونانەکەتاندا هەڵەتان کردووە، چوونکە لەپاش ئەوەی کەعەقڵ و شتە عەقڵگرەکانیان کردە باسی سەر زارانیان و جێگیر بوونی لە دڵەکانیاندا، دەستیانکردە خراپە گووتنی عەقڵ و شتە مەعقولەکان کە لەلای ئەوان بەو شێوەیە ناونراوە: لەبەردەم ڕووناکی بەصیرەت و بینابیدا کە خوداو ڕاستیەتی پێغەمبەرەکەی پێ دەناسرێتەوە ئیتر چۆن تەسەوور دەکرێت کە خراپەی بگوترێت؟ کاتێك خودا پیاپاهەڵیداوە، ئیتر چۆن دەکرێت شتێك خراپەی گوترابێت و بدواتر بەچاکە باسبکرێت؟ ئەگەر بەچاکە باسکراوەکە شەرع بێت ئایا چۆن ڕاستیەتی شەرع بزانین؟ ئەگەر بەعەقڵی خراپە گووتراو بزانرێت کە متمانەی پێ ناکرێت ئەوکات شەرعیش دەبێتە زەم کراوو خراپە گوتراو، گوێش نادرێت بەوەی کە دەڵێت: : بەچاوی دڵنیایی و نوری ئیمان و باوەڕ هەستیپێدەکرێت نەك بەعەقڵ چوونکە ئێمە ئەوەمان لەعەقڵ دەوێت کە لە چاوی دڵنیایی و نوری ئیمان داوای دەکەین، ئەمەش سیفەتێکی ناخیە کە مرۆڤ لە گیانەوەرانی تر جیادەبێتەوە

---

[١٨١] لەم قسەیەدا بەڵگەی بەبڕشت هەیە کە نەرێی بانگەشەی ئەوانە دەکات کە دەڵێن غەزالی ئەشعەریەکی ڕەها بووە و نەقڵ پێشی عەقڵ دەخاتی، چونکە خۆی لەمیزان العمل دا بەڕاشکاوانە دەڵێت کە نەقڵ لەعەقڵەوە هاتووە و پێچەوانەکەی شتێکی مەحاڵ و نەگونجاوە.

تاوەکو لەڕێگەیەوە هەست بەحەقیقەتی شتەکان بکات: زۆربەی ئەم گەڕەلاوژێیانە بەهۆی نەفامی خەڵکانێکەوە بووە کەلەنێو زاراوەکاندا بەشوێن حەقیقەتەکاندا گەڕاون، هەربۆیە بەهۆی بێسەروبەری زاراوە بەکارهاتووەکانی خەڵکیەوە ئەمانیش سەرگەردان بوون [١٨٢]، نورو ڕووناکی مەرجی پێشوەختەیە کە زانست بەدیدەهێنێت، واتە مەلەکەی بیرکردنەوە والێدەکات کە توانای جیاکردنەوە و پێکهاتن و بەرهەمهێنانی هەبێت.

ئەم نورو ڕووناکیەیە کە پێویستی و زەرورەتە عەقڵیەکانی والێکردووە کە متمانە پێکراوبن و هیچ گومانێکیان تێدا نەکرێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە منی لۆژیکی ئامادە لەکرداری مەعریفەدا دەتوانێت خۆی بنیات بنێت ئەگەر بیخەینە ژێر ئەزموونی گومانەوە هەرچەندە توانای بنیاتنانی زانستەکانی تریشی هەبێت، وە هەروەها غەزالی کاتێك دەڵێت: (بەڕووناکی) بە دۆزەرەوەی ڕاستەقینەی عەقڵی بالا و عەقڵی ڕەها دەزانرێت لەبیری ئیسلامی کۆندا، چوونکە فەیلەسوفە کۆنەکانی پێش ئەوە وەك(ئیبن سینا) تەنها توانیویانە بگەنە سەلماندنی منیەتی، بەلام لەوانەیە ئەم منە لۆژیکی بێت، واتە بەوەی کە خودێکی عاریف بێت یان مەعریفە بنیات بنێت، بەلام لەوانەیە منێکی گەشاوەتر و پێشکەوتوو تر هەبێت واتە ئەوەی کە دەبێتە مەرجی دامەزراندنی منی لۆژیکی زاناو عاریف، گومان لەلای ئیمامی غەزالی هەرچەندە بوێری چوونە ناو هەست و مەلەکەی تێگەشتن یان بیر کردنەوەی هەبێت، بەلام دەبینین لە کۆتاییدا دەگاتە سەلماندیان چوونکە لەلای ئیبن سینا بۆ نمونە بەشێوەیەکی پێویست نەسەلمێنراون، هەست شەرعیەتی مەعریفەی لە عەقڵەوە وەردەگرێت(مەلەکەی تێگەشتن / منی عاریفی لۆژیکی) ئەم عەقڵەش تەنها

---

[١٨٢] الاحیاء لا ٨٩.

شەرعیەتی خۆی لە لەخۆیەوە وەردەگرێت(بەڵگەی پیاوی فرپو) بەلاَم غەزالی لە مونقیزدا ئەوە دەسەلمێنێت ئەم بنیاتنانە بەس نیە لەوانەیە لەبەردەم عەقڵدا فەرمانڕەوایەکی تر هەبێت ئەگەر درۆی عەقڵ لە حوکمەکەیدا دەر بکەوێت هەروەك چۆن پێشتر عەقڵ هەستەکانی بەدرۆ خستووەتەوە، ئەم فەرمانڕەوایەش بریتیە لەو غەریزە کە لەناخی دەروونەکانمان و ئەو عەقڵە بالاَیەدا جێگیرە کە شوناسی خودی ئێمەیە، واتە ئەوەی کە بەهۆیەوە مرۆڤ خودی خۆیەتی.

ئەوەی کە دەگوترێت ئەو نورو ڕووناکیە بریتیە لەعەقڵ، واتە ئامادەباشی لەناو ئێمەدا قسەیەکی تەئویلی نیە، بەڵکو بەلای غەزالیەوە قسەیەکی ڕاشکاوە و لەمشکاە الانواردا هاتووە وە دەڵێت: (بزانە کە لەدڵی مرۆڤدا چاوێك هەیە کە بریتیە لەسیفەتی کامڵبوونی کە جارێك بە عەقڵ و جارێکیش بەرۆح جارێکیش بە دەروونی مرۆڤ ناو زەدی دەکات، باواز لەم دەستەواژانە بهێنین، چوونکە ئەگەر زۆر بن یان لەگەڵ لاوازی بەصیرەت و بینابیدا ماناکان زۆر بن، مەبەستیشمان ئەو مانایانەیە کە مرۆڤی ئاقڵ لەمنداڵی شیرە خۆرە و حەیوان و شێت جیادەکاتەوە، با لەزاراوەشدا ناوی بنێین عەقڵ وەك شوێنکەوتنێکی جمهورو کۆمەڵی زانایان هەربۆیە دەڵێین عەقڵ لەپێشتر و باشترە کە ناو بنرێت نوور و ڕووناکی لەبری ئەوەی کە ناوی لێبنرێت چاوی دیار، چوونکە نوور پلەی لەوە بەرزترە کە کەموکورتی تێدا دروست ببێت)[١٨٣].

ئەگەر ڕووناکی و نوور هەمان عەقڵ بێت، ئەوکات ئێمە بەم قسەیە دەگەینە ئەوەی کە لەهەندێك مانای شاراوەی پشتەوەی ڕەخنەکەی غەزالی تێبگەین کە لەکتێبی تهافت الفلاسفەدا لە فەیلەسوفەکانی گرتوون، بەتایبەت لەمەسەلەی

---

[١٨٣] مشکاة الانوار لا ١٢٢.

دەروونداً کە لەتهافتدا دەڵێت: (فەیلەسوفەکان بێتوانان لەهێناوەی بەڵگەی عەقڵی کە نەفس و دەروونی مرۆڤ گەوهەرو ناوەڕۆکێکی ڕۆحانی لەسەر پێی خۆی وەستاوە) [١٨٤]. پێویستە ئەوەش بزانین کە غەزالی بەڵگەی فەیلەسوفەکان لەهەندێ کتێبیدا دووبارە دەکاتەوە، وەك کتێبی(معارج القدس)، باوەڕبوون بەوەی کە نەفس ناوەڕۆك و گەوهەرێکی ڕۆحانی هاوبەشە لەنێوان غەزالی و فەیلەسوفەکان و بەڵگەی عەقڵیش لەسەر ئەمە لەنێواندا هاوبەشە، چوونکە نەفس و دەروون لێرەدا بریتیە لە منی لۆژیکی یان ئەو خودە عاریفە هەستپێکەرەی زانستەکانە. بەڵام ئەوەی کە بەڵگەی عەقڵی بەبەس بزانین بۆ سەلماندنی نەفس و دەروون بەشێوەیەکی کۆتایی و بەبڕشت ئەمەیان جیاوازی لەسەرە، چوونکە بۆ سەلماندنی ئەم من بوونە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ نوور و ڕووناکی خودایی، واتە بگەڕێینەوە بۆ ئەو غەریزە مرۆییەی کە لە مرۆڤدا ئافرێنراوە(عەقڵیش غەریزەیەکە کە بەهۆیەوە هەندێك لەگیانەوەران ئامادە دەبن بۆ وەرگرتنی زانستە تیۆریەکان..... هەروەك چۆن پێویستە بگوترێت جیابوونەوەی گیانەوەر لە بێگیان لە جوڵەدا تەنها بە غەریزەیەك دەبێت کە تایبەتکراوە پێیەوە کە پێی دەگوترێت ژیان، وەهەروەها جیابوونەوەی مرۆڤ لە ووڵاخ لە هەستپێکردنی زانستە تیۆریەکاندا بە غەریزەیەك دەبێت کە پێی دەڵێن عەقل) [١٨٥].

هەروەها دەتوانین لەو هۆکارە تێبگەین کە غەزالی والێکردووە باوەڕی بە پێویستی پشت بەستن بەشەرع هەبێت بۆ سەلماندنی جەوهەریەتی دەروون و ڕۆحانیەتەکەی کە دەڵێت: (بەڵام ئێمە ئینکاری بەڵگە هێنانەوەی ئەوان دەکەین

---

[١٨٤] تهافت الفلاسفة لا ٢٥٢.

[١٨٥] الأحياء ب ١ لا ٨٥.

تەنها بە عەقڵ و بێنیازبوونیان لەشەرع) [١٨٦]، چوونکە ئەم غەریزەیە پەیوەندی بەشەرعەوە هەیە و غەزالی دەڵێت: (عەقڵ وەك ئاوێنە وایە کە جیادەبێتەوە لە تەن و جەستەکان لە گێڕانەوەی شێوە و ڕەنگەکان بە سیفەتێك کە تایبەتە پێیەوە کە ڕێکو پێکیە، وەهەروەها چاو تەوێڵی لیَ جیا دەبێتەوە لەسیفەت و شێوازدا کە بەهۆیانەوە ئامادە بووە بۆ بینین، نیسبەتدانی ئەم غەریزانە بۆ لای زانستەکان وەك دانەپاڵ و نیسبەتی چاو بووە بۆ لای بینین، دانەپاڵی قورئان و شەرع بۆ لای ئەم غەریزە لەناخیدا وەك دانەپاڵی ڕووناکی خۆرە بۆ لای چاو، دەبێت بەمشێوەیە لەم غەریزەیە تێبگەین) [١٨٧] ئەو ڕەخنەیەی کە غەزالی لەفەیلەسوفەکانی دەگرێت ئەوەیە کە تەنها حیساب بۆ عەقڵ ئەکەن کە لەبەرامبەر زانستەوەیە و غەزالی لەبارەیەوە دەڵێت: (ئەویش لە خودی خۆیدا ڕاستە چوونکە ئەم زانستانە لەخودی خۆیاندا ڕاستن و بوونیان هەیە ناویان لێنراوە عەقڵی دیار، عەقڵی خراپیش ئەوەیە کە ئینکاری ئەم غەریزەیە بکات و بڵێت بێجگە لەم زانستانە شتێکی تر بوونی نیە) [١٨٨]، وەك پشتگیریەك بۆ ئەم شیکاریە دەبینین کاتێك غەزالی باسی نەفس دەکات تەنها باسی بەڵگە عەقڵیەکان ناکات بەڵکو بەحوکمی شەرعیش پشتگیریاندەکات و دەڵێت: (دەروون لەوە ڕوونترە کە پێوستی بەبەڵگە هەبێت بۆ سەلماندنی، چوونکە هەموو بانگەشە و گوتارەکانی شەرع ڕوو ناکەنە شتی نادیار، بەڵکو ڕوودەکەنە شتێکی دیاری زیندوو کە لە گووتارەکە تێبگات) [١٨٩].

---

[١٨٦] تهافت الفلاسفة لا ٢٥٨.

[١٨٧] الأحياء ب ١ لا ٨٥.

[١٨٨] لێرەدا دەتوانین تێبینی ئەوە بکەین کە غەزالی بوارێك بۆ ئاین دەهێڵێتەوە، لە تەنیش بواری زانستدا، بەڵام عەیبەکە لەلای ئەوانە خۆی حەشارداوە کە بانگەشەی پیویستی دانەیەکیان بەبیَ ئەویتریان.

[١٨٩] معارج القدس لا ١٩.

ئەم دووجەمسەریە لە سەلماندندا لەو ڕووەوە نە لەلای غەزالی و نە لەلای فەیلەسوفەکانیش نایبینین، چوونکە پێی وایە کە بەڵگەی عەقڵی بەس نیە و دەبێت بەشەرع پشتگیری بکرێت یان شوێن ڕێگەی کەشف و دۆزینەوە بکەوین(پرۆگرامی صۆفیەکان) چوونکە زانست دوو ڕێگەی هەیە: تەریقەتی ئەهلی بەڵگە و تەریقەتی ئەهلی عیرفان. ئەگەر نوور هەمان عەقڵ بێت ئەوکات ئێمە لەلایەکی ترەوە دەگەینە سەلماندنی دووبەش لەعەقڵ، چوونکە عەقڵ دابەشدەبێت بۆ غەریزی و بەدەستهاتوو، غەریزی ئەو هێزە یارمەتیدەرەیە بۆ وەرگرتنی زانست، بەدەستهاتووش ئەوەیەکە بەهۆی زانستەکانەوە دروستدەبێت(وەك عەقڵی سیاسی و ئابوری.... هتد) یان بەبێ ئاگاداری خود یان بەئاگاداری خۆی [١٩٠].

| | |
|---|---|
| رأيت العقل عقلين | فـمطبوع و مسموع |
| ولا ينفع مســـموع | اذا لم يك مــطبـــوع |
| كما لاتنفع الشمس | وضوء العين ممنوع |

واتە: عەقڵم بینی کە دووجۆرە: تەبیعی و بیسراو. بیستراوەکە سودی نیە وەگەر عەقڵە سروشتیەکە نەبێت، هەروەك چۆن خۆر بێ سوودە ئەگەر چاوی خەڵکی ڕووناکیان تێدا نەبێت و ببینن.

پەیوەندی نێوان ئەم دوو عەقڵە زۆر بەهێزە و ناکرێت بپچڕێنرێت عەقڵی تەبع و ئاسایی بریتیە لە غەریزە یان ئەونورەی کە لەدڵدا هەیە، عەقڵی بیستراویش بریتیە لە عەقڵی بەدەستهاتوو ئیتر ڕووی بەدەستهێنانەکەی هەرچۆنێك بێت.

---

[١٩٠] میزان العمل لا ٩٣.

ئەگەر ئەمە بارودۆخی عەقڵ و شەرع بێت ئیتر چۆن لەقسەکەی غەزالی تێبگەین لە معارجدا کە(عەقڵ ناتوانێت ڕێگەی هیدایەت بدۆزێتەوە مەگەر بەشەرع نەبێت و شەرعیش بە عەقڵ ڕووندەبێتەوە کەواتە عەقڵ وەك کەرەستە وایە و شەرعیش وەك بیناو باڵەخانەیە) [١٩١]. حەقیقەتی ئەم مانایە دژ نیە لەگەڵ مانای پێشوودا چوونکە غەزالی دان بەیەکبوونی شەرع و عەقڵدا دەنێت واتە لەڕووی ئاراستەوە جیاوازن نەك لەڕووی حەقیقەت و ڕاستیەوە، هەربۆیە(شەرع عەقڵێکە لەدەرەوە، عەقڵیش شەرعێکە لە ناوەوە) [١٩٢]، غەزالیش کاتێك ئەمە دەسەلمێنێت بەبەڵگەی ئاینی نایسەلمینێت، بەڵکو لە خودەوە دەست بەسەلماندنی دەکات کە مانای زانست و پلە و قۆناغەکانی زانیوە، واتە غەزالی باس لە دەرئەنجامی فەلسەفەکەی دەکات لەعەقڵ و شەرعدا، چوونکە بیرکردنەوە و زانستەکانی تێدا ڕوونکردووەتەوە و بەتێڕوانینی قوڵەوە دەڵێت: کە شەرع عەقڵێکە لەدەرەوەیە [١٩٣]و عەقڵیش شەرعێکە لەناوەوەیە [١٩٤].

کەوابوو لێرەدا کێشەکە لەئاستێکی تردا دێتە بەرباس، ئەویش ئەوەیە کە سەیری عەقڵ بکەین بەوەی کە مەلەکەی تێگەشتن یان وەك خودێکی هەڵگری لۆژیك کە توانای هەبێت لەنمونەی منی سینویە تێبگات، وە دەبێت بەتێڕوانینێکی

---

[١٩١] معارج القدس لا ٥٧.

[١٩٢] هەمان سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

[١٩٣] سەیری کتێبی المستصفی – بکە کە تێیدا غەزالی حەقیقەتی عەقڵی بەرهەمهێنەری شەرع ڕووندەکاتەوە کە شتێکی بەخشراو نیە.

[١٩٤] سەیری کتێبی ئەحیا – میزان العمل – مشکاە الانوار بکە کە تێیدا: ئەوە ڕووندەکاتەوەو دەڵێت لەگەڵ ئەوەی کە عەقڵ غەریزەیەکە کە گونجاوە بۆ خۆشە کردن و لەناخیدا حیکمەتی شەرعی تێدایە، عەقڵیش ئەو چوارچێوە شێوازیەیە کە دەورەی شەرعیداوە. شەرعیش: مادەی عەقڵ و ناوەڕۆکەکەیەتی، عەقڵی بێ شەرع پوچە و شەرعی بێ عەقڵیش کوێرە.

گشتگیر سەیری شەرع بکەین و بەبواری ئیمان و عەقیدەیشی بزانین، لەم ئاستەدا پەیوەندی نێوان شەرع و عەقلّ تێکدەچێت و داهێنکاری تێدا نابێت و پێکدادانێك ڕوودەدات کە لەکۆتاییدا دەبێتە هۆی کافر کردنی فەیلەسوفەکان لەلایەن غەزالیەوە ئەمەش نەك تەنها لەبەر ئەو قسانەیان بێت کە دژە لەگەلّ شەرعدا بەلّکو لەبەر ئەوەیە کە دەلّێن ئەم قسانەشیان بریتین لە عەقلّ و دانایی و ژیری، ئەمە لەکاتێکدایە شتەکە بەپێچەوانەی ئەمەوەیە، چوونکە غەریزەی عەقلّ دژ نیە لەگەلّ حەقیقەتی قورئاندا عەقلّ لەبەرزبوونەوەیدا و لەکۆتا پلەکانیدا دەرکی پێدەکرێت، قورئان نوور و ڕووناکیە هەروەك چۆن ڕووناکی خۆریش ناونراوە ڕووناکی، نمونەی قورئان بریتیە لە ڕووناکی خۆر و نمونەی عەقلّیش ڕووناکی چاوە، واتە بینین بەو دەبێت، واتە بەقورئان بەصیرەت لەعەقلّدا دروستدەبێت، هەروەك چۆن بەڕووناکی خۆر چاوەکانیش دەبینن، ئەمەش مانای ئەوە نیە کە عەقلّ لەلای غەزالی لەچوارچێوەی شەرعدا گەمارۆ درابێت و لێی تێپەڕ نەکات(یان ماناو دەلالەتەکەی لە پێکهاتە و بونیادی وەحیەوە وەردەگرێت و لەناو شەرع و لەچوار چێوەی حەقیقەتی ئاینیدا هەر لەدەقی قورئانیەوە تاوەکو دەگاتە حەدیس و فەرموودە نوێ دەبێتەوە، حەقیقەتی ئاینی بواری ڕێنمایی عەقلّ پێکدەهێنێت بەرەو مەعریفە و زانست) [١٩٥]. یان ئەوەیە کە(ئامێرێکە کار ناکات و مەعریفەو زانست و حەقیقەتەپێدراوو بەخشراوەکان نادۆزێتەوە و حەق نەگۆڕە و لەشەرع و دەقیشدا پێدراوە(المعطى)، بەلاّم کاری عەقلّ لەڕووی پەیوەندی بەم حەقەوە و پابەند بوونی بەسنورەکانیەوە پێناسە و دیاریدەکرێت) [١٩٦].

---

[١٩٥] سەیری کتێبی( المعرفة واسس سلطتها عند الغزالی) عبد المجید الأنتصار- مجلة الفکر العربی المعاصر ع ٥٧ سبتمبر سنة ١٩٨٨.

[١٩٦] هەمان سەرچاوە.

خاوەنانی ئەم بۆچوونە پێیانوایە غەزالی عەقڵ پەیوەستدەکات بە ئیمان و گوێڕایەڵیەوە و عەقڵ بەرابەر دەکات لەگەڵ حەقیقەتی دینیدا. ئەم قسەیە تێگەشتن لە پەیوەندی نێوان عەقڵ و قورئان تێکدەدات لەلای ئیمامی غەزالی چوونکە ئەوە دەر دەخات کە لەسروشتی عەقڵ تێنەگەشتووە کە غەریزەیە و سورە لەسەر تێگەشتنەکەی کە تەنها بریتیە لەئامێرێك، بەهەرحاڵ ئەم تێگەشتنە ڕوویەکە لە ڕووەکانی عەقڵ نەك خودی عەقڵ بێت کە غەریزەیە، لەلایەکی تریشەوە ناتوانین ئەم هەڵوێستەمان قوڵبکەینەوە لەبارەی عەقڵ و شەرعەوە مەگەر بەشیکاری و لێکۆڵینەوە نەبێت لەبارەی چەمکی زەوق و عەقڵ لەلای ئیمامی غەزالی.

غەزالی دەڵێت: : (دابەشبوونی خەڵکی بۆلای ئەوانەی کە خۆیان بەبێ ئاگادار کردنەوە تێدەگەن و ئەوانەی کە بە ئاگادار کردنەوە و فێربوون تێدەگەن و ئەوانەشی فێرکردن و ئاگادار کردنەوە سودیان پێ ناگەیەنێت، وەك دابەشبوونی زەوی وایە بۆ ئەو شوێنەی کە ئاوی تێدا دەمێنێتەوە و لەسەر شێوەی کانی بەخۆکرد هەڵدەقوڵێت وئەوەی کە پێویستی بەهەڵکەندن نیە بۆ ئەوەی بچێتە ناو جۆگەلەکانەوە و ئەوەی کە هەڵکەندنی جۆگەلەش سودی نیە بۆی لەبەر ئەوەی کە ووشکە، ئەمەش لەبەر جیاوازی جەوهەرو ناوەڕۆکەکانی زەویە لەسیفەتەکانیاندا، جیاوازی نەفس و دەروونەکانیش لە غەریزەی عەقڵیدا هەربە و جۆرەیە) [١٩٧]. ئەگەر

---

[١٩٧] ئەحیا لا ٨٨.

عەقڵ دادگەرترینی شتەکان نیە کە لەنێو خەڵکیدا دابەشکرابێت، هەروەك دیکارد دەڵێت، بەڵکو عەقڵ بینایەکە کە دەگۆڕێت( چۆن دەکرێت غەریزە جیاواز بێت کە ئەگەر ئەو نەبێت خەڵکی جیاواز نەدەبوون لە تێگەشتن لەزانستەکاندا و دابەشیش نەدەبوون بۆ لای بێئاگاکان کە بەتێگەشتن نەبێت لەهیچ ناگەن و مرۆڤی مامۆستا

دووبەشەکەی پێشوو وەربگرین دەبینین پەیوەندیان بە حیکمەت و دانایییەوە هەیە بەلآم بە دوو شێوازی جیاواز کە غەزالی دووبەشی سەربەخۆی بۆ تەرخانکردوون لەکتێبی میزان العمل دا کە بریتین لە: (باسکردنی جیوازی تەریقەتی صۆفیەکان لەڕوانگەی زانستە وە لە تەریقەتی خەڵکانی تر) لەگەڵ(باسکردنی باشترو ئەولاتری یەکێك لە دوو بەشەکە).

## ٢ — عەقڵ و صۆفیگەری:

شێوازو تەریقەت و ڕێگەی صۆفیگەری لە گەوهەرو ناوەڕۆکدا پرۆگرامێکی جیاوازە لەڕێگەی تێڕوانینکارانی ئەهلی زانست، چوونکە صۆفیەکان هەروەك غەزالی دەڵێت: خەڵکیان هان نەداوە لەسەر بەدەستهێنانی زانستەکان، بەڵکو خەڵکیان لەسەر تێکۆشان و بەربەرەکانێی دەروون و بەهەموو هێزو تواناوە بەرەو پیری خودا چوون هانداوە، لەپاش سڕینەوەی سیفەتە خراپەکان، ئەوەی کە لەسەر ئەم ڕێڕەوە بڕوات حەقیقەتەکانی بۆ دەردەکەوێت، کە صۆفیەکان خۆیان چەند مەرجێکیان بۆ ئەم ڕێگەیە داناوە کە گرنگترینیان:

– ئامادە باشی بە پاڵفتەی ڕووتی دەروون.

– ئامادەباشی نیەت و مەبەست لەگەڵ وویست و ئیرادەی ڕاستگۆیانە.

– تینویەتی تەواوو لەبۆسەدا وەستان و چاوەڕێکردنی ئەو ڕەحمەت و بەرەکەتەی کە خودا دەیکاتەوە بەڕوویاندا.

---

لەتێگەیاندنیاندا ماندوو دەبێت و کەسانێکی زیرەك کە بەکەمترین ئامازە تێدەگەن و کامڵ و تەواوێك کە لەناخیدا حەقیقەتی شتەکان هەڵدەقولێت بەبێ فێر کردن).

هەروەك تێبینیمانکرد ئەم ڕێگەیە لەسەر تێکۆشان و بەربەرەکانێکردن وەستاوە لەگەڵ دەروونداو، غەزالیش نمونەیەکی ووردی لەمبارەیەوە پێشکەشکرد کە شێوازی صۆفیەکانی تێدا ڕاڤە دەکات هەروەك صۆفیەکان خۆیان پەیڕەوی دەکەن، ئەمەش سەرەتا دەبێت مەرجە یەکەمینەکانی تێدا بێتەدی و بەردەوامبێت لەسەر زیکرو یادی خودای گەورە بە(الله الله) کردن لەگەڵ ئامادەباشی تەواوی دڵدا، دواتر دەستدەکات بە پێشکەوتن هەرلە زیکرو یادی خودا بەزمان تا دەگاتە مانای ڕووتی ئامادە لەدڵدا بەپێویست و بەردەوام بەبێ قسە و جوڵە و زمان و بەردەوامی چاوەڕێکردن تاوەکو ئەو کەشف و دۆزینەوەیە دەستپێدەکات کەوەك بروسکەی فڕێنەر وایە، ئەولیاکانی خوداش لەم حاڵەتەدا چەند پلەیەکیان هەیە بەپێی جۆری دۆزینەوە و کەشفەکە کە ڕوودەدات بۆیان. ئەم شێوازەی کە لەسەر تێکۆشان و بەربەرەکانێی دەروون و نەفس وەستاوە، غەزالی لەسەر زمانی زانایانی ئەهلی تێڕوانین کە باوەڕیان بە قورسی ئەم ڕێگەیە هەیە، سەرەڕای گریمانی ڕوودانی بەڵام دەبینین ڕەخنەی لێ دەگرێت، لەبەر ئەوەیە کە مرۆڤ ناتوانێت خۆی لەو شتە دوونیاییانە ڕزگار بکات کە پێیەوە دەلکێن، بەڵکو هەندێکجار عەقڵ تێکەڵدەبێت و جەستەش نەخۆش دەکەوێت و بەرەو مالیخولیا(خەیاڵ پڵاوی) دەچێت، هەندێکجاریش دەگاتە خەیاڵگەلێك کە وادەزانێت حەقیقەتن لەکاتێکدا بریتین لەکۆمەڵێك وەهم، بێگومان ئەم ڕەخنەیەش وەك هەڵوێستە هاوچەرخەکانی صۆفیەکان وایە کە دیاردەکانی ڕاڤە دەکات بەگێڕانەوەیان بۆ هەندێك نەخۆشی دەروونی یان هەندێك جۆری هەڵسووکەوتی وەستاو لەسەر بەرزی و بەرز بوونەوە، هەروەك بڵێی صۆفی لەحاڵەتێکی نەخۆشیدا دەژی، لێرەدا صۆفیگەری تەنها بەشێکە لە ووڕێنە.

بەڵام لێرەدا ڕێگەی زانایانی ئەهلی تێڕوانین لەسەر بەدەستهێنانی زانستە ڕاستەقینەکان لەدەروون و نەفسدا بەرێگەی لێکۆڵینەوە و تێڕوانین بۆ ئەوپەڕی توانا بەدەستپێکردن لەزانستی پێشینانەوە تادەگاتە کەشف و دۆزینەوەکانی کە لەسەر بنەمای بەڵگە و یەقین و دڵنیایی وەستاون، ئەم جیهانەش لەپاش تێپەڕین بەم ڕێگایەدا دەتوانێت ڕێگەی کەشف و دۆزینەوە بگرێتەبەر لەوکاتەی کە بەڵگە دەوەستێت و تێڕوانین توانای نامێنێت، کورتە و پوختەی قسەکە لەم بەشەدا ئەوەیە کە ڕێگەی یەکەم: ئامادەباشی وەرگرتنی زانستە لە فەیزو بەخششە ئیلاهیەکان(واتە لەوحی مەحفوز)، دووەمیش: بەدەستهێنانی هەمان ڕۆڵ لەڕێگەی فێربوون و بەدەستهێنانەوە.

بەڵام ئەم دوو ڕێگە و تەریقەتە پێچەوانە و دژ بەیەکە لەتێڕوانیندا دەبینین غەزالی ئەوە ڕادەگەیەنێت و هێما بەوەدەکات کە قورسە حوکمیان بەسەردا بدەین و دەڵێت: : (ئەو حەقەی کە لەبەر دەم مندا دیارە و خوداش باشتر دەزانێت لەبارەیەوە ئەوەیە کە حوکم کردن بەنەرێنی ئەو ئەرێنی لەمەدا بەرەهایی هەڵەیە)[١٩٨] ئەمەش هەڵوێستێکی مام ناوەندە و جیاوازە لە هەڵوێستی صۆفیەکان لەبارەی زانا و فەیلەسوفەکان و هەڵوێستی فەیلەسوف و زاناکان لەبارەی صۆفیەکانەوە، دووژمنایەتی نێوانیان توند و بەردەوامە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە صۆفیەکان ڕەخنە لەتێڕوانین دەگرن بەبێ ئەوەی ناوەڕۆکی بزانن، بەڵام غەزالی سەرەڕای ئەم هەڵوێستە مام ناوەندە دەبینین کە مەیلی بەلای تای تەرازووی صۆفیەکاندا لار بووەتەوە کاتێك لەبارەی خەڵکی بەگشتیەوە قسە دەکات وەك ئەو پیاوە پیرانەی کە لەسەر بیرکردنەوە و تێڕوانین ڕانەهاتوون و ئەو گەنجانەشی کە خاوەنی

---

[١٩٨] میزان العمل لا ٣٤.

سروشتێك نین کە بتوانن بیر کردنەوە و تێڕوانینیان هەبێت یان وەك ئەوەی کە زانایەکی دەستناکەوێت کە زانستی لێوە فێر ببێت و دووربێت لەچاولێکەری کە لەسەر ئیجتیهاد وەستاوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە تاك ناتوانێت هەموو مەعریفەکان کۆبکاتەوە لەیەك سەردەمدا، هەربۆیە هاوکاریکردنی یەکتری لەم بوارەدا پێویستە.

بەڵام ئەگەر گەنجێکمان هەبێت و لە بەدەستهێنانی زانست و زانیاریدا گەورە بوبێت و گەشەی کردبێت و بۆ خۆی زیرەك بێت و لەپاش زانینی هەموو جۆرەکانی زانست بوبێتە کەسێکی ووشیارو بەئاگا، بەڵام بەتەواوی بەو زانستەی کە زیاتر قاڵبووە تێیدا، کەسێکی لەمشێوەیە ئامادەیە بۆ هەردوو ڕێگە و تەریقەتەکە، ئەوکات ئەولاترە بۆی کە ڕێگەی فێربوون بگرێتە بەرو زانستە بەڵگەییەکان کە لەتوانای هەست و تێگەشتنی مرۆڤدان بەهەوڵ و ماندوبوونی خۆی فێر ببێت، زانستێك لە جۆی ئەوزانستانە نەمابێتەوە کە فێری نەبوبێت، ئەوکات کێشە نیە کە دەستبکاتە گۆشەگیری و پشت بکاتە دوونیا و خۆی بۆ خودا یەکلایی بکاتەوە و چاوەڕێ بکات لەوانەیە خودا ڕێگەی ڕێبوارانی ئەو ڕێگەیەی بۆ بکاتەوە. ئەمە بەبۆچوونی خۆمە و خوداش باشتر دەزانێت)[١٩٩]. لێرەدا دەتوانین هەڵوێستەکەی غەزالی لەمەسەلەکە بەمشێوەیەی لای خوارەوە باسبکەین:

غەزالی هەروەك چۆن یاسای بۆ صۆفیگەری داناوە بەهەمانشێوەش یاسای بۆ زانستە تیۆریەکان داناوە و پێی وایە کە هەردووکیان یەك ڕێگەیان هەیە کە سەرەتاکەی تێڕوانینە و کۆتاییەکەی کردارە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە صۆفیگەری لەلای غەزالی پێویستە لەپێشیەوە زانستێك هەبێت ئەوەش بەڕێگەی تێڕوانین و

[١٩٩] میزان العمل لا ٣٥.

بەڵگە، هەروەك چۆن ئەو زانستەش دەبێت دان بنێت بە سنوری تێڕوانینەکەیدا بۆ ئەوەی دواتر مەسەلەکە بداتە دەستی تەسەووف و تێکۆشان و بەربەرەکانێی نەفس و دەروون(مجاهدە النفس)، بەڵکو تێڕوانین مەرجی یەکەمینە بۆ وەدیهاتنی صۆفیگەری و سەرکەوتن تێیدا، ئەمەشە کە صۆفیگەری ڕاستەقینە لەصۆفیگەری گومڕاکەر جیا دەکاتەوە [٢٠٠]

لێرەدا و لەبارەی ئەم هەڵوێستەوە ئێمەش بۆچوونێکمان هەیە کە کۆکەرەوەی تیۆری غەزالیە لە عەقڵ و تێڕوانینی لەبارەی زانستەوە کە دەتوانین بەمشێوەیەی لای خوارەوە کورتی بکەینەوە:

یەقین و دڵنیایی دوو ڕێگەی هەیە:

١ – گروپی تێڕوانینکاران لەزانایان.

٢ – گروپی تێکۆشان و بەربەرەکانێکارانی نەفس و دەروون (مجاهدە النفس) لە صۆفیەکان.

دەرئەنجامی هەردوو تەریقەت و ڕێبازەکە هەریەکێکە، کە ئەویش کەشف و دۆزینەوەی زانراوو دیارە بە کەشف و دۆزینەوەیەك کە هیچ شك و گومانێکی تێدا نامێنێتەوە. ئاگادار بوون و هۆشیاری خودیی لەڕێگەی عەقڵەوە(دۆزینەوەی حەق لەناو نەفس و دەرووندا).

١ – ئاگادار بوونەوە و هۆشیاری لەڕێگەی عەقڵەوە(دۆزینەوەی حەق لەناو نەفس و دەرووندا).

---

[٢٠٠] ئەگەر غەزالی ڕێگەی صۆفیگەری هەڵبژاردووە و لەسەر زمانی صۆفیەکانەوە قسەی کردووە ئەمە مانای ئەوەنیە لە هەموو هەڵوێستەکاندا بەشدارە لەگەڵیاندا، بەڵکو ئەوانیش لەلایەن غەزالیەوە ڕەخنەیان لێگیراوە، هەروەك چۆن ڕەخنەی لە فەیلەسوف و موتەکەلیم و فەقیهەکان گرتووە.

٢ – ئاگاداربوونەوە و هۆشیاری بەهۆی فێربوونەوە(دۆزینەوە و کەشف کردنی حەق بەهۆی گەڕان و پشکنین و هەڵکۆڵینەوە(واتە لەڕێگەی فێر بوون و بەدەستهێنانەوە).

هەردوو تەریقەت و ڕێگەکەش یەك مەرجیان هەیە ئەویش بریتیە لە(غەریزەو ووزەی عەقڵ).

– ڕێگەی دووەم هەندێکجار لەوانەیە بگات بە ڕێگەی یەکەم بەپێی گەشە و پێشکەوتنی عەقڵ.

– غەریزە و ووزەی عەقڵ مەرجی عەقڵگریە واتە دەرککردنی خود بۆ خودی خۆی(واتە بنیاتنانی منی عاریف و زانا).

– من لە قۆناغەکانی مەعریفەدا:

* ڕۆحی هەستیار: (واتە پەیوەندی لەگەڵ هەستەکان کە لە کورپەلە و منداڵی شیرە خۆرەدا هەیە).

* ڕۆحی خەیاڵی: سەلماندنی ئەوەی کە هاتووە لەهەست و هەڵگرتن و کۆگا کردنی لەلای خۆی بۆ ئەوەی نیشانی ڕۆحی عەقڵی بدات ئەمەش لەلای منداڵ بوونی نیە، بەڵکو وورده وورده لەگەڵ گەورە بووندا دەردەکەوێت.

* ڕۆحی عەقڵی: هەستپێکردنی ماناکانی دەرەوەی هەست و خەیاڵە کە دەکاتە گەوهەرو ناوەڕۆکی مرۆڤانەی تایبەت لە هەستکردن بە مەعریفە زەروری و پێویستیە گشتیەکان.

* ڕۆحی فیکری: دانان و بەرهەمهێنان بەپشت بەستن بەزانستە عەقڵیە ڕووتەکان، سروشتیشی بەجۆرێکە کە بەبەردەوامی و بەشێوەیەکی بێ کۆتا کراوەیە.

* ڕۆحی پیرۆزی پێغەمبەرانە(الروح القدس النبوی) ئەمەش تایبەتە بەپێغەمبەران و هەندێك لە ئەولیاکانەوە کە تێیدا نیشانەکانی غەیب دەردەکەون.

ڕۆحی قودسی و پیرۆز ئەو قۆناغە کۆتاییە کە غەزالی باسی کرد بۆمان کە بریتیە لەو شتەی کە لەودا دەردەکەوێت بەڵام لە عەقڵدا دەرناکەوێت بەمانای ڕۆحە فیکری و عەقڵیەکەی. لەم کاتەشدا زەوق ڕوودەدات، کەوابوو زەوق دژی عەقڵ نیە، بەڵکو ڕوویەکە لەڕووەکانی، کە دەکاتە کۆتا خاڵی پێشکەوتنی بە بەدەستهێنان و فێربوون، یان لەلای هەندێك بە تێکۆشان و بەربەرەکانێی نەفس و ڕاهێنان و خۆشە کردنی دەردەکەوێت. غەزالیش ئەهل و گروپی زەوق و ئاقڵەکان بەیەکەوە ڕێزبەندیدەکات و دەڵێت: : (ئەگەر ئاقڵەخاوەن زەوقەکان کۆببنەوە بۆ ئەوەی نەفس لەمانای زەوق تێبگەیەنن بەهیچ شێوەیەك ناتوانن) [٢٠١] واتە ئاقڵە خاوەن زەوقەکان چەند بەش و ژمارەیەکن، وە هەروەها غەزالی هەر لەئێستەوە خۆی بۆ خۆی دەستدەکات بە دامەزراندنی ئەو زانستەی کە لەسەر بەڵگە و صۆفیگەری بنیاتنراوەو لەسەر زەوق وەستاوە، جیاوازی نێوانیشیان تەنها لەپلە و قوڵی و ڕوونیدایە(زانست لەسەرو ئیمان و باوەڕەوەیە و زەوقیش لەسەرو زانستەوەیە، کەواتە زەوق ویژدانە و زانستیش قیاس و پێوانەیە و ئیمانیش قبوڵکردنێکی ڕووتە بەچاولێکەری) [٢٠٢] هەروەك بڵێی ئێمەش لەم ئاستەدا دەتوانین وێنای ئەو خاڵە

---

[٢٠١] مشکاه الانوار لا ١٨٦.

[٢٠٢] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە:

ئایا لەپاش ئەم قسەیەو لەپاش ئەم ڕێکخستنەوە هێشتا دەتوانین بڵێین کە غەزالی ئیمانی بەسەر عەقڵدا سەر خستووە و کەوتووەتە نێو وەهمەوە، بەپشتبەستن بەگومانی دیکارتی چوونکە سەر دەکێشێت بۆ عەقڵ.

تێبینی: ئیبن سینا بە عەقڵ هەستی بە نەفس و دەروون کردووە و زانیویەتی کە ئامێرێکی مەعریفە و مەرجی یەکەم و پێویستیەتی، ئەگەر پشتی بەشەرع ببەستایە ئەوکات حەقیقەتە خودیەکەی بۆ دەردەکەوت وەك غەریڤزەیەکی مرۆیی چوونکە ئەگەڵ لەگەڵ ئەوەی کە غەریزەیشە بەڵام مەرجێکیشە بۆ عەقڵ کە ئامێرێکی

نەگۆڕە بکێشین کە فەلسەفەی غەزالی جەختی لەسەر دەکاتەوە، کاتێك دەڵێم خاڵی جێگیر و نەگۆڕ چوونکە دەستپێك و دەرئەنجامە، هەروەك بڵێی ئەوەڵ و ئاخرو

---

ئیدراکە، یەکەمیان دەبێتە بنیاتنانی صۆفیگەری و دووەمیشیان دەبێتە بنیاتنراوی زانست، کاتێك غەزالی لەبارەی ڕاستیەتی عەقڵەوە دەکەوێتە گومانەوە لەگەڵ ئەوەی کە ئامێرێکی تێگەشتنی زانستەکانە بەلأم توانی لێی دەرباز ببێت، ئەمەو لەکاتێکدایە کە ئیبن سینا نەیتوانی خۆی لێ دەرباز بکات، چززنکە باوەڕی وابوو کە بریتیە لەو بنەڕەتەی کە ناکرێت ببێتە جێگەی گومان بەبێ ڕوونکردنەوەی هۆکارەکان. گومان لەعەقڵی زانستیدا نابێتە هۆی نەریێ کردنی بەڵکو دەبێتە هۆی دامەزراندنی، چوونکە غەزالی دواتر هەست بەو غەریزەیە دەکات کە لەناو ئێمەدا هەیە چوونکە خودا ئاشکرایکردووە تێیدا( ئەوەی کە گومان نەکات بەصیرەتی نیە و نابینێت) ئەگەر غەزالی باوەڕی بەعەقڵی سینیوی هەبوایە ئەوکات دەکەوتە ناو ڕۆلێکەوە کە دەگەڕایەوە بۆ عەقڵ لەپاش شك و گومانەکەی کە بەهۆی عەقڵەوە کردبووی، هەروەك دیکارت. جزانی و ناسکی هەوڵەکەی غەزالی لەوەدا شاردراوەتەوە کە لەم عەقڵەوە تێپەڕیکردووە بەرەو عەقڵێکی گەشاوە و پێشکەوتوو تر، کە دەکاتە غەریزەی خۆمان کە جیهانە ڕۆحانیەکانمان بۆ دەردەخات و خود بەڕووی ڕەهادا دەکرێتەوە بەجۆرێك نە چاو بینیویەتی و نە گوێیشی بیستوویەتی و نە بەدڵی کەسیشدا هاتووە، واتە جیابوونەوەی گشتی لە جیهانی هەست و پەیوەندیکردن بە جیهانی ڕۆحانیەوە. لەم بەشەشدا دەبینین کە ئیبن سینا و فارابی باسی عەقڵی سود لێ وەرگیراو دەکەن، بەلأ باسەکەیان لەباسەکەی غەزالی جیاوازترە چوونکە ڕێگەی کەشف و دۆزینەوە دوانن: ڕێگەی بەدەستهێنان: کە بریتیە لە قۆناغ بەقۆناغی لەنێو عەقڵەکاندا، ئەمەش هاوبەشە لەنێوانیاندا، ڕێگەی تێکۆشان و بەربەرەکانێی نەفس و دەروون: دەرککردن بەغەریزە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە فارابی و ئیبن سینا عەقڵ وەك غەریزەیەکی بەتوانا بەکار دەهێنن کە مەعریفە خودابیەکانی تێدا زۆر ببێت بەبێ هیچ هۆشیاریەك لەبارەیانەوە، چوونکە ئەوان پێیانوایە کە عەقڵی بەدەستهاتوو سود لێوەرگیراو تەنها لەڕێگەی بەدەستهێنانەوە دێتەدی، بەجۆرێك کە فەیزو بەرەکەتە ئیلاهیەکان دەبارێن بەسەر دەرووندا لەپاش ڕزگار بوونی لەجیهانی هەستەکان، لەمەشدا پێغەمبەر ئاراوتە دەکەن( تیۆری پێغەمبەرایەتی لەلای فارابی و ڕۆڵی خەیاڵ تێیدا). بەلأم غەزالی دان دەنێت بەهەردوو ڕێگەکەدا، هەروەك چۆن پێیوایە عەقڵیش غەریزەی هەیە پێش ئەوەی باسی منیەتی بکات چوونکە بەعەقڵ هەست بە منیەتی دەکرێت واتە خود دەرك بەخودی خۆی دەکات، چوونکە ئەم هەستپێکرن و ئیدراکە غەریزیە لە خوددا لەگەڵ بەڵگەکانی تر کە ئیبن سینا لەسەلماندنی خوددا خستنیە ڕوو، لەپاش خۆیشی غەزالی دووبارەی کردنەوە. ئەم ئیدراك و هەستە غەریزیە ئەگەر بگاتە کامڵبوون نوور و ڕووناکی قورئان و شەرعی بەسەردا دەبارێت و ئەوکات عەقڵ دەبێتە بینا و خاوەن بەصیرەت و بەڵگەش لەسەر گەوهەریەت و ناوەڕۆك بەهێزتر دەبێت، چوونکە خۆ تەیارکردن بە وەحی زامنی حەقیقەت و ڕاستیە.( سەیری هەڵوێستی ئەفلاتون بکە لەبارەی وەحی و عەقڵەوە و پەیوەندیان بە مەسەلەی دەروونەوە لەبەشی یەکەمدا).

دیارو نادیارە، مەبەستیشم پێی غەریزەی عەقڵ یان گەوهەرو ناوەڕۆکی نەفس و دەروونە، ئەگەر تێیدا ڕۆبچیت و بەجوانی شەن و کەوی بکەیت ئەوکات لە جیهانی زەوق و فەیزو بەرەکەتی ئیلاهی تێدەگەیت، (صۆفیگەری)، وە ئەگەر وەك ئامێرێکی زانست و مەعریفەکانیش بەکارت هێنا و بەڵگەشت کردە ڕێگە بۆ گەشتن بەزانست ئەوکات لەمەعریفەکاندا دەگەیت بەزەوق، هەروەك بڵێی لەشوێنی خۆت نەجوڵاویت و پەردە و حەقت لەلای غەزالی بۆ لابراوە و ئاشکرا کراوە، کە کۆکردنەوەی نێوان هەردوو بەشەکەیە، واتە بەدەستهێنان و موجاهەدە(بەربەرەکانێی نەفس و دەروون) ئەمەش بە تێکهەڵکێشکردنی هەردوو شێوازەکە لەڕێگەی باسکردنی ئامادەباشی بۆ وەرگرتن و پەیڕەو کردنی هونەری وەرگرتن. یەکەمیان موجاهەدەیە و دووەمیشیان زانستە، بەئەندازەی ئامادەباشی نەفس و دەروون زانستیش بەدەستدەهێنرێت، کە وەك ئامێر یان ڕوویەکە لەڕووەکانی بەربەرەکانێی دەروون(مجاهدة النفس) لە قۆناغی عەقڵی بەدەستهاتوو سود لێ وەرگیراودا لەلای فارابی یان ئیبن سینا کەشف و دۆزینەوە ڕوو دەدات [٢٠٣]، ئیبن سینا دەڵێت: : (ئەوەی پشت دەکاتە توێشووی دوونیا و خۆشیەکانی ناوی لێ دەنرێت خودا پەرست و بەردەوامبوو لەسەر پەرستشەکان لەشەونوێژ و ڕۆژ و شتەکانی تر کە تایبەتن بەناوی خودا پەرستەوە کە بەفیکر دەڕوات بۆ پیرۆزی گەورەیی کە بەردەوام ڕووناکی حەق لەنهێنیەکانی دەکات و ناوی عاریف تایبەت دەبێت پێیەوە) [٢٠٤] هەروەك فارابی دەڵێت: (ڕۆحی پیرۆز هیچ لایەن و ئاراستەیەکی

---

[٢٠٣] ئیبن سینا لە شیفاو نەجات یان لەزۆرێك لە پەیامەکانیدا لەبارەی نەفسەوە کە جیاوازە لەئیبن سینا لە لۆژیکی خۆرهەلاتی و ئامازە و ئاگادار کردنەوەکان، هەربۆیە بەدووری نازانم کە غەزالی کاریگەری ئەم کتێبەی لەسەر بێت زیاتر لە کەسانی تر.

[٢٠٤] الاشارات والتنبیهات لا ١٩٩.

خوارەوە سەرقاڵی ناکات کە ئاگای لە سەرەوەی نەبێت و هەستی دیاری بێئاگای ناکات لەهەستی نادیار....زانیاریەکان لە ڕۆح و فریشتەکانەوە وەردەگرێت بەبێ فێربوون لەخەڵکەوە...) [٢٠٥]

ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ئەوکات غەزالی هەر لە سود وەرگرتنەیەوە لە فەیلەسوفانی ئیسلام و ئەزموونە خودیەکانی و بەتایبەت شك و صۆفیگەری، ئەوکات هەستی بە هەرسێ قۆناغی هۆشیاری کردووە، مەبەستیشم هۆشیاریە لەبارەی خودەوە لەرێگەی خود و هۆشیاری لەبارەی خودەوە، لەرێگەی مەعریفە و زانستەکان واتە لەرێگەی دروستکردنی پەیوەندیەك لەنێوان خود و جیهاندا و لەکۆتایشدا هۆشیاری سەبارەت بە ڕەها بەجۆرێك کە خود لەخود بوونی خۆی تێپەڕ دەکات و لەجەستەی خۆی و جەستەی جیهانیش دەچێتە دەرەوە بۆ ئەوەی هەست بەڕووناکی و نوورە ئیلاهی و حەقیقەتەکان بکات، بەئەندازەی گەشتنی پەردەی لەبەردەمدا لادەبرێت. بۆ بەدیهێنانی ئەم بەرز بوونەوە و کامڵبوونە غەزالی جیاکاریدەکات لەنێوان تێڕوانین و کرداردا(تیۆرو پراکتیك) وە هەروەها پێویستە لەحەقیقەت و ڕاستی تێڕوانین و تیۆر تێبگەین ئەوکات حەقیقەتی کردار بزانین.

---

[٢٠٥] الثمرة المرضية في بعض رسائل الفارابية لا ٧٥. عن كتاب( في الفلسفة الاسلامية) ابراهيم مذكور ب ١ لا ٤١ الى ١٥.

# بەشی چوارەم

# بەهای عەقڵ / کردار( پراکتیک )

## ١ – پێناسە و سنوری عەقڵی کرداری:

قسە کردن لەبارەی عەقڵی کرداری و عەقڵ بەگشتی گرنگیەکی گەورەی هەیە لە فەلسەفەی غەزالیدا چوونکە ئەم قسەیە لە دوو ڕوەوە دیاریدەکرێت: لەڕووی یەکەمەوە عەقڵی کرداری تێدا دیاریدەکرێت لەڕووی پەیوەندی بەجەستەوە، لەڕووی دووەمیشەوە: عەقڵی کرداری لەڕێگەی پەیوەندیەوە لەگەڵ عەقڵی تیۆری دیاریدەکرێت. ئەم دوو ڕوانگەیە دوو سنوری بنەڕەتی کەشف دەکەن و دەدۆزنەوە کە سنورو پێناسەی ئیستمولوجی و ئەکیسیولوجیە، وە هەروەها لەنێوان ئەم دوو پێناسە و سنورەشدا پەیوەندیەکی نەپچڕاوو بەردەوام هەیە [٢٠٦] کە دەتوانین بەپەیوەندی جەدەلی پێناسەی بکەین.

---

[٢٠٦] قورسی فیکر و واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەم سەردەمەی ئێمەدا لەجیا کردنەوەی بەبەرشتیی نێوان هەرلوولای بەها و عەقڵدا خۆی دەبینێتەوە، بەبیانوی بانگەشەی لێکۆڵینەوەی بابەتی و بێلایەنانە. ئەم دیاردەیە پرسیار گەلێکی مەترسیدا دەوورووژێنێت لەبەردەم واقیعی هاوچەرخدا کە خۆی لە گێڕانەوەی پەیوەندی سروشتی

بەلأم پێناسەی ئیبستمولوجی لە بەشداری عەقڵی کرداری لە بنیاتنانی مەعریفە و زانستدا خۆی دەبینێتەوە ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە عەقڵی کرداری وەزیرو خزمەتکاری عەقڵی تیۆریە، چوونکە لەڕێگەی هەستەکانەوە بنەماکانی ئەو زانستانەی کە حەقیقەتی شتەکانیان لێوە دەردەهێنرێت پێی دەگەیەنێت بەهاوکاری خزمەتگوزاریەکانی وەهم و خەیاڵ و هێزەکانی تری جەستە واتە ئەو هێزە حەیوانیانەی کە لە مرۆڤدا بوونیان هەیە، هەروەك لەبەشەکانی پێشوودا ڕوونمانکردەوە، مەعریفە لەلای غەزالی لەسەر بەدەستهێنان و فێربوون وەستاوە لەڕێگەی پەیوەندی بەهێزی نێوان عەقڵی تیۆری کە خودێکی عاریف و زانایە لەگەڵ جەستەدا، ئەم پەیوەندیەش مەعریفەیەك بەدەستدەهێنێت کە وردە وردە بەرەو پێشەوە دەچێت تا دەگاتە بەرزترینی پلەکان [٢٠٧]، چوونکە عەقڵ لەم پەیوەندیە جیا دەبێتەوە(بەلأم کاتێك نەفس کامڵ و بەهێز بوو ئەوکات خۆی بەتەنها کارەکانی دەکات و هێزە خەیاڵی و هەستیەکان و هێزەکانی تری جەستە ناتوانن ڕێگری لێ بکەن، بەڵکو سەرقاڵیش دەبن پێیەوە، نمونەی ئەمەش ئەوەیە کە مرۆڤ پێویستی بە وولأخ و ئامێرو هۆکار گەلێك هەیە بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە بگاتە جێگەی مەبەست، کاتێك نزیکبوو کە بگاتە جێ بەلأم یەکێك لەوهۆکارانەی کە بەهۆیەوە گەشتبوو بوویە ڕێگر و نەیهێشت بگات، ئەوکات هۆکارە گەیەنەرەکە خۆی بۆ خۆی دەبێتە بەربەست لەبەردەم گەشتنەکەیدا) [٢٠٨].

---

نێوان هەردوو ڕووەکەدا دەبینێتەوە. باسکردنی خراپەی زانست و تەکنۆلۆجیا بریتیە لەباسکردنی لایەنی نەرێنی دامو دەزگا کۆمەلأیەتی و سیاسی و ئابوریەکان، چوونکە هەموو واقیعێك فیکرێك دروستدەکات بەلأم ئایا دەکرێت جارێکی تر ئاگاداری ئەم دیاردەیە بین و واقیعی هاوچەرخ ڕزگار بکەین لەو کێبەرکێ ڕووخێنەرو کارەساتانەی کە دێن و ناشتوانرێت ڕێگەیان لێ بگیرێت.

[٢٠٧] سەیری بەشی دووەم و سێیەمی ئەم کتێبە بکە.

[٢٠٨] معارج القدس لا ١٠٢ لەگەڵ لا ٦٣ – ٦٤.

ئەم جیابوونەوەیەش مانای ئەوەیە کە عەقڵی کرداری بەتەواوەتی ملی بۆ عەقڵی تیۆری کەچ کردووە، واتە نەفس و دەروون بەڕاستی ئازاد بووە، ئەوکات دەتوانین بەمرۆڤ بڵێین ئازادی حەقیقی نەك مەجازی، زانستیش لەسەر بنەمایەکی ئەزموونی دەبێت و تەنها مەبەست و ئامانجیشی هەستپێکردنی جیهانی مەلەکوتە، کاتێکیش هەست و دەرکی کرد ئەوکات ئەوە دەبێتە زانست و ئەزموونەکەی.

بەڵام پێناسە و سنوری ئکسیولوجی خۆی لە فەراهەم بوونی مەرجە یەکەمینەکاندا دەبینێتەوە کە زانست دەکاتە گونجا و(کەواتە کردار یارمەتیدەرە بۆ گەشتن پێی) واتە بەزانست [٢٠٩]، چوونکە عەقڵی کرداری ئەرکی ڕێکخستنی جەستە دەگرێتە ئەستۆ، بەڵام بەهۆیەوە بنەمای زانستەکان وەرناگرێت بۆ ئەوەی سیفەتە پەستەکانی بسرێتەوە کە بوونەتە بەربەست لەبەر دەم گەشە و پێشکەوتن و بەرەو پلەی باڵاچوونی عەقڵی تیۆریدا لە(ڕێچکە و شوێنە پیرۆزەکانی بەرز بوونەوە "معارج القدس" دا(کارو کردار واتە شکاندنی هەواو ئارەزووەکان بەئاراستە کردنی نەفس و دەروون بەرەو چاکە و لایەنی باڵای ئیلاهی بۆ ئەوەی شێوازە پیسەکانی دەروون و شتە هەڵواسراوەکان پێیەوە بسرێتەوە کە لکاون بەلایەنە پەستەکەیەوە، کاتێك ئەم شتە پیس و لکاوە ناپەسەندانە لابران یان لاوازکران ئەوکات بەرەو تێڕوانین دەڕوات لە حەقیقەتە ئیلاهیەکان و لەلایەن خوداشەوە بەرەکەتی ئەم شتە بەرێزانەی بەسەردا دەبارێت هەروەك چۆن بەسەر پێغەمبەران و پیاوچاکان و ڕاستگۆیاندا باریون) [٢١٠].

---

[٢٠٩] میزان العمل لا ١٦.

[٢١٠] میزان العمل لا ٢٨ — ٢٩.

کرداریش بەم مانایە بریتیەی لە پاکیەتی پاکیەتیش مەرجی ئەم کامڵبوونەیە [٢١١] واتە کردار دەگەڕێتەوە بۆ دژایەتیکردن و تێکۆشانی نەفس و دەروون بەلابردنی ئەوەی کە پێویست نیە [٢١٢] کە بەدیهاتنی فەزیلەت و بنیاتنانی ئەخلاق بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

لەڕێگەی ئەم دوو پێناسەیەوە(ئیبستمولوجی و ئکسیولوجی) تێبینی ئاستی ئەو پەیوەندیە دەکەین کە لەنێوان زانست و کرداردا هەیە کە هەریەکەیان مەرجە بۆ هاتنەدی ئەویتریان و حاڵی هەریەکەیان چ بە ئەرێنی و چ بەنەرێنی کاریگەرە لەویتردا، ئەمەش مانای ئەوەیە کە زانست بوونی پەیوەندی وورد لەنێوان خود و جەستەدا بەمەرج دەگرێت هەروەك پێشتر باسکرا، بێگومان ئەو هەست و ئیدراکە بەهۆی زانینی چەند لایەنێکی ووردەوە هەرەشەی لەسەرە و لەوانەیە زاڵبن بەسەریدا و مەعریفەکەی لە ئاستی عەقڵگر ببەنە دەرەوە و تۆمەتبار بێت بە هەواو ئارەزوو واتە لایەنی ناعەقڵی، ئەوکات عەقڵ چۆن دەتوانێت پارێزگاری لە مەعقولیەتەکەی بکات لەمەعریفە و ڕاستیەتی و یەقین و دڵنیاییەکەی لە بنیاتنانی زانست بەبێ ئەوەی بکەوێتە تەڵەی نامەعقولی غەریزەکانەوە؟

ئەوەی کە زاڵە بەسەر مەعریفەدا یان لەڕووی خودەوەیە، یان لەڕووی جەستەوەیە. ئەگەر لەڕووی خودەوە بێت ئەوا غەزالی لەکتێبی معیار العلم دا مەرجەکانی یەقین و ڕێگەکانی وەدیهاتن و لێکۆڵینەوەی خستووەتە ڕوو. بەڵام ئەگەر لەڕووی جەستەوە بێت ئەوا غەزالی کتێبی میزان العملی بەم ئامانجەوە داناوە. شارەزایی لە دەروون بابەتی سەرەکی کتێبی میزان العملە چوونکە غەزالی

---

[٢١١] میزان العمل لا ٣٠.

[٢١٢] میزان العمل لا ٢٩.

لەڕێگەی بابەت و شوێنەکانیەوە زانستی کرداری پێناسە کردووە کە دەکاتە زانستی دەروون بە سیفەت و ئەخلاق و زانست و زانیاری لەبارەی چۆنیەتی ژیان و هەڵسووکەوت کردن لەگەڵ ماڵ و منداڵ و خێزاندا و زانستی سیاسەت و بەڕێوەبردنی خەڵکی وولات و ناوچەکان، گرنگترینی ئەم زانستانەش ئەوانەن کە تایبەتن بە پاککردنەوە و پاڵفتە کردنی دڵ و دەروون و سیاسەتی بەدەن و جەستە و ڕەچاوکردن و پەیڕەوکردنی داد پەروەری [٢١٣].

## ٢ — ڕۆڵی کردار لە دروستکردنی هۆشیاریدا:

ئێستە بەدڵنیاییەوە زانیمان کە جەستە بکەرێکی کارایە لە بنیاتنانی مەعریفەدا لەڕێگەی پەیوەندیەوە بەخود و ئەوەشمان زانی کە پێوەری زانست(معيار العلم) پێویستە بۆ بنیاتنانی یەقین و دڵنیایی، وەهەروەها خودیش دەبێت هۆشیاریەکی تەواوی هەبێت لەبارەی حەقیقەتی ئیدراك و یاساو ڕێساکانی و ئەوەشمان زانی کە پێوەری زانست بەس نیە بۆ زامنکردن و گرنتیکردنی هۆشیاری ڕاستەقینە لەبارەی جیهانەوە، چوونکە وەهمەکان لەسەر شێوەی یەقین و دڵنیایی دەردەکەون و بەبێ هۆشیاری و ئاگاداری خود دەچنە ناو هەست و ئیدراکەوە، واتە لێرەدا هێزێکی قوڵ هەیە لەدەروونی مرۆڤدا کە جلوبەرگی عەقڵ لەبەر دەکات و وەك ئەو دەردەکەوێت و تەنانەت پێشەنگی جوڵەکانی خودیش دەکات و لەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا ناشیرینی دەکات. غەزالی ئەم دیاردەیە ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: : (نمونەی دەروونی مرۆڤ لەبەدەن و لاشەیدا وەك فەرمانڕەوایەك وایە لەشارو وولاتەکەیدا، هێزو ئەندامەکانی تری خزمەتکاری جەستەکەن و وەك پیشەگەر و کریکارەکانن،

---

[٢١٣] ميزان العمل لا ٣٧.

هێزی عەقڵی بیرکەرەوەش وەك ڕاوێژکاری زیرەك و وەزیری ئاقڵە، هەواو ئارەزووەکەشی وەك بەندەیەکی خراپە کە شتومەك و خۆراکی بۆ دەهێنێت، ڕجێم کردنەکەشی وەك بەرپرسی پۆلیس وایە، ئەو بەندەیەش کە خراپە دەهێنێت فێڵبازو خەڵەتێنەر و ئاوەژوکارە و خۆی وەك ئامۆژگاریکەر نیشاندەدات کە لەژێر ئامۆژگاریەکانیدا دەردی خراپە و پەستی هەیە خولیاو ئاواتیشی کێبەرکێیە لەگەڵ وەزیردا لەکاروبارەکانیدا و بۆ یەك کاتژمێریش لە کێبەرکێکردن لەگەڵیدا واز ناهێنێت و بێئاگا نابێت) [٢١٤].

بەڕوونی تێبینی ئەوە دەکەین کە خود کرداری هەست و ئیدراکی بۆ دێتەدی بەپشتبەستن بە هێزی بیرکردنەوەی جەستەیی کە وەك وەزیرێکی ئامۆژگاریکەری ئاقڵە، هەرچەندە ئەم هەست و ئیدراکە جەستەییەهەمیشە ڕاستەقینە نیە چوونکە هەست و ئیدراکێکی تر هەیە کە هێزی هەواوئارەزوو پێشی دەکەوێت کە ئیدراك و هەستێکە هێزی بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی کاروباەکان و ئامۆژگاریکردنی هەیە و دەستدرێژی دەکاتە سەر هێزی بیرکردنەوە و دەستی بەسەردا دەگرێت و خود گومڕادەکات و دەکەوێتە ناو وەهمەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەخود بەبەردەوامی گەورە و فەرمانڕەوا نیە لەحوکم و کردارەکانیدا چوونکە کێبەرکێکاری هەیە لەو سەرکردایەتیەدا مەبەستیشمان هێزی جەستەیە لەڕووی ئەوەی کە ئارەزوو غەریزەیە، هەروەك بڵێی غەریزە ئیدراك و هەستێکی ترە کە دژایەتی هەستی عەقڵی دەکات و دەسەڵاتی هەیە بەسەریدا، بەڵکو هەندێکجاریش هەیە کە خود گونجاوە لەگەڵ پشتەوەی هەستی ناخیەوە واتە ئەو هەستەی کە لەناخی مرۆڤەوە

---

[٢١٤] میزان العمل لا ٣٩. تێبینی بکە و بزانە کە هێزەکانی هەواو ئارەزوو ڕێکخراون و کێبەرکێی عەقڵ دەکەن لە بۆچوون و بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی کاروبارەکانیدا.

هەڵقوڵاوە [٢١٥]. چوونکە هەواوو ئارەزوو زاڵدەبێت بەسەر هێزی بیرکەرەوەدا و هەمان کاری ئەو دەکات.

ئەگەر هۆشیاری مرۆڤ بۆ جیهان بەم هۆشیاریە ناخیە هەڵقوڵاوە لە هێزەکانی جەستەوە بەتایبەت ئارەزوو لەزەت دەورەدراوە، ئەوکات ئەم هۆشیاریە ناتوانێت ببێتە سەرچاوەی یەقین و دڵنیایی، تەنانەت ئەگەر بە پێوەری زانستیش(معیار العلم) تەیار بکرێت، دواتریش پێویستی(میزان العمل) بە پێوەری زانست(معیار العلم) واتە سود وەرگرتن لێی ڕووناداات مەگەر نەفس لەم هۆشیاریە ناخیە فێڵبازە خەڵەتێنەرە بپارێزین، ئەمەش بەهۆی پێوەری کردارەوە(میزان العمل) واتە غەزالی هەرچەندە ئاگاداری ئەوەبووە کە ئەم هۆشیاریە بە وەهم دەورە دراوە و هەڕەشەی دەستێوەردانی هەواو ئارەزووەکانی لەسەرە، چوونکە ئارەزووەکان وەك ئاقڵ دەردەکەون بەڵام عەقڵگریان دژە لەگەڵ عەقڵگری خوددا بەوەی کە عەقڵێکی هاوشێوەییە کاتێك مەسەلەکە بەمجۆرە بوو ئەوکات دەبێت ڕێگەیەك هەبێت کە هەست و هۆشیاری مرۆڤ تەواو بێت و لەسەر بنەمای یەقین و دڵنیایی بێت و وەهمی تێکەڵ نەبێت، ئەم ڕێگەیەش دروستنابێت مەگەر ئەو کاتە نەبێت کە عەبد و بەندە بکرێتە ژێردەستە و بەڕێوەبراو فەرمان بەسەردا کراو نەك فەرمانکەر، هۆکاری بەدیهێنانی ئەمەش لەسێ شت بەدەر نیە: یارمەتی وەرگرتن لەعەقڵ تەمبێ کردنی غەریزەی توڕەیی، سەرکوتکردنی ئارەزوو و تۆراندنی.

عەقڵگری و تەمبێ کردن و سەرکوتکردن بریتین لەو هۆکارانەی کە غەزالی پێشنیاریاندەکات بۆ ئەوەی دەروون و نەفسی مرۆیی هەست بەخودی و خۆیی و

---

[٢١٥] تێبینی بکە و ببینە کە هێزی هەواوئارەزوو لە هێزە جوڵێنەر و بەدیهێنەرەکانن، چوونکە دەبێتە هۆی جوڵاندنێك نزیکی دەکاتەوە لەو شتانەی کە خاوەنەکەی باوەڕی پێیانە، پێویست بن یان بەسود بەمەبەستی بەدەستهێنانی خۆشی و لەزەت.( میزان العمل لا ١٨).

جیهانی دەوروبەریشی بکات، بەبێ ئەوەی بکەوێتە نێو وەهمی ئارەزوو لەزەت و خۆشیەوە، واتە هێزەکانی جەستە. ئەم هۆکارانەن کە غەزالی ناوینراون کرداری بەربەرکانێ و تێکۆشانی دەروون و نەفس(مجاهدە النفس) کە مانای ئەوەیە عەقڵگری و تەمبێ کردن تەنها بە سەرکوتکردنی هەواوو ئارەزو دێتەدی.

ئەم باب و بەشەی کە غەزالی دەیوروژێنێت و بەشی زۆری کتێبەکەی بۆ تەرخاندەکات، دەمانخاتە بەردەم مەسەلەیەکی زۆر گرنگ کە مێژووی فەلسەفەی نوێ لە خۆرئاوادا بەخۆیەوە بینیویەتی هەر لەکاتی بنیاتنانی خود لەگەڵ دیکارتدا تاوەکو لابردن و لەکارلادانی خود لە پلەو پایەکەی بەباس و بابەتە فرۆیدیەکان کە لەسەر زمانی فرۆید بنیاتنران و پێی وابوو کە(من تەنانەت لەنێو ماڵەکەی خۆیشیدا گەورەو باڵادەست نیە) [٢١٦] وەهەروەها ئەم باسانەی فرۆید جەختیش لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە دیاردە دەروونیەکان بەشێوەیەکی فراوان و گەورە ملکەچبوون بۆ دیاردە جەستەییەکان و بەپێچەوانەوە کاریگەریەکی زۆرو تەواوی لەسەریان دەبێت [٢١٧]. ئامانجی لێکۆڵینەوە و شیکاری دەروونیش خۆی لە(وەرگێڕانی ڕێڕەوە ناهۆشیارەکان بۆ ڕێڕەوە هۆشیارەکان دەبینێتەوە بۆ ئەوەی بەمشێوەیە کون و کەلەبەرەکانی هەست و ئیدراکی هۆشیارمان پڕ بکاتەوە و بیانگرێت) [٢١٨]. چوونکە هۆشیاری بەردەوام وەك تاکە ڕووناکی و نوور دەمێنێتەوە کە لێماندەدات و لەنێو تاریکیەکانی ژیانی نەفسی و دەروونیدا ڕێنمایی و ڕێ نیشاندەریمان دەکات [٢١٩].

---

[٢١٦] مقدمە للتحلیل النفسی لا ٢٦٦ – ٢٦٧.

[٢١٧] مختصر فی التحلیل النفسی لا ١٩ – ٢٠.

[٢١٨] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

[٢١٩] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

کارەکانی فرۆید ئاراستەی کون و کەلەبەرەکانی هەستی هۆشیاری ئێمە کرابوون کە لە شۆڕشی نوێگەرەیەوە لەگەڵ کوجیتودا دەستکرا بەدامەزراندنی، واتە فەلسەفەی نوێی خود کون و کەلەبەر گەلێکن کە شیکاری دەروونی ئەرکی دۆزینەوە و کەشفکردن و تێپەڕینی گرتووەتە ئەستۆ، ئەوشتەی کە بول ڕیکۆی والێکرد کە باوەڕی وابێت(بەیەککەشتن بە شیکاری دەروونی لەرزەیەکی زۆر گەورە دروستدەکات بۆ ئەوانەی کە لەنێو فینومینولوجیا و فەلسەفەی بوونی(الوجودی) و لەنێو نوێگەری لێکۆڵینەوەکانی هیگڵ و بابەت و لێکۆڵینەوەی خاوەن نەزعە مرۆییەکاندان، چوونکە مەسەلەکە پەیوەندی بە دەستبردن و زیانگەیاندنەوە نیە بۆ ئەم بابەتە یان هەربابەتێکی تری بابەتە فیکریە فەلسفیەکان و چاو خشاندنەوە پێیاندا، بەڵکو هەموو پرۆژەی فەلسەفی لەمەدا بەئامانج دەگیرێت، چوونکە فەیلەسوفی هاوچەرخ دەگات بەفرۆید و زۆر دووریش نیە لەنیچەو مارکسەوە هەرسێکیان لەبەردەمیدا دەوەستن وەك پێشەنگانی گومان و کەشفکارو لادەرانی دەمامکەکان، دواتر کێشەیەکی نوێ سەر هەڵدەدات کە بریتیە لە کێشەی بێمانایی و گاڵتەجاڕی هۆشیاری و کێشەی هۆشیاری وەك ئەوەی کە شتێکی بێماناو گاڵتەجاڕیە[٢٢٠].

لەوەی کە ڕابورد تێبینی دەکەین کە هۆشیاری پەیوەستە بەجەستەوە، وە هەروەها دەبێت کون و کەلەبەرەکانی ئەم هۆشیاریە و کردارە ناهۆشیارەکانی تێدا ئاشکرا بکرێت، شیکاری دەروونیش ئەوەیە کە شیکاری ئەم مەعریفەیە لەئەستۆ دەگرێت و لەپشتیەوە خود هەیە بۆ دۆزینەوەی ئەو ناهۆشیاریەی کە تێیدایە،

---

[٢٢٠] بول ریکو( سجال التأویلات) لا ١٦١ – ١٦٢.

هەربۆیە فرۆید لە پیاوە هەڵکەوتوو پێشەنگەکانی گومانە، بەڵام ئایا شیاوە کە فەلسەفەی خود و مەعریفە بەگشتی لەلای غەزالی ملکەچیبکەیت بۆ ئەم ڕەخنەیە؟

بەدوادا چوونمان بۆ تیۆری مەعریفە لەلای ئیمامی غەزالی بەڕوونی دیارە کە دامەزراندنی زانست لەسەر ڕێزگرتنی پێوەری زانست وەستاوە لەپاش فەراهەمبوونی مەرجەکانی کردار لەڕێگەی ملکەچکردنیەوە بۆ پێوانە و کێشانەکەی ئەوکات بەلای ئەوەوە مەعریفە وەك دەرئەنجامی کرداری موجاهەدەو کەشف و دۆزینەوەیە، هیچ دۆزینەوەیەکیش پێی ناگوترێت کەشف و دۆزینەوە تاوەکو موجاهەدەیەك نەبێت، ئامانج و مەبەستی موجاهەدە و تێکۆشانی نەفس و دەروونیش بریتیە لە بنیاتنانی خود بەشێوەیەك کە خاڵی بێت لە کون و کەلەبەر کە لەوانەیە هەستەکەی تێکبدات، کاتێك تیۆرەکانی مەعریفە لەلای فەیلەسوفانی هۆشیاری وەك دیکارت یان ئەوانیتریش شوێنێکی بۆ موجاهەدەی نەفس نەهێشتووەتەوە ئەوکات کەوتنیان بۆ ناو کون و کەلەبەرەکان شتێکی دڵنیایە چوونکە خود ناتوانێت خۆی لە کاریگەری ناهۆشیاری بپارێزێت وەهەروەها شیکاری دەروونی گرنگیەکی زۆر گەورەی هەیە بۆ پاککردنەوەی ئەم تیۆرانە لەو کون و کەلەبەرانەی کە تێی بوون.

فەلسەفەی غەزالی هەرچەندە فەلسەفەیەکە لەسەر بنەمای هۆشیاری لەبارەی خودەوە وەستاوە، بەڵام لەسەر هێڵ و ئاراستەیەکی پێچەوانەی فەلسەفەکانی هۆشیاری کلاسیکەوە دەڕوات، چوونکە غەزالی دەوری خودی بە موجاهەدەیەکی پێویستداوە، چوونکە باوەڕی بەبوونی هێزێکی ناخی کاریگەر هەیە لەخود و ناشیرینکەری مەعریفەدا، کەواتە لەسەر زانا پێوستە کە موجاهەدە بکات وەك هەنگاوێکی پێشوەختە پێش دامەزراندنی زانست، بەمشێوەیە وا دەردەکەوێت کە

فەلسەفەی هۆشیاری لەلای غەزالی هەر دەڵێی ڕزگاری بووە لەڕەخنەی فرۆیدی، چوونکە ئەوەی کە فرۆید ئەیەوێت بیهێنێتەدی هەمان ئەو شتەیە کە غەزالی لەسەرەتاوە وویستویەتی خۆی لێ دەرباز بکات هەروەك بڵێی غەزالی شیکاریەك بۆ نەفس و دەروندەکات لەیەکەم هەنگاویدا بەرەو زانست و یەقین، ئەمە لەکاتێکدا فرۆیدیەت شیکاری نەفسی لەپاش دامەزراندنی مەعریفەوە دا مەزراندووە.

ئەوەی غەزالی پێیوایە کە پێویستە عەقڵ وەك غەریزەیەك کەشف بکرێت و عەقڵ وەك زانست یان ئامێرێك بۆ زانست کە دەورەدراوە بەو مەرجانەی کە لە کەوتنەناو هەڵە(معیار العلم) و کەوتنە ناو لێکچووی زانست و وەهمەوە(میزان العمل) وە دەیپارێزن، هەربۆیە غەزالی ئەو زانستە بنیات دەنێت کە زانراوی تێدا ئاشکرا دەکرێت و دەدۆزرێتەوە کە هیچ شك و گومانێك هەڵناگرێت، یەقینی ڕەها لەلای ئیمامی غەزالی ناکرێت لەلایەن فەیلەسوفانی گومانەوە دژایەتی بکرێت، لەوانەش شیکاری دەروونی فرۆیدی [٢٢١]، چوونکە ئەو پەیوەندیە جەدەلیەی کەلەنێوان عەقڵی تیۆری و عەقڵی کرداریدا هەیە هاتوو چۆ لەنێوانیاندا ئاساندەکات و دەبێتە ئامێرێکیش کە نەفس لەوەهم دەپارێزێت، بۆ ڕێزگرتن لەمە پێویستە شیکاری ناوەڕۆکی زانستی کرداری بکەین لەپاش ئەوەی کە لێکۆڵینەوە و شیکاری سروشتی زانستی تیۆریمانکرد.

[٢٢١] میزان العمل – ل ٣٦.

# بەشی یەکەم

## زانستی کرداری چییە؟

زانستی کرداری هەرچەندە زانستە بەڵام ڕێزی کردار بەلای ئەوەوە بەگەورەیی دەمێنێتەوە، چوونکە ئەم زانستە داواکراوە لەبەر کردار نەك لەبەر خودی خۆی، ئەو ئامێرێکە و ئەوەی کە بۆ غەیری خۆی مەبەستە مەحاڵە کە بەڕێزتر بێت لەم[٢٢٢]. غەزالی زانستی کرداری دەکات بە سێ زانستەوە: زانستی دەروون بەسیفەت و ئەخلاقەکانیەوە کە دەکاتە ڕیازەت و موجاهەدە و دژایەتی هەواو ئارەزوو، زانستی دەروون سەبارەت بەچۆنیەتی ژیان و گوزەران لەگەڵ ماڵ و خێزان و منداڵ و

---

[٢٢٢] شتێکی زۆر پێویستە کە چاو بخشێنرێتەوە بەگرنگی صۆفیگەری ڕۆڵەکەیدا لە دروستکردنی زانست وە هەروەها چاو خشاندنەوە بە کێشەی بابەتی بووندا چوونکە بابەتی بوون بەردەوام جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دڵنیایی ناگاتە ئاستی ڕاستیەتی ڕاستەقینە، چوونکە یەقینێکی لەنێو کۆمەڵەیەکی گریمان و ئامێرەکانی بیرکردنەوەدایە واتە دڵنیاییەکە کە لە پەیوەندیەناڕاستەوخۆ بەبابەتەکەوە دروستبووە.

خود / ئامێرەکان تێڕوانین: بابەت: مەعریفەیەکی بابەتی = یەقینێکی بابەتی.

خود / بابەت: مەعریفەیەکی ڕاستەوخۆ = یەقینێکی بابەتی.

خزمەتکارو بەندەکاندا، زانستی سیاسەتی خەڵکی وولآت و ناوچە. ئەم زانستانە سەرەڕای چەند بەشیان پارێزگاری دەکەن لە گرنگی زانستی یەکەم کە تایبەتە بەنەفس و دەروون و سیفەتەکانیەوە، بەمشێوەیە غەزالی لەقسەکانیدا لەبارەی زانستی کرداریەوە بنەماکانی ئەم زانستە دەگێڕێتەوە بۆ زانستی دەروونناسی، بەڵام ئایا جیاوازی چیە لەنێوان زانست و دەروون وەك زانستێکی کرداری و زانستی دەروون وەك زانستێکی تیۆری؟

لەبەشی یەکەمدا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە چۆن غەزالی نەفس دەسەلمێنێت و دەیکاتە بنەمایەکی تیۆری بۆ زانست لەبارەی خودا و سیفەت و فریشتە و زانستەتیۆریەکانی ترەوە، ئەوەتا دەبینین غەزالی لەزانستە کرداریەکاندا مەعریفەی نەفس و سیفەتەکانی دەکاتە بناغەی زانستەکرداریەکانی تر. جیاوازیش لەنێوان ئەم دوو تێگەشتنەدا بریتیە لەوەی کە یەکەمیان پەیوەندی بە لێکۆڵینەوە تیۆری و بیر کردنەوەکانەوە هەیە بە هەردوو بەشی عەقڵی و صۆفیگەریەکەیەوە، لێرەدایە کە غەزالی دەبێتە فەیلەسوفێکی تیۆری و بیرکردنەوەیی، دووەمیشیان پەیوەندی بە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوە زانستیەکانەوە هەیە کە خاوەنی لایەنی ئەزموونی واقیعین، واتە لەسەر تێبینیە واقیعی و مەیدانیەکان وەستاون ئیتر بۆ زانینی حەقیقەتی هەموو دیاردەکان بێت یان بۆ کەشف و ئاشکراکردنی نەخۆشیەکانی بێت و چۆنیەتی چارەسەر کردنیان. لێرەدایە کە غەزالی دەبێتە زانایەکی دەروونزانی شارەزا بە هەموو هێزەکانی و بەتوانا بەسەر یەکسان و نا یەکسانیدا و تەنانەت دەبێتە پەیڕەوکارێکی کاری لێکۆڵینەوەی دەروونی کە توانای ئەوەی هەیە بچێتە قوڵایی نەفسەوە و حەقیقەتی سلوك و هەڵسووکەوتەکان و پاڵنەرەکان و کاردانەوەکان و وویست و پیویستیەکان و حەزەکان و شتەکانی تر بدۆزێتەوە...

ئەم لایەنەی باسەکە لەلای ئیمامی غەزالی لەلایەن لێکۆڵەرەوەکانەوە گرنگیەکی ئەوتۆی پێنەدراوە چوونکە وەك ئەو لایەنە سەیریانکردووە کە سەر بەباس و لێکۆڵینەوە ئەخلاقیەکان یان صۆفیگەریەکان بێت، بەڵام ئەخلاق لەلای ئیمامی غەزالی تێگەشتنەکەی تەنها تیۆری نیە، بەڵکو غەزالی لەم ئاستەش تێپەڕیکردووە و هەوڵیداوە کە لەئەخلاق بابەتێکی گونجاو بۆ شیکاری و کەشف و دۆزینەوە لە یاسا دەروونیەکانی دروستبکات، چوونکە ئەخلاق تەنها هەڵسووکەوتە هەڵسووکەوتیش تەنها دیاردەیەکە کە هۆکار گەلێك حوکمی دەکەن و ناسینەوەیان گونجاوە و کۆمەڵێك یاسای ڕێکخراو نین بۆ هەڵسووکەوت وەك هەڵسووکەوتی باش و هەڵسووکەوتی خراپ، گرنگیدان بەئەخلاق تەنها لەبەر خۆی نیە بەڵکو بۆ شیکاری سروشتی کردارەکانە، هەروەك غەزالی خۆی دەڵێت: (کردارەکان دەرئەنجامی ئەخلاق و ڕەوشتەکانن هەروەك چۆن کەوتنە خوارەوە لەبەرزاییەکەوە بەهۆی قورسی سروشتیەوەیە) [٢٢٣].

لەکۆتایشدا سروشتی کارەکان دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی فیکرو بیرکردنەوە (بیرکردنەوەش لەنێوان ئارەزوو عەقڵدایە، ئەگەر عەقڵ خزمەتی بکات ئەوا بەرز دەبێتەوە و ڕێز پەیدا دەکات و چاکەکان لەدایکدەبن، وە ئەگەر بەرەو لای خراپە بڕوات ئەوا بەرەو خوار دەچێت و پلەی نزم دەبێتەوە و خراپەکان لەدایکدەبن [٢٢٤].

ئەم قسەیەش جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئێمە باوەڕمان پێیەتی کە فیکرە بەهەمیشەیی دەرئەنجامی عەقڵ نیە بەڵکو هەواو ئارەزووش دەتوانێت کە فیکرە بەرهەم بهێنێت، ئەم نێوەند بوونەی هەواوو ئارەزوو عەقڵە کەگەوهەر و ناوەڕۆکی

---

[٢٢٣] میزان العمل لا ٤٥.

[٢٢٤] میزان العمل لا ٤٥.

هەڵسووکەوتی مرۆڤ و دیار ترین جوڵێنەرەکانیمان بۆ دەردەخات، وەهەروەها ناتوانین لەهەڵسووکەوت تێبگەین بەبێ ئەوەی بەباشی لە سروشتی عەقڵ و سروشتی هەواو ئارەزوو تێبگەین ئەگەر لەحەقیقەتی ئەم دوو هێزە تێگەشتین دەتوانین لەسروشتی ئەو هاتووچۆیە تێبگەین کە فیکرەی پێ وەسفدار دەکرێت وەك حاڵەتێکی زاڵ، وەهەروەها دەتوانین لەقوڵایی ئەم پرۆژەیە تێبگەین کە غەزالی ئەیەوێت لەناویدا پاڵەوانبازی بکات، واتە ناسینی دەروون و سیفەت و ئەخلاقەکانی. ئێستە بابزانین ئایا غەزالی زانایەکی دەروونزانە یان زانایەکی ئەخلاقناسە یان هەردووکیان بەلایەوە هەریەکێکە؟ وەلامی ئەم پرسیارەیە کە بەهای غەزالی دیاریدەکات و لەوانەی پێش خۆی جیایدەکاتەوە لەچارەسەرکردنی مەسەلەکانی دەروون و ئەخلاق هەر لەسەردەمی ئەرستۆیی و ئەفلاتونیەتەوە.

## ١ — ئەخلاق چیە؟

پێناسەی غەزالی بۆ ئەخلاق لەسەر بنەمای تێگەشتنی ناوبراو وەستاوە بۆ هەڵسووکەوتە مرۆییەکان، چوونکە ئەو شێوازەی کە هەڵسووکەوتی لەسەر وەستاوە ئەخلاق سنوردارو پێناسە دەکات، ئەگەر شێوازگەلێکی ملکەچبوون هەبن بۆ هەواو ئارەزوو ئەوا بەو شێوازانە دەگووترێت ئەخلاقی پەست، وە ئەگەر شێوازگەلێکی دەستبەسەرداگر هەبن ئەوکات پێیاندەگوترێت ئەخلاقە جوانەکان، کەواتە ڕەوشت و ئەخلاق: بریتیە لە شێوازەکان ئیتر ملکەچی بن یان دەستبەسەرداگری، واتە بەپێی کرداری هێزەکان، ئەخلاق پەیوەستە بە شێوازەوە واتە دیاردەیەکی هەڵسووکەوتیە بەهۆی پەیوەندی نێوان هێزە ناخی و شاراوەکان کە لەناو مرۆڤدا دەژین واتە هێزە جەستەیی و کرداریەکان لەلایەك و هێزە کرداری و

هێزە تیۆریەکان لەلایەکی ترەوە دروستدەبن، ئەگەر هێزی کرداری خزمەتی هێزی تیۆری کرد ئەوکات هێزی کرداری دەتوانێت دەستبگرێت بەسەر هێزەکانی جەستەدا ئەم دەستبەسەردا گرتنەش شێوازێك هەڵدەکۆڵێت کە مرۆڤی لەسەرە و پێی دەگووترێت ڕەوشتی خراپ. کەواتە خورەوشت بریتیە لە شێواز واتە هەڵسووکەوت. زانست یەکەمین جولێنەری هەموو جۆرەکانی هەڵسووکەوتە بەجۆرێك عەقڵی کرداری وەڵامی دەداتەوە جەستەش بەفەرمانەکانی دەجولێتەوە و هەڵسووکەوتیش ئەم حاڵەتە تەرجەمەو وەرگێراندەکات: (زانست حاڵەتەکان بەرهەمدەهێنێت و کارەکان بەرهەمدار دەکات) [٢٢٥].

شیکاری سروشتی هەڵسووکەوت و گێڕانەوەی بۆ بنەماکەی بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە غەزالی لە لێکۆڵینەوە و باس و بابەتە ئەخلاقیەکانیدا بەتایبەت لە کتێبی(میزان العمل) و(احیا) دا دروستکەری ئامۆژگاری و باساکانی ئەخلاق نەبووە، بەڵکو لێکۆڵەرو شیکارێکی ئەخلاق بووە وەك ئەوەی کە هەڵسووکەوتێکە کە بەهۆی هێزە عەقڵی و جەستەییەهاوبەشەکانەوە دروستدەبێت، (هەریەکە لەنەفس و جەستە کاریگەری هاوڕێکەی خۆی لەسەرە، چوونکە ئەگەر دەروون کامڵ ببێت و پاکبێت ئەوکات کردارەکانی جەستە جواندەبن و بەدەن و لاشەش ئەگەر شوێنەوارەکانی جوان بوون ئەوکات شێوازگەلێکی جوان و ئەخلاقی پەسەند تێیدا ڕوودەدەن) [٢٢٦]. ئێستە بابزانین غەزالی چۆن هەڵسووکەوتی لێکۆڵینەوە و شیکار کردووە و تێگەشتنی بۆ ژیانی دەروونی چیە؟

---

[٢٢٥] رساله التوحيد – من رسائل الغزالي لا ١٠٨.

[٢٢٦] ميزان العمل لا ٤٧.

## ٢ — ژیان و لێکۆڵینەوەی دەروونی:

لەگەڵ گرنگیدان بەلایەنی دەروونی وەك گەوهەرو ناوەڕۆکێکی ڕۆحانی نەمر کە نیشاندەری حەقیقەتی مرۆڤ و ماناکەیەتی، دەبینین غەزالی گرنگیەکی زۆری بەدیاردە دەروونیەکان داوە چوونکە دیاردەگەلێکی هەڵسووکەوتین و کۆمەڵێك پاڵنەر و حەز ئاشکرا دەکەن ئیتر پەیوەست بن بەجەستەو هێزەکانیەوە یان پەیوەستبن بەعەقڵ و هێزەکانیەوە، لەبەر ئەوەی کە فیکرەش لەنێوان عەقڵ و هەواوئارەزوودایە ئەوکات فیکرە دەبێتە هەڵسووکەوتێك کە پاڵنەرگەلێکی جۆراو جۆر و دژبەیەك فەرمانڕەوایی بەسەردا دەکەن هەیانە پەیوەستە بە هەواو ئارەزوەوە و هەشیانە پەیوەستە بە عەقڵەوە چوونکە غەزالی هێزەکانی مرۆڤ دەگێڕێتەوە بۆ سێ شت کە بریتین لە:

یەکەم: / هێزی بیرکردنەوە کە ئامانجەکەی هاتنەدی ئەو حیکمەت و داناییەیە کەڕۆڵی ئەوە دەبینێت کە توانای بەسەر جیاکردنەوەی نێوان حەق و بەتاڵدا هەبێت لەعەقیدە و بیروباوەڕەکاندا، وەهەروەها توانای جیاکردنەوەی نێوان ڕاست و درۆی هەبێت لەقسەکاندا، وە هەروەها توانای جیاکردنەوەی جوان و ناشیرینی هەبێت لەنێو کارو کردەوەکانیشدا.

دووەم: / هێزی هەواو ئارەزوو کە ئامانجەکەی بەدیهاتنی پاکداوێنیە و بەرهەمەکەشی دوورکەوتنەوەی دەروونە لە خراپە و خراپەکاریەکان و ملکەچبوون بۆ دڵدانەوە و ئیساری پەسەندکراو.

سێیەم: / هێزی توڕەیی کە ئامانجەکەی وەدیهاتنی سەبرو لەسەرخۆییە کە دەکاتە خواردنەوەو قوتدانەوەی توڕەیی و بەدیهێنانی بەختەوەری کە بە وازهێنانی دەروون دەبێت لەترس و تەماع کە لەلای خودا خراپ و ناپەسەندن.

ئەم سێ هێزە دەزگای دەروونی دروستدەکات کە غەزالی هەموو کارو چالاکیە دەروونیە هەستیەکان و ناهەستیەکان و ویستیەکان و ناویستیەکان دەگێڕێتەوە بۆ سەریان.

دەزگای دەروونی مرۆڤ هەر لەگەڵ لەدایکبوونیدا پێکدێت بەپێی کۆمەڵە قۆناغێك و بەپێی پلەبەندی کە پێیدا تێپەڕ دەبێت، یەکەمین شتێك کە لەمرۆڤدا دەردەکەوێت هێزی هەواو ئارەزووە چوونکە کۆنترین هێزە لەڕووی بوون و خۆراگری و لکانەوە، کە هەر لەسەرەتای بوونیەوە هەیە تەنانەت لەگیانەوەریشدا هەیە، کە ڕەگەزی ئەوە [٢٢٧] دووەم شتێکیش کە لەمرۆڤدا دەردەکەوێت بریتیە لەهێزی تورەیی و سێیەم و کۆتایش هێزی فیکرو بیرکردنەوەیە.

ئەم ڕێکخستنە لەبووندا دان.بەدووشتی بنەڕەتیدا دەنێت ئەویش ئەوەیە کە هێزی ئارەزوو کۆنترینی هێزەکانە لەمرۆڤدا هەربۆیە بووەتە بەهێزترینیان، لەگەڵ هێزی بیرکردنەوە کە کۆتاو لاوازترینیانە. شتی دووەم ئەوەیە کە کار لەلای مرۆڤ لەبووندا لەپێش مرۆڤەوە هەبووە و پێشتریشە لە بیرکردنەوە، هەربۆیە کاریگەریەکانی لەدەروون و هەڵسووکەوتدا بەهێزترە لەبەرگری و گۆڕانی ئەگەر بمانەوێت بیگۆڕین زۆر قورس دەبێت، هەربۆیە گرنگیدان بەکردار پێویستە، تەنانەت گرنگیدان بەبیرکردنەوە لەوە دەرناچێت کە گرنگیدانە بە لایەنێك لەلایەنەکانی کردار، کەواتە بیرکردنەوە کردارە بەڵام باڵاترین کردارێکە کە مرۆڤ ئەیەوێت.

دیاردەکانی کردار لەلای ئیمامی غەزالی لەم ئاستەدا و لەدیاردەی پەروەردەدا دەردەکەون کە خۆی بۆخۆی کێشەی ئازادی هەڵبژارن و ویست و پاڵنەر و بەدیهێنەرەکان دەوروژێنێت، چوونکە لەنێو ئەم دەزگا دەروونیەدا مرۆڤ

---

[٢٢٧] میزان العمل لا ٩٦.

لەحاڵەتێکی کێبەرکێ و ململانێدا دەژی و تیژیەکەی بەهێز دەکات و بەپێی ئەو هێزەی تاك هەیەتی لاواز دەبێت، هەیانە کە هەواوئارەزوو زاڵدەبێت بەسەریدا، هەشیانە لەحاڵەتیکی جەنگیدا دەژی، واتە هێزەکان بەبەردەوامی لە حاڵەتێکی کێبەرکێی و ململانێ و جەنگی بەردەوامدان ئەمەش سیفەتی تێکۆشەران و شەهیدانە، کە بالآترین پلەیە کە مرۆڤ دەتوانێت پێی بگات هەروەك پێغەمبەران و ئەولیاکان. هەشیانە کە هەواوئارەزوو زاڵدەبێت بەسەریدا و دەبێتە کەسێکی ئازادی تەواو چوونکە ڕزگاریبووە لە هەموو جۆرەکانی بەندایەتی [٢٢٨].

تێبینی کردنی هەڵسووکەوت لەوانەیە حەقیقەتی ململانێکە و هێزەکەی ئاشکرابکات و ئێمەش بتوانین لەتەفسیر کردنی هەڵسووکەوتدا سەرکەوتووبین و بیگێڕینەوە بۆ مەرج و هۆکارەکانی و پێشنیارکردنی چارەسەری گونجاو بۆی، پێویستە وانەزانین کە ئامانجی غەزالی لەپشتی ئەم ململانێیەوە بایکۆتکردنی جەستە و بێدەنگکردنیەتی بەمەبەستی نوسینی یاسا ئەخلاقیەکانی کە پێویستە بن، چوونکە ئەگەر وابکات ئەوکات لەگەڵ گەوهەرو ناوەڕۆکی فیکرەکانیدا دژ دەوەستێتەوە، ئەوباسی ئەو نمونەیە ناکات کە پێویستە ببێت، بەڵکو ئەیەوێت لێکۆڵینەوەو شیکاری ئەو بکات کە هەیە لەگەڵ هێزەکەیدا، دواتر دەتوانرێت کە لەنێوان هەڵسووکەوتی یەکسان و هەڵسووکەوتی ڕەزامەنددا جیاکاری بکرێت، هەربۆیە هێزی هەواو ئارەزوو ئامادەباشیەکی دڵنیای هەیە، وە هەروەها حاڵی توڕەیی و بیرکردنەوەش هەربەم شێوەیە، غەزالی لەمبارەیەوە دەڵێت(مەسەلەکە بەو جۆرە نیە هەروەك گروپێك گومانیان بردووە و پێیانوایە کە پێویستە هێزی توڕەیی و هێزی هەواو ئارەزوو بەیەکجاری سەرکوتبکرێت، بەڵکو دەبێت ڕێکبخرێت

---

[٢٢٨] میزان العمل لا ٤٢.

و تەمبێ و پەروەردە بکرێت، لەبەرئەوەی عەقڵ توانای تەمبێکردنی نیە بەبێ توڕەیی چوونکە ئامازەی باشی تێدا نیە، هەربۆیە بەڕێزترینی هێزەکانە و بەهۆی ئەمەوەیە کە مرۆڤ بووەتە جێنشین و خەلیفەی خودا لەسەر زەویدا، بەڵام وەك پزیشکێکی ڕاوێژکار بۆ چاکە ئەگەربێت و توڕەیی تێدای نەبێت کە توانای ماندوو کردنی هەواوئارەزووی هەیە و وایلێدەکات کە گوێڕایەڵی بکات و ببێتە خزمەتکاری عەقڵ لە ناڕەحەتیەکاندا ئەوکات ئامازەو ڕێنیشاندەریەکەی سودی نابێت، هەربۆیە ڕێزو گەورەیی عەقڵ ڕوونئابێتەوە بۆ ئەوانەی هێزی توڕەییان تێدا کپکراوەتەوە یان نیانە، بەڵکو پێویستە بەجۆرێك تەمبێ و پەروەردە بکرێت بەئامازەی عەقڵ نەبێت هیچ هەڵسووکەوت و کارێك نەکات) [٢٢٩].

ئەم دەقە جەخت لەسەر پێویستی کۆبوونەوەی هێزەکانی دەروون دەکاتەوە بەیەکەوە، چوونکەهێزی عەقڵ کردارەکەی لەدەستدەدات لەکاتی نەبوونی دوو هێزەکەی تردا چوونکە کردارەکەی بەهۆی ئەوانەوەیە، یارمەتی لەیەکێکیان وەردەگرێت بۆ تەمبێ کردنی ئەویتریان، ئەمەش کرداری ئەو پەروەردەیە کە ئامانجی پاککردنەوەی دەروون و سیاسەتی جەستە و ڕەچاوکردنی دادپەروەریە ئەمەش تەنها بەعەقڵگری و تەمبێکردن و سەرکوتکردن دەبێت ئەمەش مانای موجاهەدەو تێکۆشانە لەگەڵ نەفس و دەرووندا [٢٣٠] کە هەمان ئەو شتەیە کە کانت باوەڕی پێیەتی لە قسەکەیدا کە مرۆڤ ڕێکدەخات و لەحاڵەتی حەیوانیەوە دەیبات بۆ حاڵەتی مرۆیی [٢٣١] وە هەروەها دەڵێت: (پەروەردە وا لەمرۆڤدەکات کە لەڕێڕەوی خۆی لانەدات، واتە لەمرۆڤایەتی خۆی لانەدات بەهۆی حەزو نەزعە

---

[٢٢٩] میزان العمل لا ٤٠.

[٢٣٠] پێویستە ئاگاداری ئەوەبین کە غەزالی باس لەسەرکوتکردن ناکات هەروەك فرۆید باسیکردووە.

[٢٣١] کانت – تأملات فی التربیە – منشورات هاشیت ١٩٨١ لا ٣٥.

سەرکەشەکانیەوە، ئەم پەروەردەیەش پێویستی بەوە هەیە بۆ نمونە نەرم بێت لەگەڵیدا بۆ ئەوەی خۆی نەخاتە مەترسیەوە و نەبێتە بوونەوەرێکی گێژ و گەمژە....لەمەسەلەی پەروەردەدا نهێنی گەورەی کامڵبوونی پەروەردەی مرۆڤایەتی تێدایە [٢٣٢] ئەگەر ئەمە هەمان ئەو داواکاریە بێت ئەوا غەزالی بەمشێوەیە باسی پەیوەندی نێوان هێزەکانی دەروون دەکات: (نمونەی عەقڵ وەك سوارێکی ڕاوچی وایە و ئارەزووەکەشی وەك ئەسپەکەیەتی تورەییەکەشی وەك سەگەکەی وایە هەرکاتێك سوارەکە زیرەك و لێزانبێت و ئەسپەکەی تیژڕەوبێت و سەگەکەی تەمبێکراوو فێرکراوو گوێڕایەڵی خاوەنەکەی بێت ئەوا سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت، وە هەرکاتێك لەدەروونی خۆیدا بێعەقڵ بوو ئەسپەکەشی سەرکەش بوو سەگەکەشی گوێڕایەڵ نەبوو ئەوا شیاوی ئەوەیە کە شتەکان لەدەستبدات نەوەك بەدەستیان بهێنێت) [٢٣٣].

ئەم هۆشیاریەش پەیوەستە بەبەهای هەواو ئارەزوو تورەیی و بیرکردنەوە و هۆشیاری و پێویستی پەروەردە و موجاهەدە کردنی دەروونە بەمەبەستی بەدیهێنانی دادپەروەری لەسیاسەتی دەروون و جەستەدا، بێ بەها دەبێت ئەگەر بێت و نەبێتە ئامێرێك کە بەهۆیەوە بتوانین لەهەڵسووکەت بەگشتی و لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەی جوڵێنەرەدیارو نادیارەکانی بەتایبەت تێبگەین، وادیارە کە دیاردەی هەڵسووکەوت ئاڵۆزترە لەوەی کە چەند ووشەیەکی وەك ئارەزوو تورەیی و بیرکردنەوە بهێنین و باسیانبکەین، چوونکە هێزێکی شاراوە هەیە لەناخی هەڵسووکەوتدایە فەرمانڕەوایی دەکات و هەڵسووکەوتەکانی خەڵکی والێدەکات کە

---

[٢٣٢] هەمان سەرچاوە ل ٣٥ – ٣٨. زۆر پێویستە ئاگاداری ئەوە بین کە غەزالی باس لە کەپت و سەرکوتکردن ناکات هەروەك فرۆید باسیدەکات.

[٢٣٣] میزان العمل ل ٤٢.

جیاواز بن، بەڵکو وا دەکات کە ڕاڤەی جۆرەکانی هەڵسووکەوت گونجاوبێت، ئەوکات چۆن دەکرێت مرۆڤ ئاقڵ و گومڕاش بێت لەیەککاتدا؟ تێگەشتن لە یەقین بەس نیە بۆ گۆڕینی هەڵسووکەوت چوونکە هەندێکجار وەهم بە زاڵی دەمێنێتەوە و ئارەزووش بە بەهێزی و کاریگەری کار دەکات، هەربۆیە خەڵکی چوار بەشن:

– مرۆڤی نەزان(جاهل): بریتیە لەو کەسەی کە حەق لە ناحەق و جوان لەناشیرین جیا ناکاتەوە.

– مرۆڤی نەزان و گومڕا: ئەم کەسە لە ناشیرینی شتە ناپەسەندەکان تێدەگات بەڵام لەسەر کاری چاکە و ملکەچکپێکردنی هەواو ئارەزووەکان ڕانەهاتووە و لە بۆچوونە باشەکان لایداوە.

– مرۆڤی نەزان و گومڕا و گوناهبار(فاسق): بریتیە لەو کەسەی کە باوەڕی بەوە هەیە کە ڕەوشتی ناشیرین پێویست و باشن و حەق و جوانن، دواتریش ڕادێت لەسەریان.

– مرۆڤێکی نەزانی گومڕای گوناهباری خراپەکار: ئەو کەسەیە کە لەگەڵ گەشەکردنیدا لەسەر بیروباوەڕی خراپ و پەروەردە بوونی لەسەر کار کردن پێی ڕاهاتووە، گەورەیی و ڕێزی خۆی لە خراپەی زۆردا دەبینێتەوە و خۆی پێوە هەڵدەکێشێت و پێیوایە ئەمە شان و شکۆی دەباتە سەرەوە، لەبارەی ئەم کەسەوە گوتراوە(تەمبێ کردنی گورگ وەك سزادان وایە و شۆردنی شوێنی مەسحکردن بۆ ئەوەی سپی ببێتەوە).

ئەم بەشانە جەخت لەو هێزە شاراوەیە دەکەنەوە کە ئافرێنەری کردارە و فەرمانڕوایە لە هەڵسووکەوتدا لەلای مرۆڤ کە هەر لەمنداڵیەوە دەستپێدەکات، هەربۆیە گۆڕینی هەڵسووکەوت زۆر قورسە و وەك ناڕەحەتی و قورسی

کۆنترۆڵکردنی هەواو ئارەزوو وایە، چوونکە پێشینە ترە لەبووندا لەلای مرۆڤ. دۆزینەوەی بەهای نەریت و گرنگیەکەی غەزالی والیدەکات کە لە شیکاریەکانیدا بۆ هەڵسووکەوت زیاتر جۆرەکانی هەڵسووکەوتی پێ ڕاڤە بکات و پێشنیاری دەرمان و چارەسەری گونجاو بۆ حاڵەتەکە دابنێت بەیارمەتی وەرگرتن لێی(کەوابوو ڕێگەی پاککردنەوەی دڵ و دەروون بریتیە لە ڕاهاتن و ئاسایی بوونی ئەو کارانەی کە لەدەروونی پاککراوی کامڵەوە دەردەچن تاوەکو ئەوکاتەی کە ئەم شتانە بەدووبارە کردنەوە دەبنە شتانێکی ئاسایی لەگەڵ نزیکبوونەوەی کات کە شێوازی دەروونیان لێوە دروستدەبێت و ئەم کارانە دەخوازیت و کارەکانیش خوازیاری ئەون، بەجۆرێك هەموو ئەمانە بە نەریت دەکرێن وەك تەبعی مرۆڤ ئەوکات ئەو خێرو چاکەی بەلاوە سوك و ئاسان دەبێت کە پێشتر قورس بووە بەلایەوە) [٢٣٤].

دەروون هێزێکی لەڕادەبەدەرو تیژی هەیە لە ئاراستە کردنی هەڵسووکەوتەکانی ئێمەدا و تەنانەت لە دیاریکردنی سروشتی کەسایەتیشماندا، حاڵەتی تورەیی و ترس یان شتەکانی تر ناتوانین خۆمانیان لێ دابڕنین کاتێك دەروون لەسەریان ڕاهاتبێت، ئەوکات ڕێگەیەك نیە کە مرۆڤ لەو حاڵەتە نەخۆشیانە دەرباز بکات مەگەر قەرەبوو کردنەوە نەبێت، واتە ڕاهێنانی نەفس و دەروون لەسەر پەیڕەوکردنی هەڵسووکەوت گەلێکی نوێ کە یەکەمین ووردە ووردە قەرەبوو بکاتەوە، ئەم قسەیەش گرنگی نەریت لەلایەك ئاشکرا دەکات و لەلایەکی تریشەوە گرنگی ئەو چارەسەر دەروونیە دەخاتە ڕوو(هەرکەسێك بۆ نمونە وویستی ڕەوشتێکی بەخشین لەخۆیدا بخولقێنێت ئەوا ڕێگەی ئەم کارە ئەوەیە کە خۆی لەسەر وەرگرتنی کردارەکانی بەخشین ڕابهێنێت کە بریتیە لەماڵ بەخشین، دەبێت هێندە

---

[٢٣٤] میزان العمل لا ٤٨.

بەردەوامبێت لەسەری تاوەکو دەیکاتە ڕێڕەوو نەریتی خۆی، ئەوکات خۆی ببێتە کەسێکی بەخشندە) [٢٣٥](چوونکە زۆر لەخۆکردن بەکردارەکانی جەستە نەفس دەتوانێت سیفەتێك بەدەست بهێنێت) [٢٣٦].

هەرکەسێك بیەوێت کە زیرەکی لەنوسیندا بەدەستبهێنێت وەك سیفەتێکی دەروونی نەگۆڕی فیتری و سروشتی، دەبێت ئەوەی کە نوسەری لێزان و زیرەك دەیکات ئەمیش بیکات کە بریتیە لە زانینی چیرۆك و بەسەرهاتی خەت خۆشی و زۆر لەخۆی بکات و هەوڵبدات خۆی بچوێنێت بە خۆشنوسەکانەوە و بەردەوامبێت لەسەر وەرگرتنی خەت خۆشی تاوەکوببێتە مەلەکەیەك تێیدا و شارەزایش تێیدا ببێتە سیفەتێکی دەروونی، تاوەکو وایلێدێت ئەوەی کە پێشتر بەزۆر لەخۆی نیشانی دەدا ئێستە وەك مەلەکەیەك بیکات، خەتی جوانە کە وای لەخەتەکەی کردووە کە جوان بێت یەکەمیان بەزۆر لەخۆکردن وەیدهاتووە، بەڵام دووەمیان بە تەبع و سروشتی بەهۆی کاریگەری دەروونەوە [٢٣٧].

ئەگەر گۆڕانی هەڵسووکەوت گونجاو بێت وە ئەگەر نەریت و خۆ دوورگرتن ئامێرێك بێت بۆ دروستکردنی هەڵسووکەوت و گۆڕینی ئەوا ناتوانین خۆمان لە گرنگیدان بە چارەسەری دەروونی ڕزگار بکەین، پشتبەستن بە چارەسەرکارێکی دەروونی مەرجێکی پێویستە بۆ ئەمە، کە غەزالی لە قسەکەیدا لێی تێگەشتووە کە دەڵێت: (پێویستە بزانیت کە چارەسەری دەروون بە سڕینەوەی سیفەتە پەستەکان و بەدەستهێنانی سیفەتە چاکەکان وەك چارەسەری جەستەکان وایە کە

[٢٣٥] میزان العمل لا ٤٨.

[٢٣٦] میزان العمل لا ٤٨.

[٢٣٧] میزان العمل لا ٤٨.

نەخۆشیەکانی تێدا ناهێڵرێت و تەندروستی بۆ دەگەڕێنرێتەوە) [٢٣٨] لەبارەی گرنگی چارەسەرەکانیشەوە دەڵێت: (وە هەروەها ئەو شێخەی کە خەڵکی شوێنی دەکەون و دڵ و دەروونی شوێنکەوتوان و موریدەکانی پاکدەکاتەوە وەك نمونەی جەستەکە وایە) [٢٣٩] رۆڵی چارەسەرکاری دەروونی واتە ئەو شێخەی کە شوێنکەوتووی هەیە خۆی لە دیاریکردن و زانینی هەڵسووکەوت و ئەندازە و حاڵ و نەریتی موریدەوە و ئەوەی کە بۆ چارەسەر پێویستیەتی بۆ دیاریکردنی شێوازی چارەسەرەکەدا دەبینێتەوە چوونکە بەپێی کەسەکان دەگۆڕێت. چارەسەریش پێویستی بە فەراهەمکردنی ئەو ئاستە پێویستەهەیە و بەهۆی توندی و لاوازی و بەردەوامی و پێچەوانەکەی و زۆری و کەمیەوە دەگۆڕێت، هەربۆیە پێویستمان بە پێوەرێك هەیە کە ئەندازەی بەسودی بزانین چوونکە ئەگەر ئەندازەکەی نەزانین خراپەکەی زیاد دەکات [٢٤٠].

ئەم رێڕەوە کە کارەکانی غەزالی پێدا دەڕوات لەبارەی ناسینی حاڵەت و هێزو دیاردە و چۆنیەتی لێکۆڵینەوە و چارەسەرەکانی دەروون غەزالی لە ئەزموونە صۆفیگەری و تێبینیە تایبەتەکانیەوە دەریهێناون، واتە صۆفیگەری هەروەك غەزالی دەڵێت: : تەنها ئەزموونێکی ئاینی یان رۆحی نیە، بەڵکو سەرەتا ئەزموونێکی هەڵسووکەوتیە، کە خاوەنی یاساگەلێکی وەستاوە لەسەر مەعریفەیەکی قوڵ لەبارەی حاڵەت و دیاردە و سروشتی هەڵسووکەوتەکانی دەروونەوە، بەڵکو پەیوەندی نێوان شەیخ و مورید ئەو پەیوەندیە باوە نیە کە لەسەر چاولێکەری و

---

[٢٣٨] میزان العمل لا ٥٢.

[٢٣٩] میزان العمل لا ٥٣.

[٢٤٠] میزان العمل لا ٥٢ — ٥٣.

چەقبەستوویی و شوێنکەوتنی کوێرانە وەستابێت، بەڵکو لە گەوهەر و ناوەڕۆکیدا بریتیە لە پەیوەندیەکی دەروونی [٢٤١] لەگەڵ ئەوەی کە پەیوەندیەکی فێرخوازیشە.

صۆفیگەریش ئەزموونێکی هەڵسووکەوتی ڕۆحیە کە یەکەمجار شاراوەکانی دەروون ئاشکرا دەکات، دووەمجاریش بۆ ئەوەی بگاتە پلەی کەشف و دۆزینەوە، لەیەکەمیاندا مورید ملکەچی شیکاریەکی دەروونی وورد و قوڵە، لەدوومیشیاندا مورید ڕێگەی دۆزینەوە مەعریفە دەگرێتە بەر. ئەگەر ئەوانەی کە گرنگی بە صۆفیگەری دەدەن لابکەنەوە بەلای ئاستی دووەمدا و پلە و حاڵەتەکانی ڕاڤە بکەن چوونکە ئاگادار بوون لەئاستی یەکەم بووەتە پێویستیەکی مەعریفی کە خۆی زیاتر و زیاتر دەسەپێنێت بۆ ناسینی ئاستی قوڵی مەعریفە کە موسوڵمانەکان هەیانبووە سەبارەت بەو مەسەلانەی کە ئەمڕۆکە بە زانستە مرۆڤایەتیەکان ناسراون، چوونکە ئێمە زانیاریەکمان هەیە هەرچەندە کەمیش بێت لەبارەی ئەو ئاستەی کە موسوڵمانانی پێگەشتووە لەلێکۆڵینەوە مێژووییەکانیان لە کۆندا، بەڵام شارەزایی ئێمە لەبارەی زانستی دەروونەوە کە خەریکە بێجگە لەهەندێك لێکۆڵینەوەی کەم و دەگمەن نەبێت باس ناکرێت لەوبارەیەوە [٢٤٢] ئەمەش بەتایبەت دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە باسە دەروونیەکان تێکەڵ بە مەسەلە دینیەکان و ئەزموونە ڕۆحیەکان کراون، هۆکاری ئەم تێکەڵبوونەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك کە گرنگترینیان

---

[٢٤١] پێویستە ئاگاداری مانای مورید بین لەلای صۆفیەکان، بۆچی ناونراوە مورید ؟ ڕووی لێکچوونی لەگەڵ ئیرادە و وویستتدا چیە ؟ ئەمەش دەرگایەکی ناڕوونە لەو لێکۆڵینەوانەی کەلەبارەی صۆفیگەریەوە کراون.

[٢٤٢] لە گرنگترین ئەم لێکۆڵینەوانەی باسی کتێبی عبدالكريم عوسمان دەکەین بەناوی( الدراسات النفسیه عند المسلمین والغزالي بوجه خاص). وە هەروەها دەتوانین باسی بابەتەکەی بەڕێز احمد فواد ئەهوانیی بکەین بەناوی( غەزالی دامەزرێنەری زانستی دەروونزانی ئیسلامی) کە لەگۆڤاری عەرەبی کوەیتی ژمارە ٥٦ بڵاو بووەتەوە، وە هەروەها لەپێشەکی کتێبی جواهر القرانیشدا بڵاو کراوەتەوە( ١٩٨١).

بریتیە لەسروشتی گووتاری ئیسلامی وەك ئەوەی کە دنیایی لەگەڵ قیامەتی تێدا تێکەڵکراوە بە تێکەڵکردنێك کە چەند ڕوویەکن یەکبوونێکیان بۆ بنیاتناوە، لە گرنگترین و دیارترینی ئەو ڕوانەش بریتیە لە یەکبوونی جەستە و دەروون، واتە یەکبوونی مرۆڤ چوونکە هیچ شتێك ئاراستەی جەستە ناکرێت یەکسەر لەئاستی دەروونیشدا نیشانەکانی دەردەکەون، وە هەر شتێکیش ئاراستەی دەروون کرا ئەوا نیشانەکانی لە جەستەدا دەر دەکەون، واتە گوتارەکە ئاراستەی هەردووکیان نەکراوە، بەڵکو بەدووشێواز ئاراستە دەکرێت، ئەوەی ڕاستی بێت غەزالی لە کتێبی میزان العمل دا توانیویەتی بچێتە قولآیی ئەم یەکبوونەوە بۆ ئەوەی ڕووەکانی ئاشکرا بکات و لەسەر سێ ئاست دەستی بەکارکردن کردووە تییدا: کردار وەك ئەوەی کە مەرجە بۆ فێرکردن و فێربوون و هەستکردن بەیەقین، کارکردن بەوەی کە کاری عەقڵگری و فێر بوونە کە لەبابی چوارەمدا ڕوونمانکردەوە، کارکردنیش بەوەی کە ئامانجی فێربوون و عەقڵگریە کە دواتر لەڕێگەی دۆزینەوەی شیکاریەکەی غەزالی بۆ مانای ڕێز(فضیلة) و بەدەستهێنانی بەختەوەری(السعادة) ڕوونی دەکەینەوە.

بەلآم تێگەشتنی ئێمە بۆ ڕێزو گەورەیی لەلای ئیمامی غەزالی پەیوەستە بە تێگەشتنی ناوبراوەوە بۆ ئیرادە و پاڵنەر و مەیل و حەز، واتە پەیوەستە بە تێگەشتنیەوە بۆ نەفس و دەروون واتە بۆ هەڵسووکەوت کە کردارێکی دینامیکیە و کاراکتەرە هەستی و وویژدانی و نەزعەییەکان بەشدارن تێیدا. چوونکە کاری ئەخلاقی ئامانجی بەدەستهێنان و بەدیهێنانی ئازادیە، ئەم ئامانجەش بەدینایەت مەگەر کاتێك مرۆڤ خۆی بە ئیرادە تەیار بکات، بەلآم ئیرادەش لە پاڵنەرو ئامانجەکان جیا نیەو پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵیاندا هەیە، ئەم پەیوەندیەش کە

قەوارە مرۆڤ دەتاشێت و هەڵیدەکۆڵێت و هەڵسووکەوتەکان ئاراستە دەکات، دۆزینەوەی ئەم دینامیکیەتە بریتیە لە دۆزینەوەی شێوازی هەڵسووکەوت و ئیدراك بۆ ئەوەی بتوانرێت بگۆڕدرێت و تەنانەت دەبێت باوەڕیشی بە هێزو توانایەك هەبێت کە ئاراستە بکرێت و فەرمانڕەوایشی بەسەردا بکرێت.

هەر هەڵسووکەوتێك کە ئەم سێ مەرجەی تێدایە کە بریتین لە هێز، وویست، زانست، غەزالیش لە کتێبی ئەحیائدا ئاماژە بەم جۆرە مەرجانە دەکات کاتێك باسی هەڵسووکەوتی نوسین دەکات، باسی ئەوە دەکات و کە دەست بەهێز ئیش دەکات و هێزیش بە ئیرادە دەجولێتەوە و ئیرادەش لە زانستەوە سەرچاوە دەگرێت و دەژێتەوە [٢٤٣]. هێزیش بریتیە لەو مانایەی کە بەخشراوەتە ماسولکەکان، واتە تواناو ئامادەباشی جەستەیی، ئیرادەش ئەو کاراکترەیە کەهێز زیندوو دەکاتەوە بۆ کارکردن و خۆی لە وویست و ئیرادەی وەرگرتنی چاکە و دوورخستنەوەی خراپەدا دەبینێتەوە، زانستیش ئەو شتەیە کە دەبێت عەزمی هەبێت و حوکم بکات، ئەگەر بێت و دوودڵ بێت و هەمیشە لە دڵەڕاوکێدا بێت ئەوکات هێزو ئیرادەش پڕ دەبن لەدڵەڕاوکێ و لەو حاڵەتەدا دەمێننەوە [٢٤٤].

هەموو هەڵسووکەوتێکیش ئامانجی بەدەستهێنانی خێرو چاکەیە ئیتر یان لە هەموو حاڵەتەکاندا بەسوودن کە دەکاتە ڕێزو گەورەیی دەروونیەکان، یان لەحاڵێکدا بەسودن و لەحاڵەتێکی تردا بەپێچەوانەوەیە وەك ماڵ و سامانی کەم. هەشیانە کەزیانەکەی زیاترە بۆ خەڵکی وەك هەندێك جۆری زانست و پیشەسازیەکان [٢٤٥]. وەهەروەها خێرو چاکەکانیش دەکرێت بۆخۆیان کاریگەر بن

---

[٢٤٣] احیا ب٣ لا ٢٤٣.

[٢٤٤] معارج القدس لا ٣٧ بەرەو سەر.

[٢٤٥] میزان العمل لا ٧٨.

یان کاریگەریان لەسەر غەیری خۆیان هەبێت، یان هەندێکجار کاریگەریان بۆخۆیان هەبێت جارێکیش بۆ غەیری خۆیان. وەهەروەها دەکرێت کە خێروبێرەکان دابەش بن بەسەر بەسود و جوان و خۆشدا، خراپەکانیش سێ دانەن: زیانبەخش و ناشیرین و بەئازار، هەریەکەشیان دووبەشە یەکێکیان ڕەهایە(المطلق) کە هەرسێ سیفەتەکەی خێر یان شەڕو خراپەی تێدایە دووەمیشیان ناڕەهایە(مقید): ئەوەیە کە هەندێك لەم سیفەتانەی تێدایە بەدەر لە هەندێکی تریان.

بەسودیش دووبەشە: بەشێکی پێویست وەك ڕێزو گەورەییە دەروونیەکان و بەشێکی ناپێویست. لەزەت و خۆشیەکانیش بەپێی هەرسێ هێزەکە بریتین ئیدراك و هەستکردن بە حەزلێکراو. ئارەزووش بریتیە لە زیندوویی دەروون بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی کە حەزی لێیەتی، ئەوەش یان عەقڵیە وەك لەزەت و خۆشی حیکمەت و زانست کە کەمترین و بەڕێزترینیانە و تەنها حەکیم و داناو زاناکان لەچێژەکەی دەگەن. یان خۆشی و لەزەتی جەستەیین بریتین لەو لەزەت و خۆشیانەی کە لەنێوان مرۆڤ و حەیواناتەکانی تردا هاوبەشن وەك خۆشی خواردن و خواردنەوە و هاوسەرگیری کە بوونیان زۆرە [٢٤٦].

ئەم دابەشکاریە ئەو پێوەرانە دیاریدەکات کە غەزالی دەستی پێوەگرتوون و ڕێکی خستوون و بۆ تێگەشتن لەهەر هەڵسوکەوتێك و هەڵسەنگاندنی، کە بریتیە لە پێوەری سود و قازانج و پلە و پایە و جوانی خۆشی و لەزەت. هەموو هەڵسوکەوتێك بەیەکێك لەم پێگەو بەهێزکەرانە ئاراستە کراوە یان هەموویان بەپێی سروشتەکەیان ئاراستە کراون.

---

[٢٤٦] میزان العمل لا ٧٨.

ئەو هێزی ئارەزووەی کە هەیەتی جۆرو پلەکەی نیشاندەدات، ئارەزووەکان وەك کۆمەڵێك پاڵنەرو جوڵێنەری هەڵسووکەوتن کەبەپێی کۆمەڵێك ئامانجی دیاریکراو کەزانست دەبێتە ئەصڵ و بنەما لەئاراستە کردنیدا، ئارەزووی وورگ خوازیاری خۆراکە کە بۆ ووزەی ئەندامەکانی جەستە پێویستی پێیەتی وەك خۆراك و ئاو کە بەدیهێنانیان پێویستە بەڵکو خاوەنەکەی سوپاسکراوو پاداشتدراوەیە چوونکە لاشە و بەدەن وەك ئامێری سواری دەروون وایە(لەکاتی خواردنی پیاوچاکاندا ڕەحمەت و بەرەکەتی خودایی دادەبەزێت) بەڵام ئەم ئارەزووە هەندێکجار لەئاستی پێویست و مامناوەندی تێپەڕدەکات و خاوەنەکەی دەخاتە ناو ئیسراف و زیادەڕەوی لەخواردندا ئەمەش لەڕووی پزیشکیەوە زیانبەخشە، (سکە ڕۆیی بنەڕەتی دەردەکەیە و تورەبوون لەبەرامبەر ئەمەشدا بنەڕەتی دەرمانەکەیەتی کە دەبێت هەرجەستەیەك هەرچیەك پێویستە لەسەری ڕابهێنرێت).

لەڕووی دەروونەوە مەشخەڵی خراپەکان بریتیە لە ئارەزووەکان بەهێزکەری ئارەزووەکان بریتیە لە خۆراك کەوابوو پڕ بوونی وورگ بەهێزکەری ئارەزووەکانە بەهێزبوونی ئارەزووش خوازیاری تێرکردنی ئارەزووەکانە. ئەم زیادەڕەوی و ئیسرافە بەپێی ئیمامی غەزالی ناباشە(مکروە) لەبەر ئەو هۆکارانەی کە باسمانکردن و تێپەڕبوون لێیان تەنها بەگەڕانەوە دەبێت بۆ مامناوەندبوون بۆ ئەوەی ئارەزووەکان ئامانجیان بپێکن تەنها بۆ ئەوەی جەستە سوك ببێت و بتوانێت شەو نوێژو پەرستشەکانی بکات، ئەم هێزانە لەکاتی زیندووبونەوەی ئارەزووەکاندا لاواز دەبن [٢٤٧] هەندێکجار هەڵسووکەوت لە شتی قەدەغەدا ڕوودەدات کاتێك شتە

---

[٢٤٧] میزان العمل لا ٧٨.

حەرامەکان دەخورێن وەك خواردنەوەی سەرخۆشکەرەکان کە بەهێزترین ئامێرەکانی شەیتانە بۆ لەناوبردن و سڕینەوەی عەقڵ.

بەمشێوەیە ئەوە ڕووندەبێتەوە کە(گەدە سەرچاوەی هێزەکانە وەك دەرگا و کلیل وایە بۆ لای خێرو خراپە هەربۆیە لەشەرعدا مەسەلەی ڕۆژو زۆر بەرێزو گەورەیە) [٢٤٨]. بەڵام ئارەزووی تاك زۆر پێویستە بۆ پاراستنی جۆرو ڕەگەز هەروەك چۆن خۆراك پێویستە بۆ پاراستنی کەسەکە، هاوسەرگیریش پێویستە بۆ هێشتنەوەی وەچەو ڕەگەزی مرۆڤ، هەربۆیە شتێکی پێویستە و یەکێکە لە پەرستشەکان، بەڵام هەندێکجار مرۆڤ لەسنوری مامناوەندی دەردەچێت و دەکەوێتە ناو ئیسرافەوە و ئامانجی لە هەواو ئارەزوو تەنها دەبێتە خۆشی و لەزەت وەرگرتن و خاڵیکردنەوەی ئارەزووەکانی و بەردەوامیش دەبێت لەسەری، هەندێکجار ئەم زیادەڕەویە دەگاتە ئاستی حەرام و قەدەغە کراوەکان کاتێك مرۆڤ دەکەوێتە زیناوە، بەگشتی هەرکاتێك مرۆڤ عەقڵ بۆ خزمەتی هەواوئارەزووەکانی بەکار بهێنێت دەکەوێتە ناو شتە حەرامەکانەوە، چوونکە عەقڵ بۆ ئەوە دروستکراوە کە ببێتە فەرمانڕەوایەکی بەگوێکراو نەك بۆ ئەوەی بکرێتە خزمەتکاری هەواوئارەزووەکان و لەبەر خاتری ئەو سەرگەردان ببێت. کە تووشی نەخۆشی نەفسی دەکات و هیچ هیممەتێکی تێدا ناهێڵێت [٢٤٩]. بەڵام توڕەیی کردارەکانی دابەشدەبن بۆلای پەسەند و ناپەسەند(حەرام). پەسەند پێی دەگوترێت غیرە کە خودا بۆ پاراستنی نەسەب و وەچەکان دایناوە. ئەگەر دەروونەکان ڕێگە بەخۆیان بدەن لەژنانێکی زۆردا رابوێرن ئەوکات وەچەو نەسەبەکان تێکەڵ دەبن هەروەك

---

[٢٤٨] میزان العمل لا ٨١.

[٢٤٩] میزان العمل لا ٨٣.

چۆن لەوانەیە تورەیی لەکاتی بینینی شتە ناشیرین و خراپەکاریەکاندا بوێری بێت لەسەر ئاین و هەوڵی تۆڵە کردنەوە بێت، هەربۆیە وەسفدار کراون کە توندن لەگەڵ کافران و بەبەزەین لەناو خۆیاندا [٢٥٠].

بەلاَم خراپ بریتیە لەو چالاکیەی کە لە شانازی و خۆبەگەورەزانین و کێبەرکێ و ئیرەیی و ڕق و کینەوە سەرچاوە دەگرێت و پەیوەستە بە هێڵە جەستەییەکانەوە، بەلاَم لە تۆڵەسەندنەوەدا بەرژەوەندیەك هەیە لەداهاتوودا لەدین و دوونیادا کە زاڵترە بەسەر زۆربەی بوونەوەراندا واتە ملکەچبوون بۆ ئەو خووەی کە دژی سەبرو خۆڕاگریە. حیلم و خۆڕاگری بریتیە لە گرتنەوەی دەروون لە هەڵچوونەکانی تورە بوون، کە خۆڕاگریە لەسەر ناباش، تورەیی دیوەزمەی عەقڵە [٢٥١]. کاتێك غەزالی لەم دیاریکردن و ڕیزبەندیەدا حوکمگەلێکی بەهایی دادەنێت کە جیاکاری دەکات لەنێوان باش و خراپیاندا دەبینین بێئاگاش نیە لە پێویستی دیاریکردنی ئەم دیاردانە لەڕووی هەڵسووکەوتەوە بەبێ تێپەڕبوون بەرەو هەڵسەنگاندنی ڕەوشتی، لێرەدا دەتوانین نمونەیەك وەربگرین بۆ ئەوەی لەڕێگەیەوە لەوە تێبگەین کە چۆن غەزالی شیکاری دیاردەی هەڵسووکەوتی تورەیی دەکات:

تورەیی واتە گەرمبوون و کولاَنی خوێنی دڵ کە دابەشدەبێت بۆ سێ جۆر:

– ئەگەر تورەییەکە لەدژی کەسێك بێت کە لەهێزو دەسەلاَتدا لەسەرو خۆتەوەیە و مەبەست لێی تۆڵەسەندنەوەیە، ئەوا خوێن لەژێرپێستەوە بەرەو ناودڵ دەڕواتەوە و دەبێتە هۆی دڵتەنگی و بەم هۆیەشەوە ڕەنگی پێست زەرد دەبێت.

---

[٢٥٠] میزان العمل لا ٨٣.

[٢٥١] میزان العمل لا ٨٥.

– ئەگەور تورەییەکە لەدژی کەسێکی لەخوار خۆتەوە بوو دەبێتە هۆی جووڵەی لافاو ئاسای خوێنی دڵ بەهۆی هاتنەوەیەك، هەربۆیە دەبێتە هۆی تورەیی ڕاستەقینە و تۆڵە کردنەوە.

– وە ئەگەر تورەییەکە لەدژی کەسێکی هاوشێوەو یەکسانبوو لەگەڵ خۆتدا دەبێتە هۆی تەسکبوونەوە و بلاوبوونەوەی خوێن و ڕەنگی دەمووچاو دەگۆڕێت بۆ سورو زەرد و دڵەڕاوکێی دەروون.

لەم دیاریکردن و ناساندنەوە بەپشت بەستن بە تێبینی ڕاڤەی فیزیۆلۆجی بۆ دیاردەی دەروون کە دیاردەیەکی هەڵسووکەوتیە و پشتگیری ئەم ئاراستەیە دەکات کەلەلێکۆڵینەوە و شیکاری هەڵسووکەوتی لە تەفسیرو ڕاڤەی غەزالی بۆ ئەم دیاردەیە و گێڕانەوەی بۆ هۆکارەکانی تێدەگەین: کە بریتیە لە پەروەردە و نەریت. هەرکەسێك تێکەڵی کۆمەڵێك بکات کە شانازی بەتورەیی و دڕندەییەوە دەکەن و خۆیانی پێ هەڵدەکێشن ئەوا ئەمیش وەك ئەوانی لێدێت. وە هەرکەسێکیش تێکەڵی خەڵکی هێمن و لەسەرخۆو نەرم و نیان بکات بەهەمان شێوە ئەمیش ئەم نەریتە جوانە کاریگەر دەبێت لەسەری، بەگشتی تورەیی هەڵسووکەوتێکی بەدەستهاتووە، نەریت کاریگەری زۆری لەسەری دەبێت و لەهێزەوە(القوە) وە دەیکاتە کردار(الفعل) ی گاڵتە پێکردن و کێبەرکێی و ئیرەیی بەیەکتری بردن و ئارەزوو تۆڵە سەندنەوە.

لەگەڵ ئەم دیاریکردن و تەفسیرو ڕاڤەیەدا غەزالی لەیەککاتدا چارەسەرو خۆپاراستنی گونجاو دەخاتە ڕوو ئەمەش بەوە دەبێت کە مرۆڤ پێویستە هێزی فیکری هەمیشە لەئامادەباشیدا بێت و کاتێك تورەبوو هۆش و بیری لەسەر خۆی بێت، ئەمەش بەوە دەبێت کە مرۆڤ هەمیشە ناکرێت گوێڕایەڵی بکرێت و لەهەندێك

کاتدا دەبێت گوێڕایەڵیش بکات، یان هەندێکجار لەبری ئەوەی خزمەت بکرێت دەبێت خزمەت بکات، یان دەبێت تامڵی لەگەڵ خەڵکیدا هەبێت نەك تامڵی بکەن، یان دەبێت ئەوە بزانێت کە خودا هەمیشە دەیبینێت[٢٥٢]. ئەم چارەسەرە دەروونیە هەڵسووکەوتیە لەسەر ئامادەباشی هۆشیاری وەستاوە لەکاتی سەرەتای توڕەبوونەوە تاوەکو هۆشی بەبەردا دێتەوە بۆ ئەوەی توڕەییەکە زاڵ نەبێت بەسەریدا، بەڵام هەندێکجاریش بەهۆش نایەتەوە و توڕەیی زاڵدەبێت بەسەریدا و توڕە دەبێت. هەربۆیە غەزالی ئاگاداری لەبارەی ئەمەوە داوە، چوونکە هۆشیاری هەمیشە لەژێر هەڕەشەی نادیاری و خۆ وونکردندایە، بۆ بەهێزکردنیشی پێویستمان بە پشتبەستن دەبێت بە هۆکارەکانی تر، لەو نەریتە باشتریش نیە کە هەمیشە هەوڵبدەین و ئەو شتانە لەدەروونماندا پەیڕەو بکەین کە وامان لێدەکەن بەسەر توڕەیماندا زاڵببین، نەك هۆکارگەلێك لەناخماندا گەشە پێبدەین کە دەبنە هۆی زاڵبوونی توڕەیی بەسەرماندا، ئەمەش بەوە دەبێت کە سەیری خودی خۆمان بکەین و وردە وردە لەخودی خۆماندا هەوڵی چەسپاندنی ئەم سێ سیفەتە بدەین کە بریتین لەوی کە: گوێڕایەڵی بەرامبەرەکانمان بکەین، خزمەتیان بکەین بەشێوەیەکی عەقڵگر، هەوڵبدەین بەپێی پێویست تامڵی ئازارەکانیان بکەین، لە هەمووئەمانەشدا پێویستە داوای یارمەتی لەخودا بکەین و پشتی پێ ببەستین لەدیارو نادیاردا.

چوونکە پشتبەستن و داوای یارمەتیکردن لەخودا، هیممەت و عەزیمەت بەهێز دەکات و پارێزگاری لە مامناوەندبوونی مرۆڤ دەکات، هەروەها ناونیشانی تەندروستیە ئەگەر نەفس لەسەر ئەم خەصڵەت و سیفەتانە ڕاهات هیچکات توڕە نابێت و هەمیشە مامناوەندبوونی خۆی دەپارێزێت کە لەدیاردە هەڵسوو

---

[٢٥٢] میزان العمل لا ٨٥.

کەوتیەکانیدا دەردەکەوێت وەك ئازایەتی کە ئەگەر بدرێتە پاڵ نەفس و دەروون بەهێزی دڵ و بەجەرگی بەدوای خۆیدا دەهێنێت لەکاتی ناخۆشی و بەڵاگاندا، وە ئەگەر بدرێتە لای کرداریش وا لەمرۆڤدەکات کە دەستپێشخەر بێت بۆ شوێنەکانی دەستبەکار بوون و قۆستنەوەی هەلەکان و هیوادار بوون، کەبەهۆی ئەمانەوەیە مرۆڤ خۆڕاگردەبێت لەسەر ناڕەحەتیەکان و خۆی لە گوناهو تاوانەکان دوور دەخاتەوە، چوونکە ئەگەرهات و تورەیی زاڵبوو بەسەر هەواو ئارەزوودا دەیچەوسێنێتەوە، بەکورتی و لەیەك ووشەدا ئازایەتی بریتیە لە سەبرو خۆڕاگی [٢٥٣].

٢٥٣
.

لەبەر ئەوەی هەندێك لە خراپەکان بەهۆی ئارەزووی داوێن و وورگەوەن و هەندێکی تریش لەشتەکانی تردان، هەربۆیە ڕۆژوو شتێکی پێویستە کە نیوەی سەبرو خۆڕاگریە سەبریش دوو جۆرە: یەکەم سەبرو خۆڕاگریەکی جەستەیی کە بریتیە لە کردار وەك تامڵکردنی ناڕەحەتیە لاشەیی و جەستەییەکان وەك قبوڵکردنی کارە قورسەکان، یان کاردانەوەن کە بریتیە لە تامڵکردنی لێدانی توند و نەخۆشی قورس و گەورە. دووەم سەبرو خۆڕاگری دەروونیە ئەگەر سەبر بێت لەبەرامبەر خواردنی ئەو شتانەی کە مرۆڤ حەزیان لێدەکات ئەوا پێی دەگوترێت پاکداوێنی، وە ئەگەر لە تامڵکردنی خراپەکانەوە بێت ئەوا ناوەکانی دەگۆڕێت، ئەگەر سەبر بوو لەسەر موسیبەتێك ئەوە سەبرو خۆڕاگریەو دژەکەشی ناڕەحەتی و بێسەبریە، ئەگەریش بەهۆی زۆری دەوڵەمەندیەوە بێت ئەوا بەو سەبرە دەگوترێت دانبەخۆدا گرتن کە دژەکەی دەکاتە فیزکردن و خۆ هەڵکێشان لەناو خەڵکیدا، وەئەگەر سەبرەکە لەکاتی شەڕدا بوو پێی دەگوترێت ئازایەتی و دژەکەشی

---

[٢٥٣] میزان العمل لا ٨٥.

ترسنۆکیە، وەئەگەر سەبرەکە لە قوتدانەوەی تورەییدا بێت ئەوا پێی دەگوترێت خۆڕاگرتن کە دژەکەی کاردانەوەیەکی نابەجێیە، وە ئەگەر سەبرەکە لەسەر بەلاّو موسیبەتێك بێت ئەوکات پێی دەگوترێت سنگ فراوانی کە دژەکەی کەم جیقڵدانیە. وەئەگەر سەبرو خۆڕاگریەکە لە شاردنەوەی قسەیەکدا بێت پێی دەگوترێت نهێنی پارێزی، وەئەگەر لەسەر فراوانی ژیان و گوزەران بوو ئەوا پێی دەگوترێت زوهد و تەرکی دوونیا دژەکەی دەکاتە تەماع و هەڵپەی دوونیا، بەلاّم غیبتە و کێبەرکێ لەسەر شتی باشی یەکتری و دەستکەوتنی چاکەکانی یەکتر بەبێ ئەوەی کە مرۆڤ بیەوێت لەوەی بەرامبەرەکانی کەم ببێتەوە شتێکی باش و قبوڵی لای خودایە، ئەمە لەکاتێکدا ئیرەیی خراپە چوونکە حەزکردنە بەنەمانی شتی بەرامبەرەکان و دەستکەوتنی لەلایەن مرۆڤی ئیرە بەرەوە و داماڵرانی کەسی بەرامبەرە لەو شتەی کە هەیەتی، هەربۆیە ئیرەیی و تەماع دوو کۆڵەکەی گوناهو تاوانن و دەبنە هۆی خەم و خەفەت و خەسارۆمەندی، هەرکەسێك ڕەگ و ڕیشەکانی ببرێت ڕزگاری دەبێت[٢٥٤].

ئەم ووردەکاری و درێژەپێدانە لەشیکاری جۆرەکانی هەڵسووکەوت و تێگەشتن لێی و جیاکردنەوەی لەشتەکانی تر ئامانج لێی ڕێکخستن و ڕاهاتنە لەسەریان تاوەکو دەبێتە ڕەوشتێکی قوڵ و ڕۆچوو کە بەهۆیەوە پاکداوێنی بەرهەم دێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەخلاق لای ئیمامی غەزالی ئامانجێکە ناگەینە لای مەگەر بەتێگەشتن لە شێوازی هەڵسووکەوت و چۆنیەتی پێکهاتنی و گۆڕانی کە بەهۆیەوە مرۆڤ دەتوانێت کامڵبوونی خودی و چۆنایەتی بەدەستبهێنێت، چوونکە شتێکی زیاد یان بەهایەك نیە لەو بەهایانەی کە گرنگیان پێ نەدرێت و وەلا نرابن،

---

[٢٥٤] میزان العمل لا ٨٧.

ئەڵکو دەرئەنجامی خودی ئەو هەڵسووکەوتەن، بەسوودی ڕاستەقینە و خۆش و بەلەزەتی ڕاستەقینە و جوانی ڕاستەقینە بریتیە لە خێر یان هەڵسووکەوتی پەسەند کە بەزانستی ڕاستەقینەی شارەزا لەبارەی سروشتی دەروون و هێزەکانیە وە دیاریدەکرێت. وە هەرچیەکیش کە دەبێتە هۆی خەم و خەفەت و دڵتەنگی و نارەحەتی ئەوە پێی دەگوترێت شەڕو خراپە یان خووخدەی خراپ. هەواو ئارەزووی باش و پەسەند لەکرداری خوداوەیە کە هێزێکە لەناخی مرۆڤدا ئافرێنراوە بۆ هۆشیارکردنەوە و زیندوکردنەوەی دەروون بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی کە چاکەی جەستەی تێدایە ئیتر بە هێشتنەوەی جەستە بێت یان بەهێشتنەوەی جۆرەکەی یان هێشتنەوە و پاراستنی هەردووکیان بێت.

بەڵام هەواو ئارەزووی خراپ لە کرداری نەفس و دەروونی فەرمانکەرە بەخراپە کە خۆشویستنی ئەو شتانەیە کە لەزەت و خۆشی جەستەیی تێدایە، کاتێك ئەم ئارەزووەش زاڵدەبێت پێی دەگوترێت هەواو ئارەزوو کە دەکەوێتە شوێنی فیکرە و بەکاریدەهێنێت بۆ ئەوەی کاتەکانی بگرێت و هەمیشە بیکاتە گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خۆی [٢٥٥].(هەرکەسێك هەموو هێزەکانی بەکار بهێنێت بۆ گەشتن بە زانست و کردار، ئەوا خۆی چواندووە بە فریشتەکانەوە و نزیکە کە بگاتەوە پێیان، هەربۆیە شیاوی ئەوەیە کە پێی بگوترێت فریشتە ڕەنگ یان ڕەببانی... وە هەرکەسێك خەم و هیممەتی خۆی کردە بەدەستهێنانی خۆشی و لەزەتەکان و وەك حەیوانات دەیخوارد ئەوا کەسایەتیەکەی دادەبەزێتە ئاستی وولاخ و حەیواناتەوە یان گێژو سەرخۆشە وەیان نالەبارە وەك بەراز وەیان وەك سەگ دەوەڕێت، وەیان ئیرە بەرو ڕقاویە وەك حوشتر و یان خۆبەزلزان و لەخۆباییە وەك پڵنگ یان زۆر

---

[٢٥٥] میزان العمل لا ٤٥.

فێڵبازە وەك ڕێوی یان هەموو ئەمانەی تێدایەوە و وەك شەیتانێکی خاوەن ئیرادەی خراپ وایە) [٢٥٦]. هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤیان پێ دەبێتە مرۆڤ و ئەوەی کە مافی خۆیەتی کە هەیبێت ئەوە هەڵسووکەوت و خووخدەیەکی باشە. وە هەرشتێکیش مرۆڤ لەمرۆڤبوون بهێنێتە دەرەوە و بیکاتە کەسێکی کەموکورت ئەوە ڕەتکراوەیە، کە پێی دەگوترێت خووخدەی ناشیرین و ناپەسند.

ئەم یاسایە مانای ئەوەیە کە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەکەی غەزالی بۆ ئەخلاق لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوە و شیکارێکی دەروونی وەستاوە بۆ هەڵسووکەوتەکانی مرۆڤ کە ناوبراو لێکۆڵەرە و دامەزرێنەری شیکاری دەروونی ئەخلاقە، زیاتر لەوەی کە دامەزرێنەری فەلسەفەیەکی ئەخلاقی بێت. ئەم جیاکاریەش لەلای غەزالی بۆ سروشتی ئەو فەلسەفەیەی کە لەسەر بنەمایەکی واقیعی وەستاوە و چەکەکەی تێبینی و ئەزموونە. واتە ئەو نایەوێت یاساو ڕێساگەلێکی ئەخلاقی دابنێت یاخود دابمەزرێنێت وەك ئەوەی کە کانت و دیکارت و چەندانی تریش کردویانە، بەڵکو وویستویەتی شیکاری سروشتی دەروون بکات بەو شێوەیەی کە هەیە و هۆشیارە و لەسەر پێی خۆی و لەجیهاندا وەستاوە، کە هێزگەلێکی تێدایە و هێزگەلێکیش دروستیدەکەن و کۆمەڵێك ئامانجیشی هەیە، هەرشتێك کە لەگەڵ کامڵی خودی یان بابەتی مرۆڤدا گونجا ئەوە شتێکی باش و پەسەندە. وە هەرشتێکیش لەدژی ئەم دوو کەماڵە وەستایەوە ئەوە خراپ و ناپەسەندە.

بەمشێوەیە دەتوانین لەوە تێبگەین کە بۆچی غەزالی داوای لەزۆربەی خەڵکی کردووە کە زیاتر گرنگی بەکردار بدەن تاوەکو زانست هەروەك لەبەشی سێیەمدا ئامازەمان پێکرد.(باشتر وایە کە زۆربەی خەڵکی سەرقاڵبن بە کردارەوە و لەنێو

---

[٢٥٦] میزان العمل لا ٢٣ — ٢٤.

کرداریشدا هەوڵبدەن سەرقاڵی زانستی کرداری بن و مەبەستم ئەوشتەیە کە چۆنیەتیەکەی پێ دەناسرێتەوە، چوونکە زانستی کرداری لە کردار بەرێزتر نیە بەڵکو پلەی لەویش خوارترە، ئەو مەبەستی کردارە نەك زانست کە مەبەستی زانینی زانراوەکانە وەك زانیاری لەبارەی خودا و سیفەتەکانی و فریشتە و کتێبەکان و پێغەمبەرانی و زانیاری لەبارەی نەفس و سیفەتەکانی و زانیاری لەبارەی مەلەکوتەکانی ئاسمان و زەوی و شتەکانی تر ئەمانە زانستگەلێکی تیۆرین نەك کرداری و پراکتیکی)[٢٥٧] کاتێك باسی کەسێك دەکەین و دەڵێین ئەخلاق و رەوشتێکی جوان و پەسەندی هەیە. ئەوە سەرەتا و بەپێی ئەوەی کە پێشتر باسمانکرد مەبەستمان ئەوەیەکە ئەو کەسە کەسێکی مامناوەندە و موعتەدیلە، وەکاتێکیش بەکەسێك دەڵێین ئەخلاق و خووی ناپەسەندە ئەوە سەرەتا مەبەستمان ئەوەیە کە ئەو کەسە کەسێکی مامناوەند نیە کە نیشانەی چاکەی تێدا بێت. مامناوەند بوون و راستبوون تەندروستیەکی دەروونیە و هەرچیەکیش دژی بێت ئەوا پێی دەگوترێت نەخۆشی و ناتەندروستی و کەلێن کە هەندێکیان تووشی دەروون دەبن و دەکرێت چارەسەر بکرێن. هەندێکیشیان چارەسەریان قورسە، بەتایبەت کاتێ ببێتە نەریتێکی بنەرتی تێیدا. ئەوەی کە ئاگاداری کتێبی احیا علوم الدین بێت دەتوانێت چەندین نمونە لەمبارەیەوە بخوێنێتەوە کە تێیاندا غەزالی چەندین دیاردەی دەروونی شیکارو چارەسەر کردوون و سروشتی دیاردەکە و هێزو چۆنیەتی دەرکەوتنەکەی و چۆنیەتی گۆڕانەکەی دیاریکردوون. ئەم شیکاریەش بەردەوام دەکەوێتە پێش کارە دووەمە تایبەتەکەیەوە کە بەهاکان دەبەخشێت و دیاریاندەکات، واتە زانستی رێزو گەورەییە کان و چاکەکاری(الفضیلة).

---

[٢٥٧] میزان العمل لا ٣٦.

کورتە و بەرهەمی ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێت کە ناگونجێت زانستێك بۆ ئەخلاق دابنرێت بەبێ ئەوەی زانستێکیش بۆ دەروون دابنرێت، بەڵکو زانستی ئەخلاق لەحەقیقەت و ڕاستیدا بریتیە لە زانستی دەروون بەمانای دانراو بۆ وشەکە، واتە دوور لە دەستێوەردانی میتافیزیکی، بەدەستەواژەی غەزالیش زانستی سیفەتەکانی دڵ.

# بەشی دووەم

# چاکەکاری

## ١ – حەقیقەتی نیەت و مەبەست:

شیکاری دەروونی بۆ ئەخلاق پەیوەندی بەهێزو نەپساوەی نێوان عەقڵ وەك ئەوەی کە سەرچاوەی فیکرەیە و حەقیقەتی هۆشیاری لەبارەی کردارو هەڵسوکەوت و هێزەکانی تری دەروونەوە واتە هێزی هەواو ئارەزوو هێزی تورەیی سەلماندووە. کە هەموو هەڵسوکەوتێك بەشێوە و ڕوویەك لەڕووەکان یەکێك لەم هێزانە بەشدارە تێیدا، وە هەروەها ئەوەشی سەلماندووە کە ئیرادە و وویست ڕۆڵێکی کاراو مەترسیداری هەیە چوونکە لەگەڵ پاڵنەرە دەروونیەکاندا دەچێتە ناو پەیوەندیەوە، کە بەهۆیەوە هەڵسوکەوتەکان بەپێی خۆی دیاریدەکات، دەتوانین ئەم بەدەستهاتووە بگێڕینەوە بۆ یەك مانا کە غەزالی پێی دەڵێت: (نیەت)، چوونکە لەڕێگەی پەیوەندی بە هۆشیاری و بیرکردنەوە و هێزی هەواو ئارەزوو تورەیی و پاڵنەر و توانا و هێزو ئیرادە و وویست و بەتایبەت مەبەست و ئامانجەوە دیاری و پێناسەی دەکات.

غەزالی پێناسەی نیەت دەکات و دەڵێت: (حەقیقەت و ڕاستەقینەیی نیەت بریتیە لە و وویست و ئیرادە بەدیهێنەرەی هێز کە لە مەعریفەوە سەرچاوە دەگرێت) [٢٥٨] نیەت لەسەر سێ مەرج وەستاوە کە یەکەمیان مەعریفەیە و دووەمیان ئیرادەیە و سێیەمیشیان هێزە، باسەکەشی بەو شێوەیە کە هەموو کردارەکانت دروست نین مەگەر بە هێزو ئیرادە و زانست نەبێت، زانست ئیرادە ڕادەپەڕێنێت و ئیرادەش هۆکاری بەدیهاتنی هێزە و هێزیش خزمەتکاری ئیرادەیە لەڕێگەی جولاّندنی ئەندامەکانی جەستەوە، نمونەکەشی: لەتۆدا ئارەزووی خواردن ئافرێنراوە بەلاّم لەوانەیە وەستاوو چەقبەستووبێت هەروەك بلێی خەوتووە، بەلاّم کاتێك چاوت بەخواردنێك دەکەوێت ئەوا مەعریفەت لەبارەی خۆراکەوە دەستکەوتووە، ئارەزووی خواردن ڕادەپەڕێت و دەستی بۆ درێژ دەکەیت، دەستدرێژکردنەکەش بەهۆی ئەو هێزەوە بووە کە گوێڕایەڵی ئاماژەی ئارەزووە. ئارەزووش بە وەدیهاتنی ئەو مەعریفەڕاپەڕیوە کە لە پێشەوەی هەستدایە...(نیەت بریتیە لە و حەزە بەبڕشتەی کە بەدیهێنەری هێزە) [٢٥٩].لەم دەقەوە ئەوە تێدەگەین کە هەموو هەڵسووکەوت و کردارێك بریتیە لەوەلاّمدانەوەی ئاماژەی ئارەزوو، ئارەزوو دەروون دەوروژێنێت و حەزی کرداری تێدا دروستدەکات، هەربۆیە لەکاتی بەدیهاتنی هێزدا کرداریش بەدی دێت. بەلاّم ئەوەندە هەیە کە ئەم هەواو ئارەزووە بەهۆی بەدیهاتنی مەعریفەوە دەوروژێت کە دەرئەنجامی وەدیهاتنی بەیەکگەشتنی هەستە لەگەڵ واقیعدا، هەرکاتێك حەزێکی بەبڕشت بەرامبەر شتێك یان کردارێك ڕوویدا ئەوکات هێزی جێبەجێکردنی دەردەکەوێت و نیەتیش وەدی دێت. ئەوەی کە داگیر دەکات

---

[٢٥٨] کتاب الاربعین فی اصول الدین لا ١٧١.

[٢٥٩] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەرە.

هۆکارەکەی بریتیە لە حەزکردن لەماڵ و سامان ئەوە نیەتەکەیەتی، هەندێکجاریش حەزکردنە بۆ بەدەستهێنانی پاداشتی ڕۆژی دوایی ئەوەش نیشانەی نیەتی ئەو کەسەیە.

کەواتە نیەت بریتیە لە ئیرادەی وەدیهێنەر، مانای دڵسۆزبوون و پاڵفتە بوونیشی بریتیە لە پاککردنەوەی هۆکارو بەدیهێنەرەکە لە ناپەسەندی و شتە زیادەکان. زۆر لێکردن لە هەڵسووکەوتی هۆشیارانەدا نیە چوونکە لەسەر ئیرادە وەستاوە هەرچەندە ئیرادەکە بەرهەمی فیکرەی وەدیهێنەری ئارەزووە. وەهەروەها ئەم نیەتەی کە وویست و ئیرادەی وەدیهێنەرە وا لە هەڵسووکەوت دەکات کە مەبەستی لەگەڵدا بێت و خاڵی بێت لەهەموو بێمانایی و هەوانتەییەك ئەم مەبەستەیە کە ماناکە دیاریدەکات، کەواتە هۆشیاری لەبارەی هەر هەڵسووکەوتێکەوە بریتیە لەو هۆشیاریەی کە لەناو مەبەستێکی دیاریکراودا هەیە. هەروەك چۆن نیەت وەك پەیوەندیەکی بەهێز وایە لەنێوان دەروون وەك هەڵسووکەوت و دەروون وەك وویژدان، هەموو هەڵسووکەوتێکی جەستەیی حاڵەتێك لەدەرووندا بەرهەمدەهێنێت هەموو حاڵەتێکیش لەدەرووندا هەڵسووکەوتێکی جەستەیی بەرهەمدەهێنێت، دڵیش دەکەوێتە ژێر کاریگەری کرداری ئەندامەکانی جەستەوە. مەبەست لەزەکات نەهێشتنی ماڵ و سامان نیە بەڵکو لابردنی خووی پەستی ڕژدی و ڕەزیلی و بەخیلیە ئەمەش پچڕاندنی پەیوەندی نێوان سامان و دڵە.

وەهەروەها ئامانج و مەبەست لە سەربڕدراوی قوربانی نە گۆشتەکەیەتی و نە خوێنەکەشی بەڵکو ئامانج و مەبەست لێی دروستکردنی هەستی نزیکبوونەوەیە لەخودا بەهۆی بەگەورەزانینی شیعارەکانی خودا لەنێو دڵی مرۆڤدا. کەواتە نیەت لە گەوهەرو ناوەڕۆکەکەیدا (بریتیە لە هەمان حەزی دڵ بۆ خێر کە توانای

بەدەستهێنانی مەبەستی هەیە کە باشترە لەکرداری ئەندامەکانی جەستە کە ئامانج لێی چوونی کاریگەریەکەیەتی بۆ شوێنی مەبەست کە دڵە.

نیەت قسەی دەروون نیە هەروەك کەسێك دەڵێت: نیەتم هەیە کە فلآنە کەسم خۆشبوێت یان نیەتم هەیە کە تینو بم یان برسی بم، چوونکە ئەمکارانە هۆکاری خۆیان هەیە، هەرکەسێك جیماعی کرد بەهۆی زاڵبوونی ئارەزوویەوە ئیتر ئەوەی کە دەڵێت: نیەتم هەیە جیماع بکەم بەمەبەستی وەچە خستنەوەو شانازیکردن بەزۆری منداڵەوە چ سودێکی پێدەگەیەنێت، بەڵکو مرۆڤ کاتێك نیەتی هەبوو بخوات و بخواتەوە بۆ ئەوەی لەپەرستشەکانیدا بەهێز بێت و هیچ نیەتێکی ڕۆژووگرتنی نیە ئەوکات خواردنەکە باشترە بۆی. وە هەرکەسێکیش لەزۆری پەرستشکردندا بێتاقەت بوو دەیزانی ئەگەر بخەوێت چالاکی بۆ دەگەڕێتەوە و پشوویەك دەدات ئەوا ئەو خەوتنە باشترە لە نوێژ و پەرستشێك کە بەبێزاری و بێتاقەتیەوە بیکات [٢٦٠].

کەواتە نیەت قسەی دەروون نیە و قسەیەکیش نیە کە مرۆڤ بەزۆر لەخۆکردن بیکات، بەڵکو بریتیە لە وویست و ئیرادەیەکی بەبڕشتی دڵسۆزانە و پاك کە هێزی کارکردن لەمرۆڤدا بەرهەمدەهێنێت، ئەمەش مانای حەزی ڕاستەقینەیە کە ئیمان و مەعریفەی تێدا بەمەرج گیراون و هەردوکیان ڕۆڵی بەرهەمهێنانی حەزکردن لەکاری چاکە و کردارە پەسەندەکان لە مرۆڤدا کە ئامانج لێیان پاداشتی ڕۆژی دواییە لە ئەستۆ دەگرن.

هەرکەسێك خۆی ناسی و خوداکەشی ناسی و جوانی دوونیاو قیامەتیشی ناسی ئەوکات بە ڕووناکی و نووری بەصیرەت و بینایی ڕووی دژایەتی دوونیا لەگەڵ قیامەتدا دەبینێت چوونکە بە تەواوەتی ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە بەختەوەری لە

---

[٢٦٠] کتاب الاربعین لا ١٧٥.

قیامەتدا نیە مەگەر بۆ کەسانێك نەبێت کە دەچنەوە بەر بارەگای خودا و باش دەیناسن و خۆشیاندەوێت، خۆشەویستی خوداش بەبەردەوامی زیکرو یادی خودا نەبێت نایەتەدی، مەعریفەش بەبەردەوامی خواستن و بیرکردنەوە دێتەدی. وازهێنانی دڵ لە غەیری خودا پێویستدەکات کە سەرقاڵبێت بە خۆشەویستی خودا و مەعریفە و ناسینیەوە. ئەگەر تۆ لەئەهلی بەصیرەت بیت ئەوا بویت بە یەکێك لەئەهلی زەوق و موشاهەدەو بینین، خۆئەگەر واش نەبیت ئەوا هەوڵبدە ببە بەیەکێك لەئەهلی چاولێکەری و باوەڕ [٢٦١].

ئەگەر بویتە ئەهلی بەصیرەت ئەوە وەدیهاتنی یەکەمین چاکەکاریەکانە و مەرجی بەدیهاتنی چاکەکاریەکانی تریشە، چاکەکاریەکان بەگشتی لە دوو مانادا کۆدەبنەوە یەکێکیان باشی بیرو زەین و جیاکردنەوەیە، دووەمیشیان ئەخلاق و ڕەوشتی جوانە [٢٦٢]. واتە چاکەکاریەکان کورتدەکرێنەوە لە هونەرێکی تیۆری و هونەرێکی کرداری و پراکتیکیدا. بەڵام باش و چاکی بیرو زەین جیاکاریدەکات لەنێوان ڕێگەی بەختەوەری(السعادة) و ڕێگەی بەدبەختیدا(الشقاوة) و کاری پێدەکرێت. حەقیش لەو شتانەی کە لەسەریەتی باوەڕی پێدەهێنرێت بەبەڵگە بەبڕشت و بەسوودەکان کە یەقین و دڵنیایی دەگەیەنن، نەك لەڕێگەی چاولێکەری گەلێکی لاوازو خەیاڵاتێکی وەهمیەوە [٢٦٣] ئەمەش بریتیە لەباب و بەشی حیکمەت و دانایی.

---

[٢٦١] هەمان سەرچاوە لا ١١١.

[٢٦٢] میزان العمل لا ١٤٩.

[٢٦٣] میزان العمل لا ٤٩.

لێرەدا زۆر گرنگ و بەسوودە کە ئاماژە بەوە بکەین کە زانستخوازی بریتیە لە بەدیهێنانی یەکەمین چاکەکاریەکان هەربۆیە لەوە تێدەگەین کە بۆچی ئیمامی غەزالی بەشوێن فێربوونی زانستدا گەڕاوە، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی

بەڵام ڕەوشتجوانی لەگەڵ ئەوەی کە هەموو خووە خراپەکان لادەبات و لەسەر نەریتە باش و جوانەکان ڕادێت و تامەزرۆیاندەبێت کاریگەری تێدەکەن و خۆشی و نیعمەتیان لێوەردەگرێت [٢٦٤]. ئەمەش باب و بەشی پاکداوێنی و ئازایەتیە.

کاتێك چاکەکاری و فەزیلەت لەم دوو هونەرەی تیۆری و کرداریدا کۆببێتەوە ئەوکات نیەت دەبێتە مەرجی یەکگرتوو بەدیهێنەری ئامانجی هەردووکیان چوونکە هەردووکیان لەسەر تێڕوانین و کردار وەستاون و تێکەڵ و ئاوێتەی یەکترن و یەکگرتووشن بۆ ئەوەی یەك هێز بخولقێنن کە هێزی کردارە. کەواتە نیەت بریتیە لە هێزی کردارو گەوهەرو ناوەڕۆکەکەی، وە هەروەها جیاوازیشە لە چاکەکاری و فەزیلەت، بەمشێوەیە ناتوانین نیەت لە کردار یان بەپێچەوانە وە جیا بکەینەوە چوونکە کرداری بێ نیەت شتێکی بێماناو هەوانتەیە یان کاردانەوەیەکی بێ وویست و نامەبەستە، نیەتیش بەبێ کردار وەهمە و هەرگیز نایەتەدی [٢٦٥].

ئەگەر ئەمە پێناسەی نیەت بێت و بەمشێوەیەش چاکەکاری و فەزیلەت جیابکرێتەوە لەچەمکەکانی تر، ئەوا بەدیهێنانی چاکەکاری پێویستی بەکردارێکی

---

تریشەوە لە قوڵی ئەو پەیوەندیە تێدەگەین کە غەزالی دروستیکردووە لەنێوان زانستخوازی و چاکەکاریدا ئەمەش مانای ئەوەیە کە زانست تەنها ئامێرێکی ئیدراك و تێگەشتن نیە بەڵکو ئامێرێکی بەدیهێنانی چاکەکاریشە، کاتێك زانست هاوتەریبی چاکەکاریە ئەوکات ئەو نمونە شارستانیەی کە دواتر ڕیزبەندیدەکات بەدڵنیاییەوە جیاوازدەبێت لە نمونەی شارستانیەتی مادی هاوچەرخ کە جیاکاری دەکات لەنێوان زانست و بەهاکاندا بەبیانوی بابەتی بوون، هەموو تەسەوورێك بۆ زانست و بەهاکان بریتیە لە تەسەوورتێڕوانین بۆ شارستانیەت و بوون.

[٢٦٤] هەمان سەرچاوە لا ٥٠.

[٢٦٥] دەستکەوتی بەرابەرکاری لەنێوان چەمکی نیەت لەلای غەزالی و لای کانت دەکرێت دەرئەنجامگەلێکی ئەرێنیمان پێبدات و ئەوە ڕوونبکاتەوە کە چۆن و بەچ شێوەیەك چەمکی نیەت لەلای هەردوو فەیلەسوف نزیکە لەیەکەوە بەڵام بەجیاکردنەوەیەکی پێویست نیەت لەلای غەزالی زۆر ووردتر و قوڵترە چوونکە ناکەوێتە ناو شێوازیی بوونی ئەخلاقەوە هەروەك ئەوەی کە نیەت لەلای کانت کەوتووەتە ناو ئەو شێوازی بوونەوە. سەیری بەشی تایبەت بەنیەت لە کتێبی( فەلسفە الاخلاقیە فی الفکر الاسلامی) احمد محمود صبحی بکە.

پەروەردەیی تایبەت هەیە، چوونکە چاکەکاریەکان بەدەستهاتوون و بەهۆی پەیڕەوکردن و خۆڕاهێنان و لەخودا ترسانەوە(التقوی) دێنەدی، بەپێی گەشەی زەینی مرۆڤ و زیرەکیەکەی. ئەم پەیڕەو کردن و خۆڕاهێنانەش یان بەفێربوونە یان بە نەریت و خوو پێوەگرتنە، بەلاَم چاکەکاری لە هەڵسووکەوتدا تاوەکو پلەی دەرچوونی لەخودەوە بەبێ فیکرو دید و ماندوبوون دەبێت، ئاگادارو شارەزای حەقیش دەبێتەوە بەبێ هیچ ماندوبوونێکی دوورودرێژ هەردەڵێی لەوەوە دەردەچێت ئەویش لە بێئاگاییەکەیدایەو وەك ئەو پیشەگەرە لێزانە وایە لەبەرگدوری و نوسەریدا [٢٦٦]. چاکەکاری لەگەڵ زۆر لەخۆکردندا دەبێت لەیەکەم سەردەمدا بۆ ئەوەی لەگەڵ کاتدا ببێتە تەبع و سروشت [٢٦٧].

## ٢ – دایکی چاکەکاریەکان:

کاتێك دەروون بە کەموکورتی دەخولقێنرێت و بەپاککردنەوە و تەزکیەو پاڵفتەکردنی ئەخلاق و خۆراکپێدانی بەزانست کامڵدەبێت، ئەوکات چاکەکاری دەبێتە ناونیشانی کامڵبوونی دەروون و ئامێرێك بۆ وەدیهاتنی بەختەوەری چوونکە بەختەوەری هەموو شتێکە و لەزەت و خۆشیەکەشی لە گەشتنیدایە بەکەماڵی تایبەت بەخۆی [٢٦٨]. بەختەوەری بەدەستنایەت مەگەر بە پاککردنەوەی دەروون و کامڵکردنی نەبێت. ئەگەر دەروون هێزی هەبێت ئەوا کامڵبوونەکەی شتێك نیە

---

[٢٦٦] میزان العمل لا ٥٠.

[٢٦٧] ئەم مانایە مانایەکی ترمان وەبیر دەهێنێتەوە کە غەزالی پشتی پێبەستبوو ئەویش ئەوەیە کە هەموو کردارێك لە کردارەکانی جەستە حاڵەتێك لە دەرووندا وەدی دەهێنێت، هەموو حاڵەتێکیش لەدەرووندا کاریگەری و شوێنەوارەکەی لەسەر جەستە دەردەکەوێت.( میزان العمل لا ١٥).

[٢٦٨] میزان العمل لا ١٥.

بێجگە لەکامڵبوونی هێزەکانی کە بریتین لە هێزی توڕەیی و هێزی عەقڵ و هێزی هەواو ئارەزوو. کەواتە چاکەکاری لەلای ئیمامی غەزالی بریتیە لەو کامڵبوونە تایبەتەی کە بەهۆی ئەم هێزانەوە دروستدەبێت: چاکەکاری حیکمەت و دانایی چاکەکاری ئازایەتی و چاکەکاری پاکداوێنی و چاکەکاری چوارەمیش کە بەهۆی ئەمانەوە دروستدەبێت بریتیە چاکەکاری دادگەری.

غەزالی لەم پێناسە کردنەدا شتێکی نوێی پێشکەش نەکردووە چونکە کەلتوری فەلسەفی یۆنانی و ئیسلامی پێشتر پشتی بەم دابەشکردنە بەستووە، واتە ئەو جیاوازیانەی کە لەنێوان فەیلەسوفەکاندا بوونیان هەیە لەم بوارەدا نەگەشتوونەتە ئاستی دژ بوون و جیاوازی ڕیشەیی، بەڵکو جیاوازی گەلێکن لە شیکاری و لێکۆڵینەوەدا کە شاهێدی ئەوە دەدەن فەیلەسوفەکان لە چارەسەرکردنیان بۆ مەسەلەی ئەخلاق گەشتوونەتە کۆتایی کێشەی چاکەکاری و پەیوەندی بەهێزەکانی دەروونەوە، بەڵام ئەرستۆ بەردەوام وەك مەرجەعی بنەڕەتی دەمێنێتەوە چوونکە نامە ئەخلاقیەکەی بۆ نیقوماخوس بەو پەڕی ووردی و گونجاویەوە نوسراوە کە شیکاری ئەخلاق دەکات و دەیگێڕێتەوە بۆ هێزەکانی دەروون و بەدەستهێنانی چاکەکاری و فەزیلەت کە بەپێی بۆچوونی فرنسوا گریگورا ئەرستۆ پێناسەی کردووە بەوەی کە(چاکەکاری هەروەك نامەی بەناوبانگی ئەخلاق بۆمان پێناسە دەکات کە ناردویەتی بۆ نیقوماخوس بریتیە لەنەریت و ئامادەباشیەکی قوڵ و ڕەگ داکوتاوی بەدەستهاتووە بۆ دوورکەوتنەوە لەهەر توندڕەویەك و پاراستنی مامناوەندیەتی ڕاست و دروست لە هەموو شتەکاندا)[٢٦٩]. ئەرستۆ دەڵێت: (چاکەکاری و فەزیلەت لە مرۆڤدا بریتیە لەو چۆنیەتیە ئەخلاقیەی کە دەیکاتە

---

[٢٦٩] المذاهب الأخلاقية الكبرى لا ٤١ فرانسوا گريگورا ترجمة قتيبة المعروفي.

پیاوێکی چاك و باش و بەڕێز لەبەرئەوەی کە دەزانێت ئەرکی تایبەتی خۆی ڕاپەڕێنێت و جێبەجێی بکات) [٢٧٠] (بەمشێوەیە ئێستە چاکەکاری بریتیە لەجۆرێکی مامناوەند مادەم مامناوەند بوون ئەو ئامانجەیە کە بەبێ دابڕان و بەشێوەیەکی بەردەوام داوای دەکەین) [٢٧١].

پێناسەی ئەرستۆ بۆ چاکەکاری بەزاڵی ماوەتەوە بەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەخلاقیدا، غەزالیش یەکێکە لەوانەی کە سودیان لەم پێناسەیە وەرگرتووە، هەرچەندە خاڵی بنەڕەتی بیرکردنەوەکەی وەك پێویست ئەرستۆیی نیە چوونکە چەمکی مامناوەندی و ڕاسترەوی چەمکێکی قورئانیشە کە هاتووە و دەفەرمێت(الصراط المستقیم) واتە مامناوەندی ڕێك و ڕاست لەنێوان دوو دژی زیادەڕەوی و توند ڕەویدا. غەزالیش چەندین ئایەت و حەدیسی هێناوە کە باسی ئەم مانایە دەکەن، بەتایبەت ئەو ئایەتانەی کە لەسورەتی(هود) دا هاتوون وەك(فاستقم کما امرت) واتە: ڕێك و ڕاست و مامناوەند برۆ هەروەك ئەوەی کە فەرمانت پێکراوە، ئەمەش ئەو سورەتەیە کە پێغەمبەر لەبارەیەوە دەفەرمێت(سورەتی هود پیری کردم) ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە بەردەوامبوون لەسەر ئەم ڕێگە ڕاستە و داواکردنی مامناوەندی لەنێو ئەم لایەنانەدا توندە و لەشیعرووردتر و لەشمشێر بڕندە ترە هەروەك چۆن باسی باریکی پردی سیرات دەکرێت لەقیامەتدا، چوونکە مرۆڤ لەسەر ئەوشتە دەمرێت کە لەسەری ژیاوە و لەسەرئەوەش حەشر دەکرێت کە مردووە لەسەری، هەربۆیە لە هەموو ڕکاتێکی نوێژدا پێویستە سورەتی فاتیحە بخوێنرێت کە(اهدنا الصراط المستقیم) ی تیایە

---

[٢٧٠] ئەرستۆ نامەی ئەخلاق بۆ نیقوماخوس ك ٢ ب ٦ ف ١٤.

[٢٧١] ئەرستۆ: نامەی ئەخلاق بۆ نیقوماخوس ك ٢ ب ٦ ف ١٤.

چوونکە ئەمە ئاڵۆزترین و نارەحەتترینی مەسەلەکانە لەسەر خوازیاری بەهەشت [٢٧٢].

## أ – چاکەی حیکمەت و دانایی:

خودای گەورە بڕیاری حیکمەت و دانایی بۆ خۆی داوە کە کاری چاکەی هێزی عەقڵیە(ومن یؤت الحكمة فقد اوتی خیرا كثیرا) واتە: هەرکەسێك حیکمەت و دانایی پێبەخشرا ئەوە خێرو بێرێکی زۆری دەستکەوتووە.لەبەر ئەوەی دەروون دوو هێزی هەیە: هێزێکی تیۆری و هێزێکی کرداری هەر هێزێك حیکمەتی خۆی هەیە، حیکمەتی تیۆری بریتیە لەو حیکمەتە ڕاستەقینە بەرجەستەکراوەی کە زانیاری لەبارەی خودا و سیفەتەکانی و هەموو زانستە یەکەمین و گشتیەکانەوە هەیە وەك بنەماکانی عەقڵ، لەگەڵ حیکەمەتی ئەخلاقی کە لەکرداری عەقڵی کرداری و سیاسەتەکەیدا بۆ هێزەکانی دەروون و وولاّت و ماڵ بەرجەستەیە واتە زانست لەبارەی کارە چاکەکانەوە [٢٧٣]. ڕێکخستن و جوان بەڕێوەبردن و باشی بیرو زەین و

---

[٢٧٢] میزان العمل لا ٥٧.

لەو ئایەتانەی کە مانای مامناوەند بوون و ڕێگەی ڕاست دەگەیەنن( والذین اذا انفقوا ولم یسرفوا وكان بین ذالك قواما) الفرقان ئا ٦٧. واتە: ئیمانداران ئەوانەن کاتێك دەبەخشن ئیسراف و زیادەڕەوی ناکەن و ڕێگەی مامناوەند و وەسەت دەگرن.

وە هەروەها دەفەرمێت( ولاتجعل یدك مغلولة الی عنقك ولا تبسطها كل البسط فتقعد ملوما محسورا) الاسرا ئا ٢٩. واتە: هێندە ڕەزیل و چروك مەبە و دەست مەنوقێنەو مەیبەرەوە بۆلای گەردنت وهێندەش دەستبلاّو مەبە کە بێ ماڵ و دارایی بمێنیتەوە.

وەهەروەها دەفەرمێت( وكذالك جعناكم امة وسطا لتكونوا شهداء علی الناس) البقره ١٤٣. ئێمە ئێوەمان کردووەتە نەتەوە و ئوممەتێکی مامناوەند بۆ ئەوەی ببنە شاهێد بەسەر خەڵکیەوە

[٢٧٣] میزان العمل لا ٥٦.

پاکیەتی بۆچوون و گومانی باشیش دەچنە ناو چوارچێوەی چاکەی حیکمەت و داناییەوه [٢٧٤].

باش بەڕێوەبردن شوێنەوارەکانی لە تێڕوانینی باشدا بەدەردەکەوێت لە دەرهێنانی ئەوەی باشترو چاکترە لە بەدەستهێنانی خێرو بێرەگەورە و ئامانجە بەڕێزەکان کە پەیوەستن بەخودەوە یان بە خەڵکی ترەوە لە ڕێکخستنی ماڵ و سیاسەتی وولآت، لەمبارەیەوە گرنگی بیرو زەین دەردەکەوێت، لە حوکمدان و جیاکردنەوەدا، بەلآم بەبێ ئەوەی کە بکەوینە ناو تێکەڵبوون لەگەڵ هەڵوێستی موعتەزیلە کەلەسەر بنەمای جوان و ناشیرینی عەقڵی وەستاوە، غەزالی بەڕێڕەوەکەی ئەواندا ناچێت، بەڵکو لەدژیشیان دەوەستێت، گرنگی زەین لە حوکمی ئەخلاقیدا مانای بنیاتنانی ئەخلاق نیە لەسەر عەقڵ، چوونکە بینیمان کە ئەخلاق بەزانست و نەریت بەدەستدێت. لێرەدا مەبەست لەزەین ئەو هێزەیە کە مرۆڤ بەدەستی دەهێنێت کاتێك عەقڵی کرداری دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی عەقڵی تیۆریەوە و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەکات و نەفس دەکەوێتە ژێر کاریگەری بەخشندەیی و زانستی خوداییەوە سەرەڕای ئەو هەڵسووکەوتەی کە ڕاهێنان پاکی کردووەتەوە و موجاهەدە بەهێزی کردووە، ئەوەی کە لەباب و بەشی زانستدا بینیمان گرنگی چاکەکاری حیکمەتمان بۆ ڕووندەکاتەوە [٢٧٥].

باشی دیدو بۆچوون کاریگەری و شوێنەوارەکەی لە بیری باشدا دەردەکەوێت کە توانایە بەسەر حوکمی باشدا لەکاتی هەڵەی بۆچوونەکان و کڵپەی کێشەکاندا، پاکی بۆچوونیش بریتیە لە خێرا وەستانە لەسەر هۆکارەکان کە لەکاروبارەکاندا مرۆڤ

---

[٢٧٤] میزان العمل لا ٦٠.

[٢٧٥] سەیری مەرجە دەروونیەکان بکە بۆ زانست.

دەگەیەنێتە دوارۆژی باش، گومانی باشیش بریتیە لە هاوڕابوون و گونجان لەگەڵ زانستدا بەبێ یارمەتی وەرگرتن لە بیرکردنەوەی بەڵگەکان [٢٧٦].

ئەگەر چاکەی حیکمەت و دانایی خۆی لە تەگبیرو بەڕێوەبردنی باش و بیری باش و پاکی بۆچوون و گومانی باشدا ببینێتەوە ئەوا کاری ئەخلاقی لەلای ئیمامی غەزالی بە هۆشیاریەکی بەهێزو تەندروست دەوورە دراوە، کەواتە دروست نیە کە حوکم بەبەهای هەڵسووکەوتێك بکەین کە خاوەنەکەی توانای حوکمکردنی نەبێت یان خودەکەی ئامادە نەبێت یان لەژێرکاریگەری هێزەدەروونیەکانی تری وەك توڕەیی و هەواو ئارەزوودا بێت، چاکەی حیکمەت چاکەکاریەکانی تریش دەگرێتەوە چوونکە لەسەر بنەمای هەڵبژاردن وەستاوە، پێویستە لەم بوارەشدا بەرێزەوەکەی فرۆیددا نەچین لە گێڕانەوەی هەڵسووکەوتی ئەخلاقی بۆ جۆرێك لە سەرکوتکردن و کپکردنەوەی ناهۆشیارانەیە چوونکەچاکەکاری حیکمەت زامنی ئامادەباشی بەردەوامی هۆشیاریەو توانای پەیڕەوکردنی کارەکانیەتی بەبێ ئەوەی بکەوێتە ناو پەستیەکانەوە، مەبەستیشمان لەپەستیەکان پەستی فێڵبازیە کە جەربەزەیی و بلیمەتی لەبەرامبەریەوە بوونیان هەیە، لەگەڵ کرداری پەستی بێ عەقڵی کە گێژ و گەمژەیی و شێتی لەبەرامبەریەوە بوونیان هەیە [٢٧٧].

کورتە و بەهەمی قسەکە لەباسی ئەم چاکەیەدا ئەوەیە هەرکاتێك عەقڵ هۆشیار بوو لە عەقڵگریەکەیدا و توانای جیاکاری و حوکمی هەبوو بەرچاو ڕوون بوو بەشەرع

---

[٢٧٦] میزان العمل لا ٦١.

[٢٧٧] میزان العمل لا ٦١.

فێڵبازی بەپێی قسەی غەزالی جۆرێکە لە و حاڵەتەی کە مرۆڤ تێیدا زۆر فێڵباز دەبێت و توڕەیی و ئارەزوو بێ عەقڵیەکەی بەرەڵا دەکات کە لایەنی کەموکورتی و سەرچاوەی خاوی تێگەشتنی ئەون کە دەبێتە هۆی کەمتر زانینی کارە چاکەکانەوە.( معارج القدس لا ٩٤).

ئەوکات ناکەوێتە زیادەڕەویەوە کە بەهۆیەوە بکەوێتە سیفەتی پەستی فێڵبازیەوە کە لەژێریدا بلیمەتی و جەربەزەیی خۆیان حەشارداوە، ناشکەوێتە خاوڕەوی و گوێ پێنەدان و ئیهمالیەوە تاوەك بکەوێتە ناو پەستی بێعەقڵیەوە کە گێژی و گەمژەیەی و شێتی تێدایە، ئەگەر دیکارت بەوە ڕێنمایی کراوە کە گوتوویەتی مرۆڤ تەنها ئەوەی بەس نیە کە عەقڵی هەبێت بەڵکو دەبێت باشیش بەکاری بهێنێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کە پێویستە مرۆڤ ملکەچبکات بۆ یاساو ڕێساکانی پڕۆگرامەکە، چوونکە غەزالی پێی وایە کە پێوەری زانست(معیار العلم) هەرچەندە زامنی ئەوە بۆ عەقڵ دەکات کە بگاتە یەقین ئەوا(میزان العمل) گرنتی گەشتنی مرۆڤ دەکات بە چاکەکاری. حیکمەتیش تەنها بە کۆبوونەوەی یەقین و چاکەکاری دەبێت هەرچەندە یەکێکیان بەپێی قسەی غەزالی دەبێتە هۆی وەدیهاتنی ئەویتریان [٢٧٨] چوونکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا هێزی توڕەیی و ئارەزوو لەحاڵەتێکی مامناوەندیدان و لەژێرکاریگەری هێزی عەقڵیدان، چاکەی حیکمەت و دانایی دژی هێزەکانی توڕەیی و ئارەزوو نیە بەڵام لەکاتی پێویستیدا حیکمەت بەکاریدەهێنێت واتە دووکاری چاکەی لێ درووستدەکات چاکەی ئازایەتی و چاکەی پاکداوێنی.

---

[٢٧٨] دانانی حیکمەت لە پلەی چاکەکاریەکاندا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گەوهەرو ناوەڕۆکی شارستانیەت و هەموو جۆرەکانی داهێنانی تەنها دەبێت ئەخلاقی بن. شارستانیەتی هاوچەرخی ئێمە یان نمونەی شارستانی زاڵ و بەدەسەڵاتی ئەمریکی کۆمەڵگەی بەکاربەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شارستانیەت هەرکاتێك لەبەهاکانی چاکەکاری داڕنرا، دەبێتە چەکێکی کوشتندە، ئەو عەقڵەی کە توانای بنیاتنانی هەیە توانای وێرانکاریشی هەیە لەوانەیە ئەم حاڵەتە بێت کە فەیلەسوفەکان نازەنیانکردووە بە کێشە کە بانگەوازەکەی بەناوی نەجاعەوە لەبری بەهاو قیەمەکان دەبیستین هەروەك لەباسەکانی مارکیوزدا هاتووە کە ڕەخنە لە کۆمەڵگەی ئەمریکی و کۆمەڵگەی بەکاربەر بەگشتی دەگرێت.

## ب – چاکەی ئازایەتی:

غەزالی بەمشێوەیە پێناسەی دەکات(ئازایەتی بریتیە لە چاکەی هێزی توڕەیی چوونکە بەهێزە و لە گەڵ هێزی توڕەییدایە و ملکەچە بۆکاری تەمبێکراو بەشەرع لە دەستپێشخەریەکانیدا ئەمەش ڕێگەیەکی مامناوەندە لەنێوان هەردوو پەستیەکەیدا کە هەڵچوون و ترسنۆکیە، بەم ئایەتە قورئانیەش پشتگیری ئەم چاکەکاریەی کردووە کە دەفەرمێت(اشداء علی الکفار رحماء بینهم) [٢٧٩] واتە: توندن لەگەڵ کافران و بەبەزەیین لەنێوان یەکتریدا.

هێزی توڕەیی لەو هێزە نەزعەییە شەوقیانەیە کە هۆکاری جوڵەیە لەوانەش هێزی ئارەزوو واتە هەردووکیان لە هێزەکانی جەستەن لەناخی مرۆڤدا کە پێیاندەگوترێت حەیوانی، هەربۆیە زۆر پێویستن و ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن بۆ پاراستن و مانەوەی دەروون و بەدیهێنانی کامڵبوونەکەی، ئەمەش کاتێکە کە تەمبێ بکرێت بە عەقڵ و شەرع، چەندین کاری چاکەی تریش دەچنە ناو چوارچێوەی ئەم کارەچاکەوە وەك بەخشندەیی و بەدەمەوە بوون و دەروون گەوریی و سەبرو خۆڕاگری و تەحەمولکردنی خەڵکی خۆڕاگری و ئازایەتی و بەجەرگی و حەیاو حیشمەت، هەریەکە لەم کارە چاکانە دەکەونە نێوان دوو پەستیەوە. بەخشندەیی دەکەوێتە نێوان ڕەزیلی و دەستبڵاویەوە، یارمەتیدان و بەهاناوە چوونیش دەکەوێتە نێوان ئازایەتی و سەرشۆڕیەوە، گەورەیی دەروونیش دەکەوێتە نێوان خۆبەزل زانین و خۆبەکەم زانینی نابەجێوە، خۆڕاگریش دەکەوێتە نێوان هەڵچوون و داماویەوە، ئازایەتیش بریتیە لەسوربوون لەسەر کارەکان وەك چاوەڕێکردنی جوانی، بێ فیزیش دەکەوێتە نێوان خۆبەگەورەزانین و ملکەچیەوە.

---

[٢٧٩] میزان العمل لا ٥٦.

ئەگەر کاری چاکەی هێزی تورەیی بریتی بێت لە کامڵبوونی ئەوا کامڵبوون لە چەند مانایەکی بەرزو ئەرێنیدا خۆی بەرجەستە دەکات و مرۆڤ والێدەکات ببێتە خاوەن کەسایەتیەکی بەهێزی باوەڕدار بەخۆی کە توانای بەدیهێنانی ئامانجەکانی هەبێت، چوونکە ئەم کارەچاکانە متمانە بوون بەدەروون دروستدەکەن و ئامادەی دەکەن بۆ کاروبارە بەڕێزەکان و دەیکەنە پەڕژینی جوانی و تەنها هەوڵی بەدیهێنانی دەدەن.

ئەم کارەچاکانە دەتوانن کارە باشەکان وەدی بهێنن و خۆیان لە کاروکردارە قەدەغە و ناباشەکان دووربخەنەوە. کاری باشیش لەلای غەزالی لەدوو شوێندا دەبینین یەکێکیان پێی دەگوترێت غیرە و دووەمیشیان پێی دەڵێن تورەیی لەکاتی بینینی خراپەو تاوانەکاندا، وەك بوێریەك لەبەرامبەر شکاندنی فەرمان و قەدەغەکراوە ئاینیەکانەوە. یەکەمیان بۆ پاراستنی وەچە و نەوەکانە و دووەمیشیان بۆ پاراستنی دین و ئاینە[٢٨٠] چاکەکاری ئازایەتیش دووپەستی

---

[٢٨٠] میزان العمل لا ٨٤.

گرنگیدان بە پەروەردەکردنی هێزی تورەیی بۆ بەدەستهێنانی کامڵبوونە خودیەکەی کارێکی پێویستە بۆ بنیاتنانی کەسایەتیەکی رێك و مامناوەند. کۆمەڵگە لاوازەکان بریتین لەو کۆمەڵگانەی کە گرنگی بەم هێزە نادەن و پشتگوێیان خستووە، هەربۆیە دەیانبینین لەبەرامبەر هەوائارەزووەکانیان و دووژمنەکانیاندا بێ هێزو لاوازن. هەربۆیە دووژمنانیان چۆنیەتی زاڵبوونیان زانیوە بەسەریاندا واتە بەهێزی هەواو ئارەزوو شەهوەتی خۆیان و دوورخستەوەیان بەهۆیەوە لەچاکەکاریەکان. ئەمەش ناوەڕۆکی دەزگای سەرمایە داری و ناخی کۆمەڵگەی بەکاریەری / سەریازیە، واتە بەهێزکردنی دەروون و سوپاکان لە هەموو هێزە تورەییەکان، هەربۆیە پێی دەگوترێت توخمی هێزو زاڵبوون. لەبەر ئەوان وەهان هەربۆیە دووژمنانی ئوممەت بەم دووشتە هەمیشە لەبۆسەدان لەبەر ئەوەی سەرچاوەی لاوازیانن هەروەك دژەکانیان دەبنە سەرچاوەی هێزی ئێمە، هەربۆیە بەزاندنی ئێمە لەلایەن ئەوانەوە بەدووشت دەبێت: رێگە نەدانمان بە بەهێزکردنی سوپاکانمان لەلایەك و رێگەنەدانیش بەبەهێزکردنی دەروونەکان لەلایەکی ترەوە. رێگەی ئەمەش پەلکێشکردنمانە بۆ نێو یاری جیهانگیری ئیتر بە خۆوویست بێت یان بەزۆر کە وەك گرنتیەکی مانەوەی خۆیان و دژایەتیکردنی بوونی ئێمە

لەبەرامبەریەوە بوونیان هەیە ئەوانیش وورە ڕووخان و ترسنۆکیە کە بێشەرمی و خۆبەکەمزانین و خۆ بەگەورە زانین و ڕەزیلی و لەخۆبایی بوون و سوکایەتی دەچنە چوارچێوەی ئەم دوو سیفەتە پەستەوە(ترسنۆکی و بیٚ وورەیی) هەرسیفەتێك لەم سیفەتانە کە بەرەو کەموکورتی دەچن ئەوە دەچنە چوارچێوەی ترسنۆکیەوە [٢٨١] بەمشێوەیە چاکەکاری هێزی توڕەیی لە بەدیهێنانی ئازایەتیدا کورتکراوەتەوە، مەرجی وەدیهاتنیشی ملکەچکردنە بۆ هێزی عەقڵی کرداری کە ئەویش ملکەچە بۆ عەقڵی تیۆری.

## ج — چاکەی پاکداوێنی:

غەزالی پێناسەی دەکات بەوەی کە(پاکداوێنی چاکەکاری هێزی ئارەزووە کە ملکەچبوونیەتی لەسەر ئاسانکاری بۆ هێزی عەقڵی بۆ ئەوەی بڵاو بوونەوە و هاتنەوە یەکی بەپێی ئامارەکانی بێت، کە هەر دوو سیفەتی پەستی بێهێزی و گێلی هاوشانی دەوەستنەوە. [٢٨٢] بەدیهاتنی ئەم چاکەکاریەش لەسەرهەڵسووکەوت قورسترە بەتایبەت کاتێك مرۆڤ لەسەر زیادەڕەوی ڕاهاتبێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە هێزەکانی هەواو ئارەزوو لەڕووی بوونەوە لەکۆنترین و بەهێزترینی هیزەکانن

---

دروستیانکردووە، لەوانەیە بیرکردنەوە لە ڤاتیکانێکی ئیسلامی( مەککە و مەدینە) لەبەرامبەر ڤاتیکانی ڕۆماوە گڵۆپی سەوز بۆ دەسەڵاتی مەرکەزی خۆرئاوا و ئەستێرەی دەریایی بەکاربەری بە هەموو دیاردەکانیەوە دابگیرسێنێت لەژێر بانگەشەکانی ڕینانیەتدا کە بانگەشەی ئازادی و گەشە سەندنن. هەرکەسێك پیرۆزی ئەوێت ئەوا ڤاتیکان تایبەتە بەوەوە( مەککە و مەدینە). بەڵام ئەوەی لەمە بەدەرە هەموو شتەکان ئاسایین و شیعاری ژیان تێیدا ئەوەیە کە دەڵێت( ئەی جەستە بەکاربەرە، بۆ ئەوەی بەکاربەریت دەبێت بەکار ببرێیت.

[٢٨١] میزان العمل لا ٦٢.

[٢٨٢] میزان العمل لا ٥٨.

لەڕووی بوون و هێزو کاریگەریەوە، بەڵکو دەتوانین بەجوڵێنەری زۆر بەهێز بۆ کامڵبوونی کەسایەتی بزانین، کە غەزالی بەمشێویە باسیدەکات(کەمی خواردن کە دایکی شتەکانە چوونکە گەدە سەرچاوەی هەواو ئارەزووەکانە، لەبەر ئەوەی لەوەوە ئارەزووی داوێن جیادەبێتەوە و دواتریش کاتێك ئارەزووی خۆراك و ئارەزووی داوێن جیابوویەوە بەدوای خۆیدا ئارەزووی حەزکردن لەماڵ و سامانیش دروستدەبێت و جیادەبێتەوە، چوونکە جێبەجێکردنی هەردوو ئارەزووەکەی پێشوو تەنها بە پارە و سامان دەبێت، لە ئارەزووی پارەوسامانیش ئارەزووی سەرمایەداری و پلەو پایە دروستدەبێت چوونکە بەبێ پلەو پایە مرۆڤ ناتوانێت پارەو سامانی زۆر بەدەست بهێنێت، دواتریش بەهۆی بەدەستهێنانی پلە و پایە و سامانەوە ئافەت و دەردەکان ڕوو لەمرۆڤ دەکەن وەك: هەوابازی و ڕیاکاری و ئیرەیی و حەسادەت و ڕق و کینە و دووژمنکاری و چەندین شتی تر کە سەرچاوەی هەموو ئەمانە ووزگە) [٢٨٣].

هێزە ئارەزووبازیەکان لەهێزە جوڵێنەرەکانە و ڕۆڵێکی بنەڕەتی و مەترسیداری هەیە سەبارەت بەخود و ئەو پەیوەندیەی کە لەنێوان خودەکاندا هەیە، ئەم ڕۆڵەش هەندێکجار دەبێتە هۆی کامڵبوونی خود و چاکەکاریەکەی دێتەدی واتە پاکداوێنیەکەی، دواتریش لەوانەیە بەرەو پەستیەکەی بڕوات کە زیادەڕەوی و خاو ڕەویە لە هەواو ئارەزوودا. عەقڵی کرداریش لەسود وەرگرتنی لە خێرو بەرەکەتەکانی عەقڵی تیۆری ڕۆڵی ئارەزوو گرنگیەکەی هەستپێدەکات، وەهەروەها هەست بە گرنگی ڕێکخستن و فەرمانڕەوایی و ئاراستە کردن دەکات، دەنگی جەستە بەبەردەوامی زیندووە چوونکە هۆکاری ژیانی خودی جەستە خۆیەتی،

---

[٢٨٣] کتاب الاربعین فی اصول الدین لا ٧٨.

ئارەزوو هۆکارێکە پەیوەستە بەژیانەوە و داواکردنیش پێویستە بەپێی خواستی سروشتی مرۆڤایەتی، لەژێر دروستکردنی هەردوو ئارەزووەکەدا(واتە حەزی وورگ و داوێن، دوو حیکمەتی گەورەن، مانەوەی تاکەکەس بە خۆراك و جۆری مرۆڤیش بە وەچە خستنەوە ئەمانە هەردووکیان پێویستن لە بووندا بەپێی وویست و جێبەجێکاری نەریت و سوننەت و وویستی ئەزەلی خودایی کە گۆڕانی بەسەردا نایەت، دووەمیش هاندانی خەڵکە لەسەر بەختەوەریە قیامەتیەکان چوونکە هەستیان بەو خۆشی و ئامێرانە نەکردووە، حەزیان لەبەهەشت نەکردووە و خۆیان لەئاگری دۆزەخیش لانەداوە، ئەگەر وادەی ئەوەیان پێ بدرایە کە نە چاو بینیویەتی و نە گوێش بیستوویەتی و نە بەدڵی کەسیشدا هاتووە هەرگیز ئەمە بەتەنهایی کارینەدەکردە سەر دڵ و دەروونیان ئەمەش پێناسە و سنوری پاکداوێنیە [٢٨٤].

هەموو هێزێك هەرکات پەیوەستبوو بە ئامانجەکەیەوە ئەوا گەشتووە بە کامڵبوونە تایبەتەکەی و چاکەکاریەکەی بەدەستدەهێنێت، پاکداوێنیش بریتیە لەچاکەکاری هێزی ئارەزوو کە وەك دەرئەنجامی ئاراستەکردنی ئەم هێزەیە بەرەو ئامانجە تایبەتەکەی، مەبەستمان پێی وەدیهاتنی مانەوەی خودی و جۆریەتی. کاتێك هەڵسووکەوت ئامانجەکان فەرمانڕەوایی بەسەردا دەکەن ئەوا هەڵسووکەوتی تایبەت بەم هێزە پەیوەستە بەئامانجەوە لەسەر ئاستێکی مامناوەند وەستاوە بەبێ ئەوەی بکەوێتە هەردوو پەستیەکەوە(زیادەڕۆیی کردن لەهەواو ئارەزوو لەخوددا بەلای هێزی عەقڵیەوە شتێکی ناشیرینە و رێگریشی لێدەکات). خاوی و

---

[٢٨٤] میزان العمل لا ٥٩، تێبینی بکە کە غەزالی نرخ و بەهایەکی زۆر دەدات بەخۆشی جەستەیی و دەیکاتە رێگەیەك بۆ هەستکردن بە خۆشی قیامەتی.

بەکارنەهێنانی ئارەزووش وەك پێویست بریتیە لە خاوڕەوی لەهەوا و ئارەزووەکاندا کە عەقڵ بەدەستهێنانی ئەندازێکی پێویستی بە گرنگ دەزانێت، ئەم دووسیفەتەی کە باسمانکردن هەردووکیان نەرێلێکراون. بەڵام پاکداوێنی شتێکی مامناوەند و باشە [٢٨٥].

لەگەڵ ئەوەی کە پاکداوێنی بریتیە لەکامڵبوون ئەوا زیادەڕەوی و خاوڕەوی بریتیە لە کەموکورتی و ئاستی مامناوەندیش بریتیە لەعەقڵ و شەرع هەروەك چۆن لەئاستی مامناوەندی تایبەت بە هێزی توڕەییشدا هەروایە، کاتێك ئامانجی کامڵبوونی هێزی توڕەیی بریتی بێت لە وەدیهاتنی ئازایەتی و کامڵبوونی ئازایەتیش لە بەدیهاتنی موجاهەدەدایە ئەوکات ئامانجی کامڵبوونی هێزی ئارەزوو بریتی دەبێت لە وەدیهاتنی پاکداوێنی و کامڵبوونی پاکداوێنیش لە بەدیهاتنی لەخودا ترسان و خۆ گرتنەوە لەهەواوئارەزووی ناباش، واتە خۆگرتنەوە لە ئارەزووی ناپەسەند یەکێکە لە دیارترین چاکەکاریەکان کە دەچێتە ناو چاکەکاری پاکداوێنیەوە لەگەڵ چاکەکاریەکانی تردا کە گرنگترینیان شەرم و تەریقبوونەوە و لێبوردەیی و خۆڕاگری و بەخشندەیی و...هتد [٢٨٦].هەموو چاکەیەك لەم چاکانە دەکەوێتە نێوان دوو سیفەتی پەستەوە، بۆ نمونە شەرم دەکەوێتە نێوان بێ حەیایی و مێبازیەوە کە پێشتر غەزالی چەندین پێناسەی بۆ باسکردووە و دەڵێت: (ئێشێکە ڕووڵە دەروون دەکات لەکاتی ترس لە کەموکورتبوون) یان(ترسی مرۆڤە لە کەموکورتیەك کە تێی بکەوێت لەلای کەسێك کە لەو پلەی بەرزترە) وەیان(شەرمەزاری دەمووچاو لەکاتی هەڵسووکەوتە ناشیرینەکاندا) بەگشتی

---

[٢٨٥] میزان العمل لا ٥٨.

[٢٨٦] میزان العلم لا ٥٨.

بەکاردێت لەبڵاوبوونەوەی ناشیرینیدا و لەهاتنەوەیەکی ئەوەی کە کەسی شەرمکار بەناشیرینی دەزانێت ئەمەش سیفەتێکە کەلەهەموو کەسێکدا جوانە) [٢٨٧] شەرمیش بەهایەکی ئیسلامیە هەروەك غەزالی دەڵێت: کە یەکەمین نیشانەو فەرمانەکانی عەقڵە هەروەك باوەڕ کۆتا قۆناغەکانی عەقڵە(ئیمان و باوەڕی نیە کە سێك شەرم و شکۆی نەبێت) [٢٨٨].

بەڵام پەستیەکان یان زیادەڕەوی و یان خاوڕەویە کەدەچێتە ژێر هەردوو پەستی(زیادەڕەوی و خاوڕەوی لە ئارەزووەکان و پەستی و مێبازی و ئیسرافکردن ڕیاکاری و شکاندنی ناموس هەوانتەیی و پەراوێزخستن و شێتی و...هتد کە لەبەرامبەریەوە پاکداوێنی هەیە.

کۆی ئەم پەستیانە بەهۆی گۆڕانی هێزی ئارەزوەوەیە لە ئامانجەکانی یان دەکەوێتە زیادەڕەویەوە یان دەکەوێتەخاوڕەویەوە، لەدیارترین دەرئەنجامەکانی خراپبوونی پەیوەندیەکانیەتی لەگەڵ خەڵکی لەلایەك و خراپبوونی حاڵەکەی لەلای خاوەنەکەی لەلایەکی ترەوە.

ئەگەر هێزی ئارەزوو هاتەدی هەروەك لەپاکداوێنیدا هەیە، ئەم ئامانجە هەڵسووکەوتێکی هەیە پێویستە شوێنی بکەوین و یاساگەلێکی هەیە کە پێویستە ڕەچاوبکرێن، هەروەك چۆن ئارەزووی خۆراك بنەڕەتی ئارەزوو کۆنترنیانە ئەوا ڕلستکردنەوەی هەڵسووکەوت بەبێ ئەو نەبێت دەستپێناکات، ئارەزووی وورگ خوازیاری خۆراکە. خۆراکیش دوو جۆرە پێویست و ناپێویست [٢٨٩]. پێویستەکەش دابەشدەبێت بۆ باش و ناباش پێوەری جیاکاریش لەسەر ئاستی بەدیهاتنی ئامانج

---

[٢٨٧] میزان العمل لا ٦٤.

[٢٨٨] میزان العمل ٦٤. حەدیسێکە کە غەزالی دەیداتە پاڵ پێغەمبەر.

[٢٨٩] میزان العمل لا ٧٩.

لە هێزی ئارەزوودایە، باش بریتیە لە تەنها سەرقاڵبوون بەشتێکەوەیە کە نەگونجاوە سەرقاڵبیت پێیەوە تەقواش لەسەر زانست و کردارە کە ئەگەر وازی لێبهێنێت کێشەی بۆ دروستدەبێت و گرفت بۆ جەستەی دروستدەکرێت. بەڵام قەدەغەکە بریتیە لە ئەنجامدان و خواردنی ئەوەی کە خودا حەرامی کردووە لەماڵی خەڵکی و شتە حەرامەکان، ناباش و مەکروهیش بریتیە لە زیادەڕەوی لە ئەنجامدانی حەڵاڵدا ئەم زیادەڕەویە زیانبەخشە، لەڕووی پزیشکیەوە، (سکەڕۆیی بنچینەی دەردەکەیە خۆپارێزیش بناغەی دەواو چارەسەرەکەیە) هەروەك لە پێغەمبەرەوە گێڕدراوەتەوە، لەلای دەروون و هەڵسووکەوتیشەوە زیانبەخشە(بڵاوکردنەوەی خراپەکان و بەهێزکردنی ئارەزووەکان و بەهێزکەرو ووزە بەخشی ئارەزووەکان بریتیە لە خۆراکەکان پڕبوونی وورگ بەهێزکەری ئارەزووە بەهێزی ئارەزووش خوازیاری ئارەزووبازیە، ئارەزووبازیش گەورەترینی سەربازەکانی شەیتانە کە ئەگەر زاڵبێت بەسەر نەفسدا لەخودا دووری دەخاتەوە و لەدەرگانەی ئەویش لایدەدات) [٢٩٠] هەرکەسێك دادپەروەری جێبەجێبکات لە خۆراکدا ئەوا گرنتی هێزی جەستە و سەلامەتی دەروون و چاکەکاری دەکات، (گەدە سەرچاوەی هێزەکانە هەروەك بڵێی دەرگاو کلیلە بۆ خێرو شەڕ هەربۆیە پلە و پایەی ڕۆژوو لەشەرعدا گەورەیە) [٢٩١] بەڵام حاڵی ئارەزووی داوێن وەك حاڵی ئارەزووی وورگ وایە چوونکە کردارەکانی دەبن بە دووبەشەوە باش و ڕێگە پێدراوو خراپ و قەدەغە کراو. باشەکە بریتیە لەو ئەندازەیەی کە پێویستە بۆ پاراستنی جۆری مرۆڤ هاوسەرگیری لەم ڕووەوە وەك پەرستش وایە، خراپ و قەدەغەکەش

---

[٢٩٠] میزان العمل لا ٨٠.

[٢٩١] میزان العمل لا ٨١.

بریتیە لەزینا کە هاوشانە لەگەڵ شەریك بۆخودا بڕیاردان و نێربازی ئەمەش لەسەر ئەوە وەستاوە کە عەقڵ دەکرێتە خزمەتکاری ئارەزوو، ئەمە لەکاتێکدایە کە باشتر وایە کە عەقڵ فەرمانڕەوایەکی بەگوێکراو بێت نەك ببێتە خزمەتکاری هەواو ئارەزوو لەبەر خاتری ئەو سەرگەردان بێت، ئەمەش دەبێتە هۆی نەخۆشی هیچوپووچی دەروون کە هیچ هیممەتێکی تێدا ناهێڵێت [٢٩٢]. ناباشیش بریتیە لەبەردەوامبوون لەسەر هەواو ئارەزووبازی تەنها بەمەبەستی لەزەت وەرگرتن، واتە ناباشی بەهۆی زیادەڕەوی و لەڕادەبەدەری بەکارهێنانی ئارەزووەوە دەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی لادانی لەئامانج و مەبەستەکەی.

ئەم شیکاریەی کە غەزالی پێشکەشیدەکات بۆ چاکەکاری پاکداوێنی کە تایبەتە بە هێزی ئارەزووبازیەوە بەڕوونی ئاستی مامناوەندی ڕووندەکاتەوە وەك تەرازوو پێوەر کە هەڵسووکەوت و دەروون لە خراپەی زیادەڕەوی و خاوڕەوی دەپارێزێت، هەربۆیە دادپەروەری ناوونیشانی چاکەکاری چوارەمە.

## د — چاکەی دادپەروەری:

دادپەروەری بریتی نیە لە(بەشێك لە چاکەکاریەکان بەڵکو بریتیە لە کۆی چاکەکاریەکان) [٢٩٣] ئەمەش(حاڵەتێکە بۆ هەرسێ هێزەکە لە ڕێکخستنیان بۆ گونجان بەپێی ئەو ڕێکسازیە پێویستەی کە لە باڵادەستی و ملکەچیدا هەیە) [٢٩٤] مەبەستیشمان لە ڕێکخستن ئەو پەیوەندیەیە کە لەنێوان عەقڵ و هێزەکانی تری

---

[٢٩٢] میزان العمل لا ٨٣.

[٢٩٣] میزان العمل لا ٥٩.

[٢٩٤] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

تورەیی ئارەزوودا هەیە و دەبێت عەقڵ براوەو زاڵبێت ئەوکات ڕێزو گەورەیی حیکمەت دێتەدی، دەبێت هێزی تورەیی و هێزی ئارەزوو گوێڕایەڵ بن ئەوکات چاکەی پاکداوێنی و چاکەی ئازایەتیش دێتەدی. دەرئەنجامی کۆبوونەوەی ئەم چاکەکاریانە لە ڕەوشتی دەروونیدا دەردەکەوێت واتە وەدیهاتنی چاکەکاری دادپەروەری(دادپەروەریش لە ئەخلاقی دەروونیدا بەدوای خۆیدا دادگەری لە مامەڵە و سیاسەتدا دەهێنێت، ئیتر لە ئەخلاق و ڕەوشتدا بێت یان لەو بوارانەدا بێت کە وڵاتی لەسەر وەستاوە واتە جومگە گرنگەکانی دەسەڵات) [٢٩٥].

چاکەی دادپەروەری یەکێکی ترە لەو چاکەکاریانەی کە دەکەوێتە نێوان هەردوو سیفەتی پەستی دەوڵەمەندی و بەخشینی نابەجێ، دەوڵەمەندی ناباشیش بریتیە لە هەڵگرتن و گلدانەوەی ماڵ وسامانێك کە مرۆڤ هی خۆی نیە، بەخشینی نابەجێش بەخشینە لەمامەڵەدا بەبێ ئەوە کە شوێنی خۆی بگرێت ئەمەش بەهیچ شێوەیەك سوپاسکراوو پاداشت دراوە نیە [٢٩٦]، کە لەبەرامبەریەوە زوڵم و ستەم هاتووە.

ئەم دیاریکردن و پێناسەکردنە بۆ مانای دادپەروەری ئامانج لێی باسکردنی ئەو گونجانەیە کە لەناو تاکدا هەیە و لەلایەك بە چاکەکاریەکان جوانکراوە و لەلایەکی تریشەوە باسکردنی ئەو گونجانەی کە لەشاردا هەیە لەسەر شێوازی سیستەمی

---

[٢٩٥] میزان العمل لا ٦٠.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە غەزالی لە فەلسەفە کرداریەکەیدا گرنگیەکی زۆری داوە بەتاك و پێی وایە بەڕاستکردنەوەی تاك کۆمەڵگەش باشدەبێت ئەوەی کە گونجاوە بۆ سیاسەتی حاڵەت و کاروبارەکانی تاك گونجاویشە بۆ کۆمەڵگە ئەمەش جیاوازی نێوان ئەخلاق و سیاسەت کە دوونماون بۆ یەك مانا کە ئاراستەی دوومەبەست دەکرێن یەکێکیان ڕوویکردووەتە تاکەکان و دووەمیشیان ڕووی لەکۆمەڵگەیە.

[٢٩٦] میزان العمل لا ٦٠.

خود [٢٩٧]. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە دادگەری بریتیە لەنهێنی هەموو بوونەوەر هەروەك چۆن ئاسمانەکان و زەوی ڕاوەستاون بەو جۆرەش مرۆڤ و شاریش وەستاون، هەروەك بڵێی جیهان وەك یەك تاکە کەس وایە کە هێزو بەشەکانی هاوکاری یەکترن، ئەم قسەیەش مانای ئەوەیە کە هەموو دامەزراندنێك بۆ ئەخلاق و سیاسەت تەنها لەڕێگەی دیدێکی کامڵ و ڕوونەوە دەبێت بۆ جیهان، چوونکە سیستەمی ژیان و یاساکانی هەڵسووکەوت و پەیوەندیەکانمان مەحکومە بەو تێڕوانینەی کە لەبارەی جیهانەوە پێکمان هێناوە و باوەڕمان پێیەتی، هەرکە تێڕوانینمان لەبارەی جیهانەوە گۆڕا ئەوا تێڕوانینمان لەبارەی مرۆڤیشەوە دەگۆڕێت [٢٩٨].

بیرو تێڕوانینی غەزالی لەبارەی چاکەکاریەکانەوە لەسەر بیرکردنەوەی ناوبراو وەستاوە لەسەر بنەماکانی ئاینی ئیسلام کە خۆی دەڵێت: (ئەو چاکەکاریە

---

[٢٩٧] هەڵوێستی غەزالی لەبارەی ئەم ڕێکخستنە سیاسیەی شار وەك هەڵوێستەکەی فارابی وایە کە سەیری شاردەکات لەڕێگەی تێڕوانینی بۆ مرۆڤ و بەپێی هێز و پەیوەندیەکانی مرۆڤ کە فەرمانڕەوایی جەستەی دەکات ئەمیش بەو شێوەیە باسی شاردەکات و دەڵێت دەبێت ڕێکخستنی شاریش بەو جۆرە بێت.( السیاسة المدینة + اراء اهل المدینة الفاضلة – فارابی).

[٢٩٨] سەیر کردنی جیهان بە تێڕوانینێکی بیرکردنەوە و کەشفکردن و لەزەت و جوانی خودێکی پاکی باوەڕدار بەبەختەوەری دروستدەکات کە بە دڵنیایی و بێخەمیەوە دەژی( نمونەی غەزالی )

بەڵام سەیرکردنی جیهان وەك داگیر کەر و خاوەن تەنها مرۆڤێکی باوەڕدار بەبەرژەوەندی دروستدەکات کە بەحاڵەتێکی کێبەرکێوە دەژی( نمونەی دیکارتی) بیرۆکەی زاڵبوون بەسەر سروشتدا مرۆڤی داگیرکەری دروستکردووە ئەمەش لە خەونەکانی دیکارت و بیکون و هەموو فەیلەسوفان و زانایانی سەردەمی نوێیە واتە سەرەتای سەدەی حەڤدەیەم. ئەم جیاوازیەش جەخت لەسەر ئەو جیاوازیە ناوەڕۆکی و بنەڕەتیە دەکاتەوە کە لەنێوان ئەو نمونە شارستانیەدا هەیە کە غەزالی بەرجەستەی دەکات کە بریتیە لەفەراهەمکردنی حاڵەتی گونجان و داد پەروەری لەتاکدا و لەنێو جیهانیشدا بەگشتی لەگەڵ ئەو نمونە شارستانیەی کە خۆرئاواییەکان دەیخەنە ڕوو لەسەردەمی نوێدا کە لەسەر فەراهەمکردنی ئەو هێزانە وەستاوە کە توانای ململانێ بەمرۆڤ دەبەخشن تاوەکو کۆتایی.

دەروونیانەی کە پێشتر هەموویمان باسکردن کە کامڵبوونەکەی زانستە و پاکداوێنیش کامڵبوونەکەی وەرع و خۆگرتنەوەیە لەخراپە، ئازایەتی کە کامڵبوونەکەی موجاهەدە و دژایەتیکردنی دەروونە و دادپەروەریش کە کامڵبوونەکەی ویژدان و ئینسافە، ئەمانە بەڕاستی دەبنە بنەماکانی ئاین)[٢٩٩] هەربۆیە مەسەلەی پەیوەستبوونی بەحیکمەتی یۆنانەوە لەلای غەزالی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەبووە. وە هەروەها دەتوانین بڵێین کە حیکمەتی یۆنانی(ئەرستۆ) و فەلسەفە و حیکمەتی ئیسلامی(غەزالی) لەڕێککەوتنێکی گشتیدا بوون لەبارەی دایکی چاکەکاریەکان و بنەماو ئامانجەکانیانەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ یەکبوونی سەرچاوە، چوونکە غەزالی پێیوایە کە سیاسەت و ئەخلاق لەحەقیقەتیاندا دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کتێبانەی خودا کە نێردراون بۆ سەر پێغەمبەرەکانی و ئەو پەند و ئامۆژگاریانەی کە لەپێغەمبەران و پێشینانی ئاینەکان و ئەوەی کە صۆفیەکان پێی گەشتوون لەزانست و کردار[٣٠٠].

---

[٢٩٩] میزان العمل لا ٧١.

[٣٠٠] المنقذ من الضلال لا ١٠٩.

کارادوق پێیوایە کە غەزالی لە لێکۆڵینەوەئەخلاقیەکانیدا پشتی بە نەسرانیەت بەستووە، ئەم قسەیەش تەنها ئامانج لێی دوورخستنەوەی قورئان و دان نەنان بەوەی کە یەکەمین سەرچاوەیە کە غەزالی فەلسەفەکەی خۆی لێدەرهێناوە، لەگەڵ ئەو هەموو زانستە فراوان و جۆراو جۆرەی کە لەبارەی فەلسەفە کۆن و ئاینە بڵاوەکانی سەر زەویەوە هەیبووە لەو سەردەمەدا، هەروەك بڵێی پێکهاتەی ئاینی غەزالی مەسیحی بێت و هیچ پەیوەندیەکی بە ئیسلامەوە نەبێت ! وادیارە کە هەڵوێستی خۆرهەڵاتناسەکان لەبارەی فیکری ئیسلامی کۆنەوە ئامانجی دەرخستنی زاڵبوونی ئاینی مەسیح بووە بەسەر ئیسلامدا، ئەگەر شتێکیان لەلای موسوڵمانان ببینیایە دەیانگێڕایەوە بۆ ئەصڵ و بنەمایەکی گاورو مەسیحی هەروەك بڵێی قورئان هیچ شتێك لەبارەی ئینجیلەوە نازانێت.

فەیلەسوفانی یۆنانیش سودێکی زۆریان لە ئاینی خۆرهەڵاتیەکان وەرگرتووە، هەروەك بڵێی بنچینەی فەلسەفەی حەکیمان و حیکمەتی موسوڵمانان لەم بەشەدا بریتیە لە چرای پێغەمبەرایەتی. کەواتە پەیامی ئیسلامی پڕیەت لە دایکی چاکەکاریەکان و هەمووتاییەتمەندی حیکمەتی کرداری ئەخلاقی لەوانەش سیاسەت، ئەم قسەیەش والە غەزالی دەکات وەك دژایەتیکارێکی ئەوانەدەربکەوێت کە پێیانوایە بنچینەی ئەخلاق و بنەڕەتەکەی بریتیە لەعەقڵ وەك: موعتەزیلە، ئەم دژایەتیکردنەش وامان لێدەکات کە مەسەلەی بناغەو بنەڕەتی ئەخلاق بوروژێنین کە ئایا بریتیە لە عەقڵ یان کۆمەڵگا یان ئاین یان سود و بەرژەوەندی....هتد.

# بەشی سێیەم

# بنچینەی ئەخـــلاق

ئەوەی کە غەزالی باسیکردووە لە ووردەکاریەکانیدا بۆ دایکی چاکەکاریەکان داهێنراوێکی فەلسەفی نیە (تهذیب الاخلاق) پاککردنەوەی ئەخلاقی ئیبن مسکەوەیهی چاکەکاریەکانی لەسەر هەمان شێواز دارشتوەتەوە، بەیارمەتی وەرگرتن لەباسە ئەفلاتونی و ئەرستۆییەکان بەشێوەیەکی یەکسان، لەگەڵ ئەوەی کە قورئانیشی وەك سەرچاوەیەك بەکارهێناوە کە هەردوو فەیلەسوف وەك یارمەتیدەرێك دەبینن کە دەکرێت سودی لێوەربگیرێت. بانگەوازی ئیسلامی لەسەر مامناوەندی و وەسەتیەت وەستاوە، بەلاَم غەزالی لە پێشکەشکردنیدا بۆ چاکەکاریەکان و ڕوونکردنەوە و دێژە پێدانیان هەڵوێستێکی کرداری خێری دەخاتەڕوو کە زۆر دوورە لە حوکمە عەقڵیەکانەوە کە لەلای موعتەزیلە بوونیان هەیە، بەتایبەت لەلای باقی فەیلەسوفە باوەڕدارەکان کە باوەڕیان بەڕەهایەتی حوکمە ئەخلاقیەکان هەیە، ئەم هەڵوێستەی غەزالیش چەندین پرسیار دەوروژێنێت لەبارەی ڕاستی بۆچوونەکانیەوە بەتایبەت کە عەقڵی باو لەسەر ئەو باوەڕەیە

ئەخلاق دەبێت یەك دانە بێت چوونکە بەها مرۆییەکان نەمرن، غەزالیش بە وەرعەکەی ناسراوە هەربۆیە دەدرێتە پاڵ صۆفیەکان، هەربۆیە دەبێت هەڵوێستی لەبارەی ئوخلاقەوە باوەڕی بەم ڕەهاییە هەبێت و لەسەر چەمکی واجب وەستابێت، ئیتر چۆن دەکرێت شیکاریەکەی بۆ ئەخلاق بدەینە پاڵ چەمکگەلێکی کرداری؟ ئایا لەم دەرئەنجامەدا هیچ دژبوونێك هەیە؟ خوێنەر و لێکۆڵەر لەکتێبەکانی غەزالی لەنزیکەوە دەست لەدەروونی کرداری دەدات کە غەزالی ئەیەوێت ئاشکرای بکات تەنانەت لەکاتی باسکردنی لەبارەی ووردترین مەسەلەکان لەڕووی دیدو بۆچوون دوورترینیان لەڕووی قوڵیەوە وەك ئیلاهیات، دەبینین حەزە کرداریەکەی بەزۆری دەستماندەکەوێت، مەبەستیشمان لە حەزی کرداری ئەوەیە کە غەزالی تەنها پێشکەشکردن و خستنە ڕووی بەڵگە بەبەس نازانێت بۆ سەلماندنی ڕاستیەتی هەڵوێستێك یان حوکمێك، بەڵکو ئەو چۆنیەتیەش دەخاتەڕوو کە تاکەکەس بۆ خۆی پەیڕەوی دەکات بۆ ئەوەی خۆی بۆخۆی دان بنێت بە حەقیقەت و ڕاستیەتی مەسەلەکەدا، جیاوازی نێوان چاوڕەشی و چاوڕەشکردن بەکل دیارو ئاشکرایە [٣٠١]، واتە کرداری بیرکردنەوە ڕوویەکە لەڕووەکانی کردار، بەڵام ئەم نەزعە کرداریە بەڕوونی و ئاشکرایی لە فەلسەفە کرداریەکەیدا دەیبینین کە گۆڕاویەتی بۆ فەلسەفەیەکی شیکاری و دیاریکاری و چارەسەری بۆ هەڵسووکەوتی مرۆڤ بەتایبەت ئەخلاق، بێگومان ئەم لایەنەش بەئاراستەیەکی پێچەوانەی شوێنکەوتوانی ئاراستەی عەقڵیدا دەڕوات، کە باوەڕی وایە بەهای شتەکان لە جوانی و خێر و شەڕ حەق و ناحەق سیفەتگەلێکی عەینی و بینراون لەشتەکاندا واتە بوونێکی سەربەخۆیان هەیە لەعەقڵی ئێمە و ئەرکی عەقڵیش بریتیە لە هەستپێکردن و

---

[٣٠١] میزان العمل لا ٥١.

دەرككردنیان [٣٠٢]. موعتەزیلە پێشەنگی ئەم ئاراستەیە بوون لەمێژووی فیكری ئیسلامیدا.

## ١ — بنچینەی عەقڵی: موعتەزیلە:

عەقیدە و بیروباوەڕی موعتەزیلە لەسەر پێنج بنەماو پایەی بنەڕەتی وەستاوە كە بریتین لە: یەكتاپەرستی(التوحید) دادپەروەری، پەیمان و هەڕەشە، پلەیەك لەنێوان هەردووپلەكەدا، فەرمان بەچاكە و ڕێگری لەخراپە. بەڵام ئەم بنچینانە پەیوەندیەكی بەهێز و پتەوو تۆكمە فەرمانڕەواییاندەكات كە لەحەقیقەتەكەیدا دەگەڕێتەوە بۆ بنچینەی یەكەم كە(یەكتاپەرستیە) و موعتەزیلە بەشێوەیەكی ئەقلانی پێیدا ڕۆشتوون و باوەڕیان بە تەنزیهو پاكراگرتنی ڕەها هەیە بۆ(لیس كمثله شيئ) واتە: هیچ شتێك وەك شێوەی ئەو نیە، ئەم پاكڕاگرتنەش دواتر كاریگەری و شوێنەوارەكانی لە بنچینەكانی تردا بەڕوونی دەبینین، بەتایبەت بنچینەی دووەم(دادپەروەری) چوونكە كۆمەڵێك پرسیاری قورسی پەیوەست بەدادگەری ئیلاهیان وروژاندووە وەك: ستەم و چاكە و خراپە و جوانی و ناشیرینی و ئازادی و ئازادی هەڵبژاردن و چەندین شتی تر كە لەمبارەیەوە جێگەی گرنگی ئێمەیە، ئەویش قسەكەی موعتەزیلەیە كە دەڵێت: : خودا كرداری بەندەكانی نەخولقاندووە نە چاكەكان و نە خراپەكانیش، وویست و ئیرادەی مرۆڤ ئازادە و مرۆڤ خۆی ئافرێنەری كارەكانی خۆیەتی و جوانی و ناشیرینی لەكردارەكاندا خودین، بۆ نمونە درۆ خۆی بۆ خۆی ناشیرینیەكی خودی تێدایە و ڕاستگۆییش جوانیەكی خودی تێدایە، هەموو كردارە جوانەكانی وەك داد پەروەری و ڕاستگۆیی

---

[٣٠٢] ضحى الاسلام ب ٣ لا ٥٠ — احمد امين.

و ئازایەتی و بەخشندەیی خۆیان سیفەتێکیان تێدایە کە جوانی کردوون و واشی لە ئێمە کردووە کە بەجوانیان بزانین، وە هەروەها کارە ناشیرینەکانی وەك ستەم و درۆو ترسنۆکی و ڕژدی سیفەتێکیان تێدایە کە ناشیرینی کردوون و ئێمەشی والێکردووە کە بەناشیرینیان بزانین. شەرعیش کە فەرمان بەشتانێك دەکات و شتانێکیش قەدەغە دەکات ئەویش شوێنی هەمان ئەو سیستەمە دەکەوێت کە لەنێو شتەکاندا جوانی و ناشیرینی هەیە و مرۆڤیش پێویستە لەسەری پێش هاتنی شەرع و بەرگوێکەوتنی بانگەوازی پێغەمبەران ڕەوشتە جوانەکان پەیڕەو بکات هەرچەندە شەرعیشی پێ نەگەشتبێت [٣٠٣].

هەڵوێستی موعتەزیلە هەڵوێستێکی ڕەق و چەقبەستوو نەبووە چوونکە لە هەمولایەکەوە ڕەخنەکانی ڕووبەڕوو کراوەتەوە بەتایبەت لەلایەن ئەشعەریەکانەوە، غەزالیش یەکێکبووە لەوانەی کە لەدژی ئەم هەڵوێستەی موعتەزیلە وەستاوەتەوە و شیکاری تەفسیری بۆ قەبارەیان کردووە، کە بەڵگەیە لەسەر قوڵی بەصیرەتی ناوبراو، چوونکە نەیویستووە بەڵگە بەبەڵگە بۆڕ بدات هەروەك چۆن موتەکەلیمەکان دەیکەن، بەڵکو بەڵگەکانی وەرگرتوون و شیکاری و ڕاڤەی کردوون و بەمشێوەیە نهێنیەکانی ئاشکرا کردوە و گێڕاویەتیەوە بۆ ئەو هۆکارانەی کە دایناون بۆ شیکاری هەڵسووکەوتی مرۆڤ بەگشتی و ئەخلاق بەتایبەتی، هەروەك بڵێی بەمکارەی ئەو وەهمانە ئاشکرا دەکات کە لەحەقیقەتی مەعقولدا بوونیان هەیە کە لەحەقیقەتی خۆیاندا مەعقول و گوماناوین، ئەی کەواتە هەڵوێستی غەزالی کامەیە؟

---

[٣٠٣] ضحى الاسلام – احمد امين ب ٤ لا ٤٧ – ٤٨ – ٤٩.

## ٢ – هەڵوێستی غەزالی:

غەزالی دەڵێت: : (هەرچەندە هێزی فیکر پاکببێتەوە و وەك پێویست چاکسازی تێدا بکرێت ئەو حیکمەتە دێتەدی کە خودا باسیکردووە...کە بەرهەمەکەی بریتیە لەوەی کە جیاکردنەوەی حەق و ناحەقی لەعەقیدە و بیروباوەڕەکاندا و ڕاست و درۆ لە قسەدا و جوان و ناشیرین لە کردارەکاندا بۆ ئاساندەبێت) [٣٠٤] لەم قسەیەوە ئەوە ڕووندەبێتەوە کە بەدیهاتنی حیکمەت دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی هێزێکی زۆر بۆ جیاکردنەوە، وەك جیاکردنەوەی جوان و ناشیرین لەکردارەکاندا، حیکمەتیش بریتیە لە کاری چاکەی هێزی عەقڵی، ئەوکات عەقڵ لەلای ئیمامی غەزالی بریتیە لە ئامێرێکی جیاکردنەوە و فەرمانڕەوایی کردن، ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کەی غەزالی ئەخلاق لەسەر بناغەیەکی عەقڵی دادەمەزرێنێت؟

ئەخلاق بناغەو بنچینەیەکی عەقڵی هەیە عەقڵیش بەحیکمەت جوانکراوە واتە ئەو عەقڵەی کە گەشتووەتە پلەکانی ئیدراك کە یەقین و دڵنیایی دەدۆزێتەوە، مرۆڤیش لە حوکمە عەقڵیەکەیدا لەسەر ئەندازەی حیکمەت و داناییەکەیەتی، عەقڵ یەك مەلەکەی نەگۆڕ و دابەشکراو بەشێوەیەکی یەکسان نیە لەناوخەڵکیدا، بەڵکو بەرهەمی موجاهەدە و تێکۆشانە لەگەڵ دەروون و کەشف و دۆزینەوەیە واتە بەرهەمی هەرکارێکە، واتە بیناو پێکهاتەیەکی تێکەڵە و پێکهاتووە لە کورتەی ئەزموونی زانستی و هەڵسووکەوتیە و حوکمیشی بەپێی سروشتی پێکهاتەکانیەتی کە بەرەو واقیعی زیندوو جوڵاو ڕاپێچکراون، کاتێك حیکمەت و دانایی عەقڵ بینی کە شتێك جوانە ئەوە لەبەر ئەوە نیە کە هەستی بەخودی ئەو شتە کردووە و

---

[٣٠٤] میزان العمل لا ٣٨.

لەخودی خۆیدا جوانە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە لەو شتەدا ئەوەی بینیوە کە لەگەڵ ئامانج و مەبەست و سود و دەستکەوتەکانی ئەمدا دەگونجێت، بەسود لەوانەیە لەلایەکی ترەوە زیانبەخش بێت و بەپێچەوانەشەوە، (زۆر شتی بەسود هەیە کە بەئازارە و زۆرشت هەیە لەڕوویەکەوە بەسودە و لەڕوویەکی ترەوە زیانبەخشە وەك ڕشتنی پارە و سامان و شتوومەکی بەنرخ بۆ ناودەریا لەکاتی ترس لە نغرۆبوون بەهۆی قورساییانەوە ئەوکارە زیانبەخشە چوونکە پارەو سامان فرێدەدرێت، بەڵام سوود بەخشە چوونکە گیانی پێ ڕزگار دەکرێت) [٣٠٥] بەهاکان بەم مانایە کۆمەڵێك مانان کەلەسەر عەقلّ وەستاون کە خەڵکی بەهۆیانەوە باسی شتەکان دەکەن ئەگەر لەبەر چاویان بەهاو نرخ و ئامانج و مەبەستێکیان هەبێت، ئەمانەش نایەنەدی مەگەر ئەو ئامانجە هەبێت.

کاتێك بەها ئەخلاقیەکان بەمشێوە ڕێژەییە بن ئیتر باشی و پێکانی هەڵوێستی بەرامبەر کامەیە؟

غەزالی لەڕێگەی شیکاری سروشتی عەقڵەوە هەڵوێستی دژەکانی لێکۆڵینەوە و شیکار دەکات و پێشەکیە عەقڵیە یەقینیەکان و دامەزرێنەرەکانی یەقین و زانست جیادەکاتەوە لەو پێشەکیانەی کە یەقینی و دڵنیایی نین و بەکەڵکی بەڵگە هێنانەوە نایەن، لەدوو توێی ئەم بەشە لە پێشەکیەکان دوو جۆر جیا دەکرێنەوە: جۆرێك کە دەگونجێن بۆ زەنیات و گوماناویە فیقهیەکان، جۆرێکیش ناگونجێن بۆ ئەمە. جۆری یەکەم دەبێت بەسێ بەشەوە: بەناوبانگەکان(مشهورات) قبوڵکراوەکان(مقبولات) گوماناویەکان(مظنونات) [٣٠٦] لەڕێگەی شیکاریەوە بۆ ئەم

---

[٣٠٥] میزان العمل لا ٧٧.

[٣٠٦] معیار العلم لا ١٩٣.

بەشانە نمونەگەلێکی ئەخلاقی و هەڵسووکەوتی بەگشتی دەهێنێتەوە و ئەوە ڕووندەکاتەوە کە حوکمی عەقڵ تێیدا لەسەر پێشەکی گەلێك وەستاوە کە یان بەناوبانگن یان قبوڵکراون یان گوماناوین، بەڵام یەقینی و دڵنیایی نین و تەنها تاوەکو ئاستی گومانەکان بەرز دەبنەوە وەك حوکمی ئێمە بەجوانی سەلام کردن و خۆراك بەخشین و جێبەجێکردنی سیلەی ڕەحم و ڕاستگۆیی لەقسەدا و ڕەچاوکردنی دادپەروەری لە مەسەلە و حوکمەکاندا. وە هەروەها وەك حوکمدانی ئێمە بە ناشیرینی ئازاردانی مرۆڤ و کوشتنی گیانەوەران و بوختانکردن و ڕەزامەندی هاوسەران بەرامبەر خراپەی یەکتری و ڕووبەڕووبونەوەی نیعمەت و بەخششەکان بەسەرکەشی و کوفر[٣٠٧].

هۆکاری حوکمی زەننی و گوماناوی(ئەگەر مرۆڤ واز لە عەقڵی ڕووت و وەهم و هەستەکانی بهێنایە ئەوکات زەین دادوەری لەبارەیەوە نەدەکرد تەنها بە هەست و عەقڵ، بەڵکو لەبەر کۆمەڵێك هۆکاری تری دەرەکی جەخت لەسەر ئەم مەسەلانە کراوەتەوە لە دەرووندا و سەلمێنراون کە بریتین لە پێنج شت[٣٠٨]: یەکەم: دڵنەرمی، دووەم: ئەوەی کە مرۆڤ لەسەری ڕاهاتووە لە تورەیی و هاودەمبوون، سێیەم: خۆشویستنی ئاشتیخوازی و ئاشتەوایی و یارمەتیدان لەسەر ژیان و گوزەران، چوارەم تەمبێکردنە شەرعیەکانی چاکسازی لەهەڵسووکەوت و ئاکارەکانی خەڵکیدا، پێنجەم: پشکنین و بەدوادا چوون بۆ شتە لاوەکیە زۆرەکان، چوونکە هەرشتێك تاوەکو پەیوەستبێت بەشتێکەوە لە زۆربەی حاڵەتکانیدا وادەزانرێت کە هاودەمیەتی بەشێوەیەکی ڕەها.

---

[٣٠٧] هەمان سەرچاوە لا ١٩٣.

[٣٠٨] معیار العلم لا ١٩٣.

غەزالی بەمشیکاریە چاڵێکی قوڵ هەڵدەکەنێت لەنێو عەقڵدا کە بەهۆیەوە پێکهاتەگەلێکی بێدەنگ یان نەزانراو ئاشکرا دەکات تەنانەت لەلای کەسە ئاقڵەکانیش کە خاوەنی مەسەلەکەن. عەقڵ ئەگەر دانەپۆشێت داشناپۆشرێت، پێکهاتە شاراوەو نادیارەکانی ناوعەقڵن کە بیردەکەنەوە، دۆزینەوەیان زۆرێك لە وەهمەکان لەناودەبن و نایانهێڵن، لەدیار ترینیشیان ئەوەیە کە عەقڵی پاڵفتە توانای حوکمکردنی بەهایی(القیمی) هەیە. عەقڵی کرداریە لەو وەهمانە ڕزگارمان دەکات کە لەکاتی بیرکردنەوەماندا و بەبێ ئاگایی و هۆشیاری خۆمان زاڵدەبن بەسەرماندا، وەك نمونەی وەهمیش باسی ئەو کێشەیە دەکەین کە موعتەزیلەو زۆربەی گروپەکانی لەبەرامبەر دادگەری سەربڕینی حەیواناتدا بۆ ئامەنگەکان و ناوزەدکردنی شێتی کەسانی ناتەواو بە نەخۆشی سەرسامکردووە، چوونکە پێیانوابووە ئەمە لەڕووی عەقڵیەوە ناشیرینە، بەهەرحاڵ نەرم و نیانی تەبع و سروشتیان وایلێکردوون ئەم حوکمە بدەن و ئەو وەهمەیانکردووە کە عەقڵ خاوەنی حوکمدانە[٣٠٩]. یان حوکمدانیان بە ناشیرینی ڕەزامەندی دەربڕین لەبەرامبەر خراپەی ژنەوە، بەهەرحاڵ ئەصڵی ئەم حوکمە دەگەڕێتەوە بۆ خوو تووڕەیی و ئولفەت، یان حوکمدانیان بەرامبەر سەلامکردن و ناندان بەهەژاران لەڕووی عەقڵەوە جوانە، بەهەرحاڵ ئەم حوکمە دەگەڕێتەوە بۆ خۆشویستنی ئاشتی و ئاشتبوونەوە و هاوکاری یەکتری لەژیان و گوزەراندا.

---

[٣٠٩] هەمان سەرچاوە لا ١٩٤.

کەواتە حوکمدان بەجوانی یان ناشیرینی دەگەڕێتەوە بۆ نەریت و پەروەردە و خووخدە یان ئەوەی کە گونجاوە یان نەگونجاوە لەگەڵ مەبەست و ئامانجەکاندا [٣١٠]. دەکرێت ئەم حوکمە بگێڕینەوە بۆ سێ بەش:

یەکەمیان: ئەوەیە کە گونجاوبێت لەگەڵیدا واتە لەگەڵ بکەرەکەیدا. دووەم: ئەوەیە کە لەدژی ئامانج و بکەرەکەی بێت، سێیەم: نابێت لە ئەنجامدان و ئەنجامنەدانیدا هیچ مەبەستێکی هەبێت، ئەم دابەشبوونە لەعەقڵدا جێگیرە، ئەوەی کە گونجاوە لەگەڵ بکەردا پێی دەگوترێت جوان، جوانیەکەشی هیچ مانایەکی نیە مەگەر گونجانی نەبێت لەگەڵ ئامانجەکەیدا. ئەوەی کە لەدژی ئامانجەکەی بێت پێی دەگوترێت ناشیرین، هیچ مانایەکیشی نیە مەگەر شتێکی لەدەستدابێت لەبەر ئامانج و مەبەستەکەی. ئەوەشی کە نە دەگونجێت و نە ناگونجێت پێی دەگوترێت بێمانا و هەوانتە و هیچ سوودێکی نیە و بکەری هەوانتە و بێکەڵکیش پێی دەگوترێت کەسێکی گاڵتەچی و هەوانتە کردار و هەندێکجاریش پێی دەگوترێت بێ عەقڵ و سەفیه. وە ئەگەر گونجاو بوو بۆ کەسێك و نەگونجاو بوو بۆ کەسێکی تر بۆ یەکێکیان دەگوترێت جوان و بۆ ئەویتریان دەگوترێت ناشیرین. چوونکە ناوی جوان و ناشیرین بە پشتگیری و دژایەتی دەبێت کە هەردووکیان دووشتی زیادەی لەیەکتر جیاوازن لەڕووی کەسەکانەوە لەحاڵ و مافی کەسێك بۆ کەسێکی تر جیاوازە و دەگۆڕێت... بەمشێوەیە. ئەوە پەیوەندەبێتەوە کە جوان و ناشیرین بریتین لە هەموو هەڵسووکەوتەکان، کە دووشتی زیادەن و بەهۆی زیادەییەکانیانەوە جیاوازیان هەیە نەك لەڕووی سیفەتی خودەکانەوە [٣١١]. ئەم دەستەواژەیەی کۆتایی بەڕوونی

---

[٣١٠] هەمان سەرچاوە لا ١٩٤.

[٣١١] الاقتصاد فی الاعتقاد لا ٨٥ – ٨٦.

بەڵگەیە لەسەر دژ بوونی قوڵی لەگەڵ شوێنکەوتوانی ئاراستەی عەقڵی وەك گروپی موعتەزیلە. وەهەروەها غەزالی بەردەوامدەبێت لە تێڕوانینە قوڵەکەی و بەهۆیەوە دەرك بەوەدەکات کە هەڵسووکەوتی ئەخلاقی لەحەقیقەتیدا دەگەڕێتەوە بۆ تەبع و سروشت(هەموو تەبع و سروشتێك خۆی خۆشدەوێت و خەڵکیتر بەکەم دەزانێت). هەربۆیە بەشێوەیەکی ڕەها حوکم بەسەر کرداردا دەدرێت کە ناشیرینە، هەندێکجاریش دەگوترێت ناشیرینە لە خودی خۆیی و هۆکارەکەیدا و ناشیرینیشە لە ماف و حەقەکەیدا، واتە دژی ئامانج و مەبەستەکەیەتی بەڵام مەبەستەکانی هەروەك بڵێی ئامانج و مەبەستی هەموو جیهانە بەرامبەر بە مافەکانی، هەربۆیە گومانی ئەوە دەبرێت کە ئەوەی دژی مافی ئەمە لەدەروونی خۆشیدادژە، هەربۆیە ناشیرینیەکە بۆ خودی شتەکە زیاد دەبێت) [٣١٢].

هەستکردن و دەرك بە هۆکارە شاراوەکانی پشتەوەی هەڵسووکەوتی ئەخلاقیە کە حەقیقەتی تەبع و سروشتەکان و ڕۆڵی نەریت و بیروباوەڕو بەرژەوەندو مەبەستی ئاشکرا کردووە، هەموو ئەم بنەمایانە لەبەر ئەوەی ئاگادار نیە لێیان لەڕووی ئەوەی کە بانگەشەی ئەوە دەکات کە عەقڵی بەکار دەهێنێت وایلێکردوون کە بەڕواڵەتی کارەکان لەخۆ بایی بن و بێئاگادەبن لە نهێنیەکانی ئەخلاقی دەروونەکان و ئەوە نازانن کە ئەم حەزو مەیلە و نمونەکەی دەگەڕێتەوە بۆ

---

ڕەخنەی بناغەی عەقڵی ئەخلاق( ڕەخنەی موعتەزیلە) مانای ئامادە نەبوونی عەقڵ ناگەیەنێت لە مەسەلەی ئەخلاقدا. باسکردنی ڕۆڵی پەروەردە و فێرکردن لە دامەزراندنی ئەخلاقدا بریتیە لە دامەزراندنی هۆکاری کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و دەروونی و مێژوویی مانای ئەوەیە کە ڕیزبەندی غەزالی لەم مەسەلەیە قورسە کە ئایا سەربەکام قوتابخانەی عەقڵی یان کۆمەلایەتی و یان تاکەکەسی یان براگماتیە، بەڵکو کرداری ڕیزبەندی لەخودی خۆیدا ناشەرعیە بۆ شان و شکۆی فەیلەسوف چوونکە دەیسوتێنێت و ئامانجەکەی ڕیزبەندیە نەك تێگەشتن، فەیلەسوف بەشێکی نویٚ سەربەخۆیە، هەربۆیە ناونراوە فەیلەسوف.

[٣١٢] الاقتصاد فی الاعتقاد لا ٨٦ – ٨٧.

گوێڕایەڵی دەروون بە حوکمی فیترەت و سروشت و تەبع تەنها بە خەیاڵ و وەهم کە بەحوکمی عەقڵ هەڵەن، بەڵام هێزەکانی دەروون بەجۆرێك ئافرێنراون کە گوێڕایەڵی وەهم خەیاڵەکانن بە حوکمی جێبەجێکردنی نەریتەکان [٢١٣].

بەمشێوەیە جارێکی تر ئەوە ڕووندەبێتەوە کە گرنگیدانی غەزالی بەمەسەلەی ئەخلاقیەکان دەچێتە خانەی هەموو ئەو گرنگیانەی کە بەمەسەلەی لێکۆڵینەوە دەروونیەکانی داوە، بەڵگەش ئەوەیە کە غەزالی هەڵسوکەوتی ئەخلاقی و بنچینەیی بەهاکان دەگێڕێتەوە بۆ بنەما گەلێك کە لەحەقیقەتی خۆیاندا خودی توخمەکانی دەروونن لە هەڵسووکەوت و هەڵسەنگاندیاندا، بنەڕەتی ئەم توخمانەش دەگەڕێتەوە بۆ بیرۆکەی تەبعی بنیاتنراو لەسەر نەریت و عادەت. بەمشێوەیە ئەخلاق لەم ئاستەدا دەبێتە نەریت، بەڵام ئەخلاق مانای بەرژەوەندی و بەدەستهێنانی ئامانجیش دەگەیەنێت، چاکەکاریەکانیش لەسەر ئەم دوو بنەما بنەڕەتیە وەستاون کە نەریت و سودو قازانجە وە هەروەها دەبێتە نیسبی و ڕێژەیی وەك نیسبیەتی نەریت و قازانج.

لەبەر ئەوەی کە مەسەلەی ئەخلاق سەرئەنجام دەگاتە ئەم دووبنەمایە، هەربۆیە حوکمکردن لەئەخلاقدا گونجاوە و تەنانەت گۆڕینیشی هەر گونجاوە، بۆچی ناگۆڕێت لەکاتێکدا گۆڕانکاری سیفەتێکی دیارە لەنێو گیانەوەراندا ئیتر چۆن لە مرۆڤدا نیە ! بەڵام ئەم گۆڕانە لەمرۆڤدا بەمەرجی کرداری پەروەردەیە [٢١٤]. لەگەڵ ئەوەی کە دایکی چاکەکاریەکان لەحەقیقەتی خۆیاندا بنەماکانی ئاینن [٢١٥] ئەوکات ڕێککەوتن لەنێوان شەرع و عەقڵدا دروستدەبێت و(باش ئەوەیە کە گونجاوبێت

---

[٢١٣] الاقتصاد فی الاعتقاد لا ٩٠.

[٢١٤] میزان العمل لا ٤٦.

[٢١٥] میزان العمل لا ٧١.

لەگەڵ شەرع و عەقڵدا) [٢١٦] هەروەك چۆن(ڕەوشتی جوان و ناشیرین شەرع ڕوونی کردووەتەوە) [٢١٧] کەواتە ئێستە بۆمان سەلمێنرا کە شەرع هێزی دامەزراندنی هەیە هەروەك چۆن عەقڵی کرداری ئەو هێزەی هەیە ' ئەمەش لەپاش ئەوەی شەرع و عەقڵی کرداری پێشتر دامەزرێنراون واتە پێش عەقڵی تیۆری. چوونکە ئەم ڕاستیەتی شەرع و عەقڵی سەلماندووە، کاتێك ئەمە سەلمێنرا ئەوکات ملکەچکردن بۆی واجب و پێویستیەکی عەقڵیە وەگەرنا تووشی دژبوون دەبینەوە [٢١٨]. بەڵام ئایا ئەمە مانای ئەوەیە غەزالی کە چاکەکاریەکانی بەمشێوەیە ڕێکخستووە و هێزی بنیاتنانی بەشەرع بەخشیوە کەوتووەتە تەڵەی تێڕوانین و تیۆرەوە و دوورە لە واقیعی مرۆڤایەتی زیندوو جوڵاو؟

پێکهاتەی کرداری فەلسەفەی کرداری غەزالی بەگشتی و فەلسەفە ئەخلاقیەکەی بەتایبەتی هەرچەندە گرنگی بە چاکەکاریە باڵاکان و بەها بەرزەکان دەدات، بەڵام گرنگیدان بە مەرجەکانی دامەزراندنی پێویستیەکی حاشا هەڵنەگرە، هەربۆیە غەزالی تەرتیبێکی بەرەو خواری بۆ خێرەکان داناوە و بەبەختەوەری قیامەتی دەستپێدەکات و بە چاکەکاریە سەرکەوتنیەکان(التوفیقیە) کۆتاییان دێت و ئەوە ڕووندەکاتەوە کە چۆن یەکەم بارمتەی دووەمە و دووەم بارمتەی سێیەمە، بەمشێوەیە تاوەکو دەمانلکێنێت بە مامەڵەکان و لەزەتە دونیاییەکانەوە وەك باڵی گەیەنەر بە بەختەوەری قیامەتی، غەزالی لەمکارەشیدا گونجاوە لەگەڵ تەسەووری گشتیە فەلسەفیەکەیدا، کە باسکردنە لە بنەما مادیە پتەوەکانی هەموو دامەزراندنێك، باسەکەشی بەمشێوەیە کە ئەم(خێرانە پێنجن کە قیامەتی و

---

[٢١٦] میزان العمل لا ٥٦ – ٥٧.

[٢١٧] میزان العمل لا ٥٤.

[٢١٨] سەیری بەشی سێیەمی بابی یەکەم بکە.

دەروونی و جەستەیی و دەرەکی و سەرکەوتنی کە هەندێکیان پێویستیان بەهەندێکی تریان دەبێت) [٣١٩] واتە هەر توخمێك لەم توخمانە وەك هۆکارێکی بنەڕەتی وایە بۆ ئەو توخمەی کە لەدوایەوە دێت تاوەکو دەگاتە بەختەوەری قیامەتی کە چاکەکاریە دەروونیەکان مەرجن تێیدا و پێشتر بەووردی باسمانکردن، کە بریتی بوون لە چاکەکاری حیکمەت و دانایی و چاکەکاری ئازایەتی و چاکەکاری پاکداوێنی و چاکەی داد پەروەری.

چاکەکاریە دەروونیەکانیش تەندرووستی جەستەیان تێدا بەمەرج گیراوە کە خۆی لە بەدیهێنانی چاکەکاریەکانی جەستەدا دەبینێتەوە کە لە چوارشتدا کرتکراونەتەوە: ماڵ و سامان، خێزان، هێزو عەزم، بەخشندەیی هۆزو عەشیرەت، هیچکام لەم شتانە ناتوانرێت سودیان لێ وەربگیرێت مەگەر بەجۆری پێنجەم نەبێت کە چوار چاکەکاریە سەرکەوتنیەکانن(التوفیقە): ڕێنمایی خودایی، گەشەی خودایی، ڕزگاری خودایی، پشتگیری خودایی.(هەموو ئەمانەش وەك باڵی ڕاگەیاندن و ئامێری ئاسانکارن بۆ گەشتن بەمەبەست) [٣٢٠].بەمشێوەیە باڵە ڕاگەیاندنیەکانی چاکەکاریە باڵاکان لە کاروبارەکانی دوونیادا کورت بوونەتەوە، کە بریتین لە تەندروستی جەستە و تەندروستی ژیان و گوزەران و سەربەرزی، هەرکەسێك ئەم چاکەکاریانەی تێدا بوو دەتوانێت دایکی چاکەکاریەکان بەدی بهێنێت کە مرۆڤ دەگەیەننە بەختەوەری ئەو دوونیا، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە کاروباری ژیان بە هەموو ئاڵۆیەکانیەوە یان ئەوەیە کە ئاسانکارو فەراهەمن بۆ بەدیهێنانی چاکەکاریەکان یان قورس و ناڕەحەتن و ڕێگرن لەبەردەم ئەو وەدیهاتنەدا. بۆ نمونە

---

[٣١٩] میزان العمل لا ٧١.

[٣٢٠] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

مرۆڤ کاتێك پارەی نەبێت زۆربەی کاتەکانی بە گەڕان بەشوێن خۆراك و جلوبەرگ و شوێنی نیشتەجێبوون و پێداویستیەکانی ژیاندا دەگوزەرێنێت و بواری بۆ فێربوونی زانست نیە کە بەرێزترین و بالآترینی چاکەکاریەکانە. [٣٢١]

خێزان و سەربەرزی و عیزەت ئامانج لێیان کەمکردنەوەی سەرقاڵیە پێویستیەکانی دوونیایە و بەهۆیانەوە کاروبارەکانی دوونیا ئاسان دەبن و هێندە سەرقاڵیەکەی درێژە ناکێشێت ئەگەر بەتەنهاش بێت، وە هەروەها ئامانجیان بەدیهێنانی ئاسایش و ئارامیە و مرۆڤ بەهۆیانەوە ناڕەحەتی لەخۆی دووردەخاتەوە(ئاین و دەسەلآت هۆکاری ئارامین، هەندێکیش دەڵێن: ئاین بنەڕەتەو دەسەلآتیش پاسەوانە ئەوەی کە بناغەی نەبێت ئەوا دەڕووخێت ئەوەشی کە پاسەوان نەبێت لەناودەچێت) [٣٢٢]. دەسەلآت – مەبەستمان پێی ئەوەیە کە پەیوەندیە کۆمەلآیەتیەکان بەهۆیەوە بەهێز دەبێت و ئاسایش و ئارامی و سەربەرزی بەهۆیەوە دەچەسپێت و زامنی باشتر مانەوەو ژیانی مرۆڤە و هەلومەرجەکانی پێشکەوتنی بەرەو چاکەکاریەکان، بۆ بەدیهێنانی خێرەکانیش یارمەتی لە ئاین وەردەگرێت چوونکە بناغەی بەهێزیەتی، دینیش پێویستی بەپاڵپشتی دەسەلآت هەیە و کۆبوونەوەیان بەیەکەوە مەرجی بەدیهاتنی هەموو چاکەکاریەکانە [٣٢٣]. هەرچەندە سەرکەوتن لەسیاسەت و پاککردنەوەی دەروون

---

[٣٢١] میزان العمل لا ٢٧.

[٣٢٢] میزان العمل لا ٧٢.

[٣٢٣] لێرەدا تێبینی هۆشیاریمانکرد لەبارەی گرنگی هۆکاری سیاسی لە بەدیهاتنی چاکەکاریەکاندا هەندێکجار ئەخلاق بەگشتی کاردانەوەی واقیعی سیاسی و کۆمەلآیەتیە کە لاکردنەوەیەکی بەلگەییە لەسەر واقیعی بوون کە غەزالی پابەندبووە پێیەوە لە لێکۆڵینەوە و شیکاریەکەیدا بۆ کێشەی ئەخلاق بەتایبەت و مەسەلە زانستیەکان بەگشتی. وە هەروەها تێبینی بکە کە دەسەلآتیش پێویستی بەئاین هەیە و ئاینیش پێویستی بەدەسەلآت هەیە بەمەبەستی هەستکردن و دەرککردنی پەیوەندی نێوان سیاسەت و ئاین.

وسیاسەتی وولآت هەرچەندە مەرجە بۆ سەرکەوتن لەسیاسەتی دەروون و پاککردنەوەی و بەدیهێنانی چاکەکاریە بالآکاندا بەلآم غەزالی داوای مەرجێکی تر دەکات کە گرنگی لەوان کەمتر نیە کە بریتیە لە بەدیهێنانی چاکەکاریە سەرکەوتنیەکان(التوفیقیە) لە رێنمایی و گەشە و رزگاری و پشتگیری خودایی.

غەزالیش سەرکەوتن(التوفیق) بەمشێوەیە پێناسە دەکات(تەوفیق و سەرکەوتن ئەوەیە کە مرۆڤ لە هەموو حاڵەتەکاندا بێنیاز نیە لێی ماناکەشی گونجانی وویست و ئیرادە و کرداری مرۆڤە لەگەڵ قەزاو قەدەری خوداییدا) [٣٢٤].

بەلآم هیدایەت و رێنمایی بنەماو دەستپێکی خێرەکان و هۆکاری داواکردنی چاکەکاریەکانە کە سێ پلە و قۆناغن: یەکەم: پێناسەی رێگەی خێر و شەڕ هەندێکیان بە عەقڵ هەندێکیشیان لەسەر زمانی پێغەمبەران دەکرێت، دووەم: ئەوەی کە بەعەبد دەبەخشرێت حاڵ لە دوای حاڵ بەپێی گەشەسەندنی لەزانستەکان و کارە باشەکاندا، سێیەمیش: ئەو نورو رووناکیەیە کە لە جیهانی ویلایەت و پێغەمبەرایەتیدا دەدرەوشێتەوە، هیدایەت و رێنمایی لەوانەیە بەهۆی کالآیی عەقڵەوە بێت کە بەهۆیەوە تەکلیف و ئەرك فێربوون و هیدایەتی ڕەها کە لەخوداوەیە ڕوودەدات. بەلآم دانایی و زیرەکی بریتیە لە گرنگیدان و چاودێری خودایی کە هاوکاری مرۆڤدەکات لە رووکردنە ئامانج و مەبەستەکانی و بەهێزی دەکات. رزگاری خودایش ئەوەیە کە ئیرادە و جوڵەکانی بەرەو ئامانجی خوازراوبن. پشتگیریش بریتیە لە بەهێزکردنی کاروبارەکانی بەبەصیرەت لەناخەوە و بەهێزکردنی توندی و هێزەکەی لەدەرەوە، پاکی و عیصمەتیشی لێوە

---

[٣٢٤] میزان العمل لا ٧٤.

نزیکدەبێتەوە کە فەیزو بەخششێکی خودایيە و مرۆڤ بەهێزدەکات بۆ گەڕان بەشوێن خێردا و دوورکەوتنەوە لەشەڕو خراپە.

مەرجی وەدیهاتنی ئەم مەسەلانە بریتیە لە تێگەشتنی پاك و بڕندە و بیستنی گوێڕایەڵی هۆشیار و دڵی بەصیر و بینای ڕەچاوکار و مامۆستای ئامۆژگارکەر و ماڵ و سامانی زیادە بەپێی پێویستی ئەرکەکان بەهۆی کەمی بێدەسەڵاتەکانەوە، نەك لەبەر ئەوەی کە سەرقاڵی ئاین دەبێت لەبەر زۆری عەشیرەت و دەسەڵات کە لەبێ عەقڵی عەقڵ بەرزەکان دەیپارێزێت و ستەمی دووژمنانی لەسەر کەمدەکاتەوە، بەم هۆکارانە بەختەوەریەکان کاملدەبن[٢٢٥].

کە کورتەکەی بریتیە لە بەدیهاتنی مەرجە مادی و دەروونیەکان، لەکاتی وەدیهاتنیشیاندا سەرکەوتن و پشتگیری خودایی دێتەدی و بەختەوەریشی بەدوادا دێت. چاکەکاری تەنها دەرئەنجامی ئەو هۆکارە مادیانەیە کە ئامادەکاری هۆکارە دروستکەرەکانی بەدیهاتنی هۆکارە دەروونیەکانن. ئەوەی ئەم کارە ئاراستە دەکات و بەرەو ئامانجەکەی ڕێبەریدەکات بریتیە لەتێگەشتنی بڕندە و تیژ، بەمشێوەیە کردار سەرکەوتوو دەبێت کە بارمتەی زانستە، لێرەشدایە کە غەزالی دەگەڕێتەوە بۆ بنەماکانی فەلسەفەکەی و کردار دەلکێنێت بە تیۆریەوە.

کەواتە عەقڵی کرداری بەبەردەوامی لەژێر وویست و ئیرادە و ئاراستەکردنی عەقڵی تیۆریدا دەمێنێتەوە، بۆ ئەوەی عەقڵی کرداری وەك ئامێرێکی کۆنترۆڵ و ئاراستەکردن بێت بەدەستیەوە کاتێك کاروباری جەستە بەڕێوە دەبات، بەمشێوەیەش دادپەروەری دێتەدی، وە هەرکات دادگەریش هاتەدی بەختەوەریش بەدوای خۆیدا دەهێنێت.(لەوەی کە پێشتر باسکرا زانیت کە زانست و کردار بریتین

---

[٢٢٥] میزان العمل ل ٧٥.

له هۆکارو ئامێری گەشتن بەبەختەوەری) [٢٢٦] وه هەروەها ئەوەشت زانی که ئەم چاکەکاریانەی له هونەرێکی تیۆری و هونەرێکی کرداریدا کورتکراونەتەوە، که هەریەکەیان لەسەر دووشێوه ڕوودەدەن، یەکێکیان بەفێرکردنی مرۆیی و زۆر لەخۆکردنی ئیختیاری که پێویستی بەکات و خۆڕاهێنان هەیە...

دوەمیش: بەبەخششێکی خودایی دێتەدی. وه هەروەها باقی پێغەمبەران [٢٢٧]، وه(ئەم کارانه ئەگەر مرۆڤی ئاقڵ بەناخیاندا بچێته خوارەوه که لەمنداڵیەوه تەمبێنەکرابێت بۆ وەرگرتنیان ئەوکات بەتەنها عەقڵی خۆی ناتوانێت حوکم به جوان و ناشیرینیان بکات، بەڵکو شەرع هەرچی بەجوان زانی ئەمیش بەجوانی دەزانێت، چوونکه هەرلەمنداڵیەوه وەهم ملکەچکراوه که قبوڵی بکات(واته شەرع قبوڵبکات) [٢٢٨] ئەگەر ئەمه بەرهەمو کورتەی قسەکه بێت ئەوا پەروەردە و فێرکردن رۆڵێکی مەترسیداریاندەبێت له دروستکردنی چاکەکاریەکان و لێکۆڵینەوەیاندا، وەك هۆشیاریەکیش لەبەرامبەر ئەم مەترسیەوه غەزالی باسێکی سەربەخۆو تایبەتی بۆ تەرخانکردووه که ئایا حەقیقەت و ڕاستی پەروەردە و فێرکردن کامەیە؟

---

[٢٢٦] میزان العمل لا ٨٨.

[٢٢٧] میزان العمل لا ٥١.

[٢٢٨] معیار العلم لا ١٩٦.

# بەشی چوارەم

## لەبارەی گرنگی پەروەردە و فێرکردنەوە

فێرکردن لەلای ئیمامی غەزالی لەبەرێزترینی کارەکانە. ڕێزی هەر پیشەسازیەکیش بەپێی ڕێژەی ئەو هێزە دیارو ئاشکراکەرەیە بۆی، وەك ڕێزی زانستی حیکمەت بەسەر زانستی زمانەکاندا، یەکەمیان پەیوەستە بە زانین و ناسینی هێزی عەقڵیەوە کە بەرێزترینی هێزەکانە یان بەپێی سودی گشتیە وەك ڕێزی و گەورەیی کشتوکاڵ بەسەر نوسین و دارشتندا، یان بەپێی ڕێزی ئەو بابەتەیە کە تێیدا بەکار هاتووە وەك ڕێزی هونەری نوسین و دارشتن بەسەر دەباغی و خۆشە کردنی پێستەدا. بەدەستپێکردن لەم سێ مانایەوە(زانستە عەقڵیەکان لەرێگەی عەقڵەوە دەزانرێن کە بەرێزترینی هێزەکانە و بەهۆیەوە دەگەینە بەهەشتی بەرین کە ئەوپەڕی سود و گشتگیرترینیانە، ئەو بابەتەشی کە کاری تێدا دەکات بریتیە لە دەروونی مرۆڤەکان کە باشترینی بابەتەکان و بەرێزترینی بوونەوەرانە لەم جیهانەدا. کەواتە سودی زانست هەم لەرووی پیشەسازی و هەم

لەڕووی پەرستش و هەم لەڕووی جێنشینی خوداوە لەسەر زەویدا دیارە) [٣٢٩] ئەم پلەو پایەی کە زانست هەیەتی پەیوەستە بەو پلەو پایەی کە عەقڵ هەیەتی چوونکە(دین و ئاینی نیە کەسێك کە عەقڵی نەبێت) هەروەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە کە غەزالی لەگەڵ حەدیسێکی تردا دەیهێنێت(سەرتان سوڕ نەمێنێت لە موسوڵمانی هیچ کەسێك تاوەکو ئاستی عەقڵی نەزانن) [٣٣٠]. عەقڵ لە زاراوەی قورئانیدا بەپێی پێناسەی غەزالی بریتیە لە نورو ڕووناکی کە تاریکی و نەفامی لەبەرامبەریدایە [٣٣١] دەتوانین بەپێی پێناسەکەی غەزالی بە دەستپێکردن لە لێکۆڵینەوەی بەشەکانی پیشەسازی دەتوانین پێناسەی بکەین بەوەی کە(یان بنەڕەتگەلێکن کە جیهان بەبێ ئەوان نەبێت ناوەستێت کە بریتین لە چوار شت: کشتوکاڵ، چنین(تریکۆ) بیناسازی و سیاسەت. وەیان ئامادەکارو خزمەتکاری هەریەکە لەمانەیە وەك ئاسنگەری بۆ دروستکردنی ئامێرە کشتوکاڵیەکان، وەیان تەواوکەرو جوانکاری هەریەکێك لەمانەیە وەك ئاشەوانی و نانەوایی) [٣٣٢](بەڕێزترین بناغەکانی پیشەسازی بریتین لە سیاسەتەکان چوونکە جیهان بەبێ ئەوان ناتوانێت لەسەر پێ بوەستێت) [٣٣٣] سیاسەتیش لەلای ئیمامی غەزالی چوار بەشە:

یەکەم: سیاسەتی پێغەمبەران و فەرمانڕەواییان بەسەر کەسانی تایبەت و خەڵکیدا بەگشتی لەناخ و ڕواڵەتیاندا.

---

[٣٢٩] میزان العمل لا ٨٩.

[٣٣٠] میزان العمل لا ٩٠.

[٣٣١] سەیری مانای نور بکە لەبەشی سێیەمدا( بەهای عەقڵ / تیۆر)

[٣٣٢] میزان العمل لا ٨٨.

[٣٣٣] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

دووەم: سیاسەتی خەلیفە و والی و سوڵتانەکان و فەرمانڕەواییان بەسەر خەڵکانی تایبەت و گشتیدا بەڵام لەسەر ڕواڵەتیان نەك ناخ و دەروونیان.

سێیەم: سیاسەتی زاناو داناکان کە تەنها لەسەر ناخی کەسانی تایبەت و هەڵکەوتووە.

چوارەم: ئامۆژگاریکاران و فەقیهو زاناکان و فەرمانڕەواییان تەنها لەسەر ناخی خەڵکیە بەگشتی.

بەڕێزترینی ئەم سیاسەتانە لەپاش پێغەمبەرایەتی گەیاندنی زانست و پاککردنەوەی دڵ و دەروونی خەڵکیە [٣٣٤].

هەنگاوی زانست بەتایبەت خۆی لەوەدا دەبینێتەوەکە ئاگاداری ناخی کەسە تایبەتەکانە و پیشەسازیەکەی پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ دەرووندا هەیە.

---

[٣٣٤] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

– لێرەدا تێبینی دەکەین کە غەزالی لەسیاسەتی زان و فەقیهو سوڵتانەکاندا سیاسەتی پێغەمبەران کۆدەکاتەوە، چوونکە ڕۆڵی پێغەمبەران بەسیاسەتی هیچ کەسێك قەرەبو ناکرێتەوە چوونکە ئەوان ئاگاداری ڕواڵەت و ناخی مرۆڤن و ڕووی سیاسەتیان لە خەڵکی تایبەت و گشتیە، ئەمە لەکاتێکدایە ئاگاداری هەموو بەشەکانی تری سیاسەت ئاگادارن لەڕوویەك لەڕووەکانەوە.

– پێغەمبەران هەست بە جیهانی شەریعەت و حەقیقەت دەکەن هەربۆیە ئەوان ڕوویدەمیان لە خەڵکی تایبەت و گشتیە.

– فەرمانڕەواو والیەکان هەست بەشەریعەت دەکەن هەربۆیە ڕوویدەمی ئەمانیش لە کەسانی تایبەت و گشتیە و بەڕواڵەت حوکمیان لەبارەوە دەکەن.

– زاناکان هەست بە حەقیقەت دەکەن هەربۆیە ڕوویدەمیان لە خەڵکانی تایبەتە و حوکم بەسەر ناخیاندا دەکەن بەڵام ملکەچی حوکمی شەریعەتن چوونکە ڕواڵەت ڕوویەکە لەڕووەکانی ناخ.

– فەقیهەکان هەست بە شەریعەت دەکەن، هەربۆیە ڕوودەکەنە خەڵکی بەگشتی و حوکم بەسەر ڕواڵەتیاندا دەکەن هاوشان لەگەڵ ناخیان.

– پێویستە درێژە بەقسەکە بدەین لەباسکردنی ئەم سیاسەتانەدا چوونکە پەیوەندی نێوان زانست و دەسەڵات لەلای غەزالی پێویستی بە چاوپیا خشاندنەوە و هەڵسەنگاندن هەیە.

هەرئەوە عەقڵەکان دروستدەکات و دەروونەکان پاکدەکاتەوە، پێشتر ئەوەمان ڕوونکردەوە کە ئەخلاق بەدەستهاتووە و پەروەردە و نەریت ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە تێیدا، لەگەڵ ئەوەی کە ئەخلاق ملکەچە بۆ هۆکاری گۆڕانکاری و زانستیش ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەی دەبێت بۆ جێبەجێکردنی کرداری پەروەردە، ئەوا پێویستە کە تێڕوانینی پەروەردەیی غەزالی و پەیوەندی بەزانستەوە بزانین، ئەی دەبێت پەروەردە لەکوێدا بێت؟

پەروەردە بریتیە لە پاککردنەوە، پاککردنەوەش بریتیە لە گۆڕان کە کردارەکەی وەك ئەوەیە کە لە دوونیا گیانەوەراندا ڕوودەدات(گۆڕانی هەڵسووکەوتی حەیوانات گونجاوە چوونکە لەدوای ڕاوکردنیانەوە لە وەحشیەتەوە دەبن بە ماڵی، سەگیش لە گازگرتنەوە دەگۆڕێت بۆ ڕاهێنراوی، ئەسپیش لە سەرکەشیەوە دەگۆڕێت بۆ دەستەمۆ بوون، هەموو ئەمانە گۆڕانە لە خووخدەدا) [٣٣٥]، پەروەردە لەلای ئیمامی غەزالی لایەنێکی ئەرێنی هەیە چوونکە هۆکاری وەدیهاتنی کامڵبوونی گونجاوە [٣٣٦]، (لەبەر ئەوەی کە موجاهەدە و تێکۆشان لەدژی دەروون و ڕیازەت کێشان بەکردەوەی چاك و کامڵکردنی دەروون و پاککردنەوەی بۆ پاکبوونی ڕەووشت و ئەخلاق) [٣٣٧]ئەوا موجاهەدە و ڕیازەت کێشان هەمان خودی پەروەردەیە.(هەروەك چۆن جەستە لەسەرەتاوە بەتەواوەتی دروستکردنی کامڵ نابێت و دواتر بە گەشە و پەروەردە بەخۆراك کامڵدەبێت، بەهەمان شیوەش دەروون بە ناتەواوی دەخولقێنرێت و دواتر بە پاککردنەوەی ئەخلاق و خۆراکپێدانی زانست کامڵدەبێت) بە هاتنەدی پاککردنەوە دەبێت پەروەردەکارو ڕاهێنەریش هەبێت کە بریتیە لە

---

[٣٣٥] میزان العمل لا ٤٦ – احیا علوم الدین ب ٣ لا ٥٥ – ٥٦.

[٣٣٦] میزان العمل لا ٤٦.

[٣٣٧] میزان العمل لا ٤٧.

شێخ مەرجەکەشی ئەوەیە کە دەبێت زانابێت و بەباشی ڕیازەت و ڕاهێنان بەدەرووونی بکات و ڕەوشتە جوانەکان بکاتە خوو خدەی خۆی [٣٣٨]. کاری پەروەرشیارو کاری جووتیاریش وایە کە دڕك و داڵ و ڕووەکی بێگانە بە کشتووکاڵەکەی هەڵدەکێشێت بۆ ئەوەی سەوزو بەرهەمدار بێت [٣٣٩]، ئەگەر بێتوو پەروەرشیار خووخدەی خراپی تێدا ڕوویدات بەهۆی ئەو نەریتانەی کە خوی پێوە گرتووە یان لەسەریان ڕاهاتووە، ئەوکات پەروەردەکە تەندروست نابێت، بەڵام ئەگەر پەروەردەکە لەسەرەتای منداڵیەوە بێت ئەوکات ڕاهێنەرو پەروەرشیار باشتر دەتوانێت قەوارەی منداڵ هەڵبکۆڵێت بەو شێوەیەی کە ئەیەوێت(چوونکە منداڵ ئەمانەت و ڕاسپاردەیە لەلای دایك و باوکی و دڵی پاکی گەوهەرێکی بەنرخی سادەیە و خاڵیە لە هەموو نەخش و نیگارو وێنەیەك، هەموو وێنە و نەخش و نیگارێك وەردەگرێت کە لەسەری بکێشرێت، ئەگەر لەسەر خێر ڕابهێنرێت ئەوا بەوهۆیەوە پێدەگات و لەدوونیاو قیامەتدا بەختەوەر دەبێت و دایکوباوك و هەموو مامۆستا و ڕاهێنەرو پەروەرشیارێك لەپاداشتی چاکەکاریەکانیدا بەشدار دەبن، بەڵام ئەگەر لەسەر شەڕو خراپە ڕاهات و وەك حەیوان پشتگوێ خرا ئەوا بەدبەخت دەبێت و بەهیلاکدا دەچێت و تاوانی کاروکردەوە ناپەسەندەکانی دەکەوێتە سەرشانی سەرپەرشت و بەخێوکەرەکانی) [٣٤٠].

ئەم هەڵوێستە بەڵگەیە لەسەر شێوازێکی ئەزموونی کە غەزالی لە تێڕوانینە پەروەردەیی و فەلسەفیەکەیدا بەشێوەیەکی گشتی گرتوویەتیە بەر، کە پێشتر و بەر لە تێڕوانینی موحەدیسەکان پەی پێ بردووە، هەر لەسەرەتاوە و لەگەڵ

[٣٣٨] ایها الولد لا ١٢٨ – ١٢٩.

[٣٣٩] ایها الولد لا ١٢٨.

[٣٤٠] احیا علوم الدین ب ٣ لا ٧٢.

فەیلەسوفە ئینگلیزەکانی وەك کلوك و هیوم لەئاراستە فەلسەفیەکەدا وەك ئەوەی کە(دوی) و(جیمس) ی فەیلەسوفانی ئەمریکا باوەڕیان پێی هەبووە [٢٤١]. بەڵام ئەم ئارەزووە ئەزموونیە باوەڕی بە بەرزی و ڕێزی مەبەستەکە هەیە کە باوەڕبوونە بەوەی کە زانست دانراوو جەعلێکی خودابیە(زاناکان ئەم مانایان ڕوونکردووەتەوە بەوەی کە گوتوویانە فێری زانست کراین بۆ غەیری خودا، بەڵام زانست نەڕێی کردوو گووتی هەردەبێت لەبەر خودا فێری خەڵکی بکرێم) [٢٤٢]. پێویستە کاری پەروەردەیی مەبەستی بەدیهێنانی ئەم ئامانجە بێت لەڕێگەی جێبەجێکردنی بەکرداری و بەشێوەیەکی قۆناغ بەقۆناغ لەدەروونی منداڵاندا هەرلەسەرەتای ژیانیانەوە، ئەم ئامانجەش وەدی نایەت و تەنانەت ئەم کردارە پەروەردەییە سەرکەوتوو نابێت مەگەر پەیوەندیەکی بەهێزی تایبەت هەبێت لەنێوان شەیخ و موریدەکەیدا یان لەنێوان قوتابی مامۆستاکەیدا ئەم پەیوەندیەش فەرمانڕەوایی دەکات بەسەر سروشتی ئەرکەکانی فێرخوازەوە لەلایەك و سروشتی ئەرکەکانی مامۆستا لەلایەکی ترەوە.

---

[٢٤١] مەبەست لە بەرابەرکاری مەبەست لێی تۆمارکردنی لەپێشتری مێژوویی نیە بەڵکو پەیوەستکردنی تیۆری پەروەردەیە بە کۆمکەڵگاکەی و ئەو زەمینە شارستانیەی کە باسیدەکات، هەرچەندە ڕێککەوتنێك هەبێت لە شێوە گشتیەکەی ئاراستە و بۆچوونەکەدا، ئەوا گەوهەرو ناوەڕۆکی تیۆرەکە جیاواز دەبێت چوونکە دەربڕی ڕۆحێکی جیاوازە، واقیعی ئەمڕۆشمان ئەیەوێت تیۆرێکی پەروەردەیی دابمەزرێنێت کە توانای دامەزراندنی جیل و نەوەکانی هەبێت، ئەمەش ناکرێت مەگەر بەگۆڕانی تیۆرە ئامادەکانت نەبێت هەروەك چۆن هەرکاڵایەکی تر هاوردەدەکرێت، لێرەدایە کە مەترسی دروستکردنی جیلەکان شاردراوەتەوە کە غەزالی ئاگادارمان دەکاتەوە لێی و دەڵێت: باڵاترینی سیاسەتەکانە لەپاش پێغەمبەرایەتی.

[٢٤٢] میزان العمل لا ١٠٩.

## ١ – ئەرکەکانی فێرخواز:

فێرخواز دە ئەرکی هەیە:

یەکەم: دەبێت دەروونپاکی بخاتە پێش ڕەوشتە پەستەکانەوە، چوونکە زانست پەرستشی دڵ و نوێژی نهێنی و نزیکی ناخە لەخودای گەورەوە(ئەگەر نوور و ڕووناکی زانست لەسەر دڵی دەرکەوت ئەوکات ڕەوشت و ئەخلاقی جواندەبێت، چوونکە کەمترین پلەکانی زانست ئەوەیە دەبێت بزانێت کە گوناهەکان ژەهرگەلێکی کوشندەن کە ژیانی هەتاهەتایی بەتاڵ دەکەنەوە چوونکە لەسیفەتە پەستەکانەوە سەرچاوە دەگرێت) [٣٤٣] کەواتە زانست هاوشانی چاکەکاریە و نەزانیش هاوڕێی پەستیە [٣٤٤].

دووەم: دەبێت سەرقاڵیە دوونیاییەکانی کەم بکاتەوە و لەماڵ و منداڵ و نیشتیمان دووربکەوێتەوە، چوونکە ئەو شتە هەڵواسراوانەی کە باسمانکردن مرۆڤ

---

[٣٤٣] احیاء علوم الدین ب ١ لا ٤٨ / المیزان لا ٩٦.

[٣٤٤] ئەم مانایە وەك ئەو مانا ئەفلاتونی و سوقراتیەیە: زانست = بە چاکەکاری = بەبەختەوەری، ئەمەش پێشتر نیچە لە کتێبەکەیدا گاڵتەی پێکردووە( زەردە پەڕی پەرستیوەکان) لە مەسەلی سوقرات بڕگەی ٤ دا دەڵێت( هەوڵ دەدەم و خۆم ماندوو دەکەم بۆ ئەوەی بزانم لەچ بێعەقڵیەکەوە ئەم موعادەلە و هاوکێشە سوقراتیە لەدایکبووە عەقڵ = چاکەکاری = بەختەوەری، نامۆترین هاوکێشەیە کە هەموو غەریزەی ئیغریقیەکۆنەکانی لەدژ کۆبوونەتەوە).

ئەگەر بمانویستایە غەزالی وەڵامی ئەم هەڵوێستەی نیچە بداتەوە کە دەڵێت ئەم پەیوەندیە بێئەقڵانەیە ئەوکات لەلایەك دەیگووت مانای زانستی ڕاستەقینە نازانێت و لەلایەکی تریشەوە لەحەقیقەتی مرۆڤ تێنەگەشتووە. هەربۆیە پێویستە منداڵ لەناو خێزان و کۆمەڵگەدا دا پەروەردە بکرێت لەسەر ئەوەی کە فێربوونی زانست وزانیاری بەندایەتیەکە کە بەهۆیەوە مرۆڤ دەگاتە پلە باڵاکان، وەهەروەها فێربوون پێویستە مرۆڤ ویست و ئارەزووی لەسەری هەبێت و بەهیچ شێوەیەك نابێت لەبەر پێویستی و بەناچاری فێری ببن.

لە فێربوونی زانست و زانیاری دوور دەخەنەوە، بۆ ئەوەی فیکرەی مرۆڤ پەرتەوازە نەبێت تەنها دەبێت کار لەسەر هەستکردن بەحەقیقەتەکان بکرێت، چوونکە زانست هەندێکیانت پێ نابەخشێت، هەربۆیە هەرکەسێك بەدوای زانستدا گەڕا پێویستە خۆی بۆ یەکلایی بکاتەوە.

سێیەم: نابێت خۆی لەزانست و ئەهلی عیلم بەگەورەتر بزانێت و پلانگێڕی لەدژی مامۆستاکەی نەکات، بەڵکو جڵەوی کارەکانی خۆی بداتە دەستی، بەجوانی گوێ بۆ ئامۆژگاریەکانی بگرێت هەروەك چۆن نەخۆش گوێ بۆ پزیشکەکەی دەگرێت [٣٤٥].

چوارەم: ڕۆچوو لە زانستە تیۆریەکاندا سەرەتا نابێت گوێ بگرێت بۆ ئەو جیاوازیەی کە لەنێوانی گروپەکاندا هەیە، بەڵکو دەبێت پێشتر بنەماکان بەباشی بزانێت و دواتر سەرقاڵی شتانی مانا ئاڵۆز ببێت و بەدوادا چوونیان بۆ بکات [٣٤٦].

پێنجەم: نابێت فێرخواز خۆی لەفێربوونی هیچ زانستێکی باش بەدوور بگرێت، بەڵکو دەبێت بەلایەنی کەمەوە تێڕوانینی تێدا بکات و ئاگاداری ئامانج و مەبەستەکانی ببێتەوە و دواتر دەستبکات بە ڕۆچوون و قوڵبوونەوە تێیدا ئەگەر

---

[٣٤٥] بۆ زیاتر تێگەشتن لەم مەسەلەیە بگەڕێرەوە بۆ بابی دووەم – فەولسەفی کارو کردار – بەشی یەکەم. لە احیا علوم الدین ب١ لا ١٥ دا هاتووە و دەڵێت: نابێت فێرخواز جڵەوی کاروبارەکانی بداتە دەستی مامۆستاکەی تاوەکو هەست بە دڵنیایی و بێخەمی نەکات لەبەرامبەر مامۆستاکەیدا چوونکە لێرەدا ڕۆڵی زانست مەترسیدارە تاوەکو مامۆستا متمانەی فێرخوازەکەی بەدەست نەهێنێت.

[٣٤٦] احیا لا ١٥ المیزان لا ٩٩.

هۆکارەکانی لەبەر دەستدا بوون، چوونکە خەڵکی دووژمنی ئەوشتانەن کە نایانزانن [٣٤٧].

شەشەم: نابێت بەیەکجار و یەکسەرە بچێتە ناو هەموو بەشەکانی زانستەوە، بەڵکو دەبێت بە تەرتیب و بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك هەوڵی فێربوونیان بدات، چوونکە زانستەکان بەشێوەیەکی پێویست ڕێکخراون و هەندێکیان ڕێگەن بۆ گەشتن بەهەندێکی تریان [٣٤٨]، زانستی مامەڵە و کەشفکردن و دۆزینەوە و ئامانجی ئاشکرا کردن و ناسینی خودایە [٣٤٩].

حەوتەم: ئەگەر تەمەن بەشی فێربوونی هەموو زانستەکان نەکات، هەربۆیە دەبێت لە هەموو زانستێك باشترینەکەی هەڵبژێرێت کە بریتیە لەو زانستەی کە بەختەوەری بۆ مرۆڤ دەهێنێت.

هەشتەم: ئەوەیە کە مانای ئەوە بزانێت کە هەندێك زانست هەیە لەزانستەکانی تر بەڕێزترن ئەمەش بەتێڕوانین لە بەرهەم و بەهێزی بەڵگەکەیەوە.

نۆیەم: دەبێت هەموو زانستەکان بەشێوەیەکی گشتی بزانین، زانستێك هەیە پەیوەستە بە زمانەوانی و پاشگرەکانیەوە وەك ئیعراب و نەحوو صەرف و زانستی عەرووز وەزن و قافیە. زانستێکیش پەیوەندی بەماناوە هەیە لەڕووی مانای

---

[٣٤٧] فێرخواز نابێت حەزی خۆی لەبارەی فێربوونی زانستێکی پێشکەوتووی ناو زانستەکانەوە ئاشکرا بکات ئەگەر بێت و نەزانێت ئامانج و مەبەستیان کامەیە. هەربۆیە واباشە مامۆستا فێرخوازەکان هانبدات ئەمەش لەڕێگەی هاندانی فێرخوازەکانەوە کە مەبەستی ڕاستەقینەی زانستە ئاشکرا بکەن کە وەك ئەو وایە.

[٣٤٨] لێرەدا تێبینی ئەو وانانە و مادانە بکە کە دەدرێتە فێرخواز، هەروەك چۆن ڕێکخستنێکی تەواو هەیە لەنێو بەشەکانی یەك زانستیشدا بەپێی گەشە و پێشکەوتنیان، ئەم ڕێکخستنە ئاسۆیی و ستوونیەی نێوان بابەتەکانی هەرزانستێك مەرجی تەندروستبوون و ڕاستبوونی ئەو زانستەیە واتە پرۆگرامێکی پەروەردەیی و فێرکاریە کە پێشکەشی فێرخوازەکان دەکرێت.

[٣٤٩] احیا لا ٥٢ / المیزان لا ٩٩.

زمانەوانیەوە وەك زانستی موجادەلە و مونازەرە و بەڵگە و ووتاربێژی. زانستێکیش پەیوەستە بەماناوە کە دوو بەشە: بەشێکی زانستی ڕووتە کە ناسینی خوداو فریشتەکان و پێغەمبەران و مەلەکوتی ئاسمان و زەویە... [٢٥٠] بەشێکیشی کرداریە کە بریتین لە زانستە فیقهی و سوننەتەکانی پێغەمبەر و ناسینی سیاسەتی دەروون لەگەڵ ئەخلاقدا و چۆنیەتی ژیان و گوزەران لەگەڵ مامەڵەدا [٢٥١]. واتە زانستەکان دابەشدەبن بۆ توێکڵ و ناوەڕۆك یان سەدەف و مرواری [٢٥٢].

دەیەم: دەبێت مەبەستی لەو هەموو زانستەی کە فێری دەبێت کامڵبوونی دەروونی خۆی بێت و چاکەکاری نەك سەرۆکایەتی و ماڵ و سامان.

ئەم ئەرکە تایبەتانەی فێرخواز لەڕووی بابەت و ئامانجەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەر کورتیاندەکاتەوە کە غەزالی لە کتێبی(ایها الولد) باسیکردووە کە دەڵێت: (کار بۆ دوونیات بکە بەپێی پلەو پایەت تێیدا و کاریش بۆ قیامەتت بکە بەئەندازەی مانەوەت تێیدا و کاریش بۆ خودا بکە ئەندازەی پێویستیت بە زاتی ئەوو کاریش بۆ ئاگر بکە بەئەندازەی سەبرو خۆڕاگریت لەبەرامبەر سوتێنەریەکەیەوە) [٢٥٣]. لەم مانایەدا زانست بەسراوە بە کردارەوە و هەردووکیشیان بەسراون بە ئیخلاس و دڵسۆزیەوە، واتە ئاراستە کردنی نیەت و مەبەست بەرەو لای خودا، (زانستی بێ کردار شێتیە و کرداری بێ زانستیش نابێت) [٢٥٤] بەمشێوەیە فەلسەفەپەروەردەییەکەی غەزالی لەگەڵ فەلسەفە کرداری و تیۆریەکەیدا

---

[٢٥٠] سەیری بابەتی( بەهای عەقڵ / تیۆر)، بکە

[٢٥١] سەیری بەهای عەقڵ / تیۆر بکە.

[٢٥٢] سەیری( جواهر القران بکە).

[٢٥٣] ایها الولد لا ١٢١.

[٢٥٤] ایها الولد لا ١٠٨.

جێبەجێدەبێت، بەڵکو تێڕوانین و تیۆرەکەی لەبارەی پەروەردەوە تەنها شێوازێکە بۆ هەڵسووکەوت وئەو مەرجانەی کە پێویستە بێنەدی تێیدا بۆ ئەوەی مانای فەلسەفەی تیۆری و کرداری بهێنینەدی، چوونکە کرداری پەروەردە لە چەمکێك لەچەمکەکانیەوە بریتیە لە سەرکردایەتیکردنی دەروون و ئاراستەکردنی بەرەو چاکەکاریەکان و دڵسۆزی لە سەرکردایەتیکردن و ئاراستە کردندا، چوونکە ئامانج بەدیهێنانی بەختەوەریە.

ئەگەر هاتوو فێرخواز بەهۆی ئەم دە ئەرکەوە لە خراپە و پەستیەکان بەدوور بوو ئەوکات بەرەو جیهانی مەلەکوت دەڕوات بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەری [٢٥٥] چوونکە ئەم ئەرکانە خوازیاری کۆمەڵێك ئەرکی ترن بەتایبەت بۆ مامۆستا چوونکە کرداری پەروەردەیی هەروەك لەپێشەوە ڕوونمانکردەوە تەنها بەرهەمی عەقڵی خۆشەویستی نێوان مامۆستا و قوتابی و شەیخ و موریدە، ئێستە بابزانین ئەرکەکانی مامۆستا کامانەن؟

## ٢ — ئەرکەکانی مامۆستا:

یەکەم: دەربڕینی سۆزو میهرەبانی بۆ قوتابیەکانی و وەك منداڵی خۆی سەیریانبکات، چوونکە مافی مامۆستا لەمافی باوك و دایك گەورەترە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە مامۆستا بەسودە بۆ ژیانی بەردەوامی ئەو دوونیا واتە مامۆستای

[٢٥٥] باوەڕبوون بە واقیعیەتی ئەخلاق وایلە کرداری پەروەردەیی کردووە گونجاوو کارابێت، چوونکە ئامانج لێلا پاککردنەوەی ئەخلاقە ئەم ئاراستەیە کە هەموو فەلسەفەی غەزالی سەرەڕای بەرزبوونەوەی لەجیهانی ڕووناکیەکاندا والێکردووە بیهێنێتەوە بۆ سەر زەوی و ئاراستەی زەوی بکات.

زانستەکانی قیامەت یان ئەو زانستە دوونیاییانەی کە ئامانج لێیان بەختەوەری قیامەتە[٢٥٦][٢٥٧].

دووەم: چاولێکەری لە خاوەنی شەرع، هەربۆیە دەبێت لەبەرامبەر فێرکردنەکەیەوە داوای پاداشت نەکات، چوونکە زانست ئامێری بەدەستهێنانی پارەو سامان نیە، چوونکە زانست ئامانج و خزمەتکراوە، بەڵام پارە خزمەتکارە و ئامێریشە[٢٥٨].

سێیەم: پێویستە مامۆستا ئامۆژگاری فێرخواز بکات و سزای بدات لەکاتی ئەنجامدانی کارو کرداری ناپەسەنددا و بەپێی توانای خودی فێرخوازەکە هاوکاری بکات لە فێربوونی زانستدا[٢٥٩] لەگەڵ ئاگادار کردنەوەی لەبارەی ئامانجی زانستەوە کە فێربوونی زانست ئامانج لێی بەدەستهێنانی بەختەوەری قیامەتە.

---

٢٥٦ احیا علوم الدین ب ١ لا ٥٦.

٢٥٧ تێبینی دەکەین کە ئامانج لە زانستەکانی دوونیا قیامەتە هەربۆیە ناتوانین بانگەشەی بێلایەنی زانستەکان بکەین لەبەردەم بەهاکاندا چوونکە ئەوە سەلمێنراوە کە زانست بەها دروستدەکات و ئەم بەهایانەش حیسابیان بۆ نەکراوە هەربۆیە ئەمڕۆکە جیهان بەدەست چەندین کێشەی بەهایی مەترسیدارەوە دەناڵێنێت، کتێبی( الهندسة الوراثیة والأخلاق).

ئاراستە کردنی زانستەکانی دوونیا بەرەو قیامەت دەبێتە هۆی پاراستنی زانستەکانی دوونیا لە نەرێنی بوون و دەیانکاتە ئامێرێکی ئەرێنی، ئەوکات زانست تەنها دەبێتە بەرهەمی دەزگاکانی، ڕۆڵی پەروەردەش لەلای غەزالی بریتیە لە چاندنی ئەم دەزگاباوەڕدارانە بەم بەهایانە بۆ ئەوەی زانستێك بەرهەم بهێنێت کە گونجاوبێت لەگەڵ بەهاکاندا دژایەتیان نەکات.

٢٥٨ لێرەدایە کە ڕۆڵی دەوڵەت و دامودەزگاکانی دەردەکەوێت لە گرنگیدان بەڕۆڵی فێرکردن بۆ ئەوەی ئەرکی پەروەردە لە ئامانجی ڕاستەقینەی خۆی لانەدات. چوونکە هەر تایبەتکاریەك لەفێرکردندا دەیکاتە ئامێرێکی بازرگانی کە لەڕووی ناوەڕۆکەوە دژە لەگەڵ ئامانج و مەبەستەکەیدا.

٢٥٩ ناکرێت ڕێگەکانی پەروەردە و فێرکردن بکەینەوە بەیەك چوونکە تواناو ئامادەباشی فێرخوازەکان جیاوازن هەربۆیە دەبێت هیممەتی فێربوون گونجاو بێت لەگەڵ ووزەکانیاندا و هۆشیاریش بێت لەبارەی ئەو جیاوازیانەی کە لەلای ئەواتن دروستبووە کە پەروەردەیەکی جیاکاریە.

بەڵام دەتوانین کە فێرکردن لەبەر بەدەستهێنانی سەرۆکایەتی وەك ئامێرو هۆکارێکی هاندان بۆ فێربوونی زانست بەکاربهێنین تاوەکو ئەو کاتەی کە هەڵسووکەوتی فێربوون ڕەگ و ڕیشەی لەناخی فێرخوازدا داکوتا ئەوکات ئامانجی ڕاستەقینەی دەزانێت و پرۆگرامەکەی بەهێز دەکات. لەم ئەرکەشدا غەزالی سودێکی پەروەردەیی و هەڵسووکەوتی دەخاتەڕوو کە زانایانی دەروونزانی نوێ گرنگیان پێداوە ئەویش ڕۆڵی بەهێزکردنە لەکاری پەروەردەدا یان ئەوەی کە پێی دەڵێن هێزی پشتگیری و پشتیوانی لە زانستخوازان [٢٦٠][٢٦١] .

چوارەم: پێویستە ڕێگری بکات لەوەی کە پێویستە ڕێگری لێبکرێت بە قەرەبووکردنەوە فێرخواز لەبری شتێك کە ڕێگری لێدەکات نەك بەوەی کە ڕاشکاوانەو بەبێ هیچ لەبرێك، چوونکە شێوازی ڕاشکاوانە قەدەغەکراوەکە خۆشەویستدەکات [٢٦٢] .

پێنجەم: ئەو کەسەی کە زۆر لەخۆی دەکات کە هەندێك زانست فێرببێت، پێویستناکات کە لەدەروونی فێرخوازەکەدا ناشیرین بکرێت کە لەبەردەستیدا نیە

---

[٢٦٠] سەیری صارەسەری دەروونی نوێ بکە – د عبدالستار ابراهیم لا ٩١ تا ١٧٧.

[٢٦١] لێرەدا تێبینی پێویستبوونی بەخشینی مانا دەکەین بۆ کرداری فێرکردن و وا لە فێرخواز بکرێت کە هەستی پێبکات، وەگەرنا بێ هیوایی دەچێتە ناو ڕۆحی فێرخوازەوە و حەزکردنی لەبەردەوامیدان بە خوێندن، هەربۆیە دەبێت ئەم مەبەستە بوونی هەبێت لە هەموو پەیڕەوکردنێکی پەروەردەیی و فێرکاری و هەموو ئەو بەرنامەو بابەتانەی کە دەخرێنە بەردەمی.

[٢٦٢] ئاماژەیەکی گرنگە بۆ مانای سزادان، سەیری کتێبی( تکنولوجیا السلوك الانسانی) سکینر بەشی چوارەم و پێنجەم بکە، ڕەوشتی ناپەسەند لەلای فێرخواز لەنیەت و مەبەستێکی خراپەوە سەرچاوەی نەگرتووە بەڵکو دەرئەنجامی کومەڵێك پاڵنەری دەروونیە کە پێویستە بیانناسین هەربۆیە غەزالی پێیوایە پێویستە بەقەرەبووکردنەوە ڕووبەڕووی ببینەوە واتە لەبرێکی بۆ دابنێین ئەوکات قەدەغەی بکەین نەك بەڕاشکاوانە قەدەغەی بکەین.

هەروەك چۆن مامۆستایانی زانست لەسەر نەریتی ناشیرینکردنی فیقه لەلای فێرخوازەکان ڕاهاتوون یان نەریتی فەقیهەکان کە زانستە عەقڵیەکان ناشیریندەکەن و لێیان بێزارن [٣٦٣].

شەشەم: فێرکردن بەپێی عەقڵەکان لەگەڵ گرتنەبەری شێوازی نەرم و نیانی و شوێنکەوتنی توانا و ئامادەباشی فێرخوازان [٣٦٤].

حەوتەم: فێرخوازی کەم تەمەن و منداڵ دەبێت ئەوەی پێ بگوترێت کە توانای تێگەشتنی هەیە لێی و ئەوەی بۆ باسنەکرێت کە ئەوشتانەی بۆتۆم باسکردووە هەموو ووردەکاریەکانیم پێ نەگوتویت، چوونکە ئەم وایلێدەکات زۆر گوێنەدات بەو شتانەی کە فێریاندەبێت...نابێت بیروباوەڕی ئاڵوز بکرێت لەبەر ئەمەیە کە گوتراوە پەنا بەخودا دەگرین لە نیوە موتەکەلیم و نیوە پزیشك چوونکە یەکەمیان ئاین دەشێوێنێت و دووەمیشیان ژیان تێکدەدات [٣٦٥].

---

[٣٦٣] گرنگی پسپۆری لەوەدایە کە هەموو پسپۆڕیەك ڕێزی لێ بگیرێت، چوونکە زانستەکان زنجیرە پەیوەستن بەیەکەوە.

[٣٦٤] ئەم ئەرکە مانای( الجام العوام عن علم الكلام) مان بۆ ڕووندەکاتەوە و ئەوەمان بۆ تەفسیرو ڕاڤە دەکات بۆچی هەندێك کتێب هەن بە گوماناوی ناودەبرێن لەلای غەیری ئەهلی خۆیان. لەم مانایەشدا غەزالی لەگەڵ قسەکانی خۆیدا گونجاوە پەیڕەوکردنەکانی بەڵگەن لەسەر ڕاستیەتی قسەکانی چوونکە بەسەر خۆیدا جێبەجێیکردوون ئیتر لە کاری فێرکردندا بێت یان نوسین و دانان و ڕەچاوکردنی پلەی عەقڵ و ئاستەکانی تێگەشتن و تەحەمول و وەرگرتن. ئەم ئەرکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە غەزالی لە ئەرکی سێیەمدا بۆی ڕۆشتووە و دەڵێت پێویستە فێرخواز بەپێی عەقڵ و توانای زانستی فێر بکرێت( پەروەردەی جیاکاری) ئەم پەروەردەیەش مەترسیەکی گەورەی هەیە ئیتر لە وەرگرتنی زانست و بەرزبوونەوە لە پلەکانیدا یان لە ڕووبەڕووبوونەوەی لادانی فێرخوازانەوە چوونکە لەفێرکردندا تەنها یەك شێواز بوونی نیە و سزاو چاکسازی لە هەڵسوکەوتدا بۆ هەموو فێرخوازەکان کارێکی سەرکەوتووە.

[٣٦٥] میزان العمل لا ١١٣ – احیا لا ٥٨.

هەشتەم: دەبێت زانا کاربەزانستەکەی بکات و درۆ نەکات و قسەی پێچەوانەی کردارەکانی نەبێت چوونکە زانست بەبەصیرەتەکان دەزانرێت و هەستی پێدەکرێت بەڵام کردار بەچاوی سەر دەرکدەکرێت و ئەربابی چاوی سەریش زۆر ترن [٣٦٦].

ئەرکەکانی مامۆستا لەگەڵ کۆمەڵێك مەرجی زانستی و دەروونیدا یەك دەگرنەوە کە ئامادەباشی تێدا دروستدەکات بۆ کرداری فێرکردن، رۆڵی مامۆستا پاککردنەوەی ئەخلاق و بلاو کردنەوەی زانست و یەقین و دڵنیاییە، واتە کرداری پەروەردەیی کردارێکی ئەخلاقی و فێرکاریە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئامانجی فێرکردن ئەخلاقە و ئامانجی ئەخلاقیش بەدیهێنانی بەختەوەریە، هەموو ئەو مەرجانەی کە غەزالی دایاندەنێت ئیتر بۆ مامۆستا بێت یان بۆ فێرخواز ئامانج لێیان دەرك و هەستکردنە بە شتەکان بەپێی ووزە و توانا و پاککردنەوەی ئەخلاقیش بەپێی توانا دەبێت، چوونکە هەندێك هەخلاق هەیە گۆڕێنیان زۆر قورسە لەبەر ئەوەی خووخدە و ئامادەباشی یەکەمین رۆڵێکی گرنگیاندەبێت لەهەڵکۆڵین و پێکهاتنی قەوارەی مرۆڤدا، هەربۆیە پێویستە مامۆستا ئاگاداری سروشتی کەسەکە بێت ئایا بەئاسانی چارەسەر دەکرێت یان خودا مۆری ناوە بەدڵیدا، ئەوکات چاککردنی سەخت و قورس دەبێت، (بزانە کە نەفام و نەزانەکان دوو جۆرن: دڵنەخۆشەکان، زاناو پزیشکەکان. زانای کەموکورت چارەسەری باش ناکات، زانای کامڵ و تەواویش هەموو نەخۆشێك چارەسەر ناکات بەڵکو چارەسەری ئەوانە

---

[٣٦٦] احیا ب١ لا ٥٨.

لەم مانایەدا بیری باسی گرنگی حاڵ و هەڵسووکەوتمان وەبیر دێتەوە لە چاندنی ماناو گەیاندنی بە فێرخواز، سەیری چارەسەری دەروونی نویٚ بکە بابی دووەم، مامۆستاو پەروەرشیار دەبێت پێشەنگ بێت، واتە ئەو زیاتر بە هەڵسووکەوتەکانی کاریگەری دەبێت تاوەکو قسەو ئامۆژگاریەکانی.

دەکات کە هیوای چارەسەرو چاکبوونیان هەیە، ئەگەر نەخۆشیەکە موزمین و بەردەوام و قوڵبوو ئەوا زیرەکی پزیشك تێیدا ئەوەیە کە بڵێت:

ئەمە چارەسەر وەرناگرێت خۆتان بەچارەسەرکردنیەوە سەرقاڵ مەکەن چوونکە تەمەن بەزایەدانە [٢٦٧]. پەروەردە گرنگیەکی زۆری هەیە لە بنیاتنانی هەڵسووکەوت و ئەخلاق و گۆڕانکاری تێیدا، وە هەروەها ئەمە مەترسیدارترینی سیاسەتەکانە.ئەم دەرئەنجامەی کە غەزالی پێی دەگات کێشەیەکی گرنگی تایبەت دەوروژێنێت لەبارەی سروشتی تیۆرە پەروەردەییەکانی لای موسوڵمانەکان کە تیۆرگەلێکن دەروونی و پەروەردەیی و ئەخلاقی و فێرکاری بەیەکەوە تێکەڵدەبن بەجۆرێك کە ناکرێت درێژەی پێبدرێت و بەش بەش بکرێت مەگەر بەشێوەیەکی مەنهەجی نەبێت، بەڵام لەڕووی پەیڕەو کردن و وێناکردنی ئامانجەکانەوە تێکەڵی و ئاوێتە بوونەکە زۆر توندە لەنێوانیاندا بەجۆرێك خەریکە بڵێین بەهەموو ئاڵۆزیەکان و وردەکاریەکانیانەوە لەحەقیقەتیاندا تەنها یەك شتە و ماناکەی لەسەر حەقیقەتی دەروون و هەڵسووکەوتەکانیان وەستاوەو بەرەو بەختەوەری دەڕوات.

---

[٢٦٧] ایها الولد لا ١٣٧.

شایانی باسە هەڵوێستی غەزالی لەبارەی فێرخوازو مامۆستاوە هەڵوێستێکی زۆر پێشکەوتوو بووە لەسەر دەمەکەی خۆی، هەرچەندە سەردەمی نوێ باسیان لە چەند مانایەکی هاوشێوە کردووە و ئەمڕۆکە خۆرئاوا خۆی بەخاوەنیان دەزانێت وەك شۆڕشێکی پەروەردەیی نوێ لەدژی شێوازە کۆنە چاولێکەریەکان، ئەگەر شۆڕشەکەیان ڕاست بێت ئەوا دەبێت ئاراستەی کۆمەڵگەکەیان بکرێت، بەڵام ئایا ئەوە شرۆڕشێکی ڕەهایە تەنانەت سەبارەت بە بتیۆرە پەروەردەیەکان لەلای موسوڵمانان هەروەك ئەوەی کە ئیبن خەلدون و غەزالی بانگەشەیان بۆ کردووە.

بەبۆچوونی من مەسەلەکە تەنها مەسەلەی خراپ حاڵیبوون یان کورتبینیە لەبەرامبەر تیۆرەکانی فیکری ئیسلامی کۆندا ئەم کەموکورتیەش هۆکارگەلێکی نیشتەنی هەیە لە عەقڵی ئێستەدا کە بەحاڵەتێکی نەخۆشی هاوشێوەی ئەوەی کە هەندێك نەخۆشی دەروونی هەیانە کە بریتیە لە نەخۆشی دیارنەمانی خود یان هەست نەکردن پێی، یان هەستپێکردنێکی کەموکورت پێی. ئەمە لەکاتێکدایە کە فەلسەفەی غەزالی لە ناوەڕۆك و گەوهەرو قوڵاییەکەیدا لەسەر جەختکردنەوە لە خود و هۆشیاری لەبارەیەوە وەستاوە.

هەروەك چۆن ئەم تیۆرە پەروەردەییە ئەو دیدە فەلسەفیە ئاراستە دەكاتەوە، بەڵكو بەكارهێنانێكی گشتیە بۆی، واتە باسكردنی پەروەردە و فێركردن نابێت لەدەرەوەی دیدێكی ڕووندا بێت بۆ بوون بەشێوەیەكی گشتی، ئەگەر سەردەمێك ئاڵۆزی هەبێت لە شێوازە پەروەردەییەكانیدا ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئەم دیدە یەكگرتووە بۆ جیهان، وەهەروەها حاڵەتێكی بێسەروبەری كۆمەلآیەتی و فیكری و سیاسی لیَ دروستدەبێت. لەگەلَ ئەوەی كە عەقلَ /زانست لەلای ئیمامی غەزالی دەبێتە هۆی بەختەوەری، ئەوا پەروەردە بریتیە لەهەڵسووكەوت بەرەو ئەو بەختەوەریە، وە ئەگەر عەقلَ / زانست ببێتە هۆی بەرژەوەندی و زاڵبوون و داگیر كردن ئەوكات پەروەردە دەبێتە ئەو هەڵسووكەوتەی كە دەبێتە هۆی گەشتن بەو ئامانجە هەروەك چۆن تیۆرە پەروەردەییەكانیش كە سەرەتای سەردەمی نوێوە گەشەیانكردووە لەپاش دۆزینەوەی كوجیتوی دیكارتی كە خودێكی داگیر كەری بوونەوەرە و خەون بە دەسەلآت و زاڵبوونەوە دەبینێت لەڕێگەی ئامێرەوە.

نمونەی پەروەردەیی غەزالی نمونەیەكە لەڕووی ئامانج و مەبەستەوە لەگەلَ فەیلەسوفەكانی پێش خۆی وەك ئیبن سینا و فارابی و ئەحمەدی ئیبن مسكەوەیهی دەگونجێت. بەڵكو ئیخوان الصفا لەپەیامەكانیاندا پلانگەلێكی پەروەردەییان داناوە كە دیدی فەلسەفی و سیاسیان نیشاندەدات، غەزالیش جیا نەبووە لە پێشینانی خۆی ئەوانەی كە دەكرێت بیانبەستینەوە بە ئەرستۆو ئەفلاتونەوە. فەلسەفەكانی سەردەمی ڕابوردوو لەسەر یەك مانا هاوڕاو ڕێك بوون كە بریتی بووە لە بەدەستهێنانی بەختەوەری، ئەمە سەرەڕای هەندێك جیاوازی لەماناو هۆكارەكاندا ئەمەش لەبەر توندو تۆڵی ئەو پەیوەندیەی كە دروستیانكردووە لەنێوان عەقڵی تیۆری و عەقڵی كرداریدا واتە لەنێوان زانست و ئەخلاق و سیاسەتدا. غەزالیش

هەروەك پێشتر باسمانكرد فەلسەفەكەی خۆی لەسەر بنەمای ئەو زانستەی كە عەقڵی تیۆری پێی گەشتووە بنیاتناوە و ئامانجێكی بۆ بوون(الوجود) داناوە كە بەدیهێنانی كامڵبوونەكەیەتی واتە بەدەستهێنانی بەختەوەریەكەیەتی، چوونكە هیچ بوونەوەرێك نیە كە كە كامڵبوونێكی نەبێت و هەوڵی بۆ نەدات، ئامانجی كامڵبوونیش پاككردنەوەی دەروون و بەدەستهێنانی چاكە و خێرە، كامڵبوونی تەواویش بریتیە لە ناسینی خودا، غەزالی دەڵێت: (بزانە بەختەوەری هەرشتێك لەوەدایە كە بۆی دروستكراوە) [٣٦٨] وە بەرێزترین شت لەمرۆڤدا دەروونی خۆیەتی، كامڵبوونی ئەخلاقەكەشی ئەوەیە كە كار بەزانستەكەی بكات، چوونكە بەزانست و كردار بەختەوەری بەدەستدێت. وە هەروەها لەبەر ئەوەی كە بەختەوەری ئامانجی هەموو هەڵسووكەوتێكی تیۆری و كرداریە دەبینین غەزالی لە دانراوەكەیدا(میزان العمل) چەندین بەشی لەسەرەتای كتێبەكە و ناوەڕۆكی بابەكانیەوە بۆ داناوە، بەڵكو باسكردنی بەختەوەری وەك تاكە جوڵێنەری نهێنیە كە بیرۆكەی كتێبەكەیان پێكهێناوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەم قسەیە بریتیە لە جوڵێنەری هەموو فەلسەفەكەی.

[٣٦٨] كيمياء السعادة لا ٣٠.

# بەشی یەکەم

## لە مانای بەختەوەرییەوە

غەزالی کتێبی(میزان العمل)ی بەباسکردنێك لەبارەی بەختەوەریەوە دەستپێکردووە و بەشگەلێکی سەربەخۆی بۆ دیاریکردووە، لەبەشی یەکەمدا باسی ئەوە دەکات کە(خاوبوونەوە لە بەدەستهێنانی بەختەوەریدا بێ عەقڵیە) لەبەشی دووەمیشدا باس لەوە دەکات کە خاوبوونەوە لەگەڕان بەشوێن ئیمان و باوەڕدا بە ڕۆژی دوایی بێ عەقڵیە، لەبەشی سێیەمیشدا باس لەوە دەکات کە ڕێگەی بەدەستهێنانی بەختەوەری زانست و کردارە.

ئەم سێ بەشە غەزالی لەسەرەتای کتێبەکەیدا وەك پێشەکیەك باسیاندەکات بۆ باسکردنی بابەتی دەروون و هێزو ئەخلاقەکانی، تاوەکو دەگاتە بەشی شەشەم و باسی ڕێژەی کردار دەکات لەزانست و بەرهەمهێنانی ئەو بەختەوەریەی کە لێکۆڵەرەوانی صۆفی هاوڕان لەسەری و تێڕوانینکارانی غەیری خۆشیان پشتگیریان کردوون. لەم بەشانەدا ئەوە دەزانرێت کە بەختەوەری هەرچەندە بابەت و خواستی هەموو عەقڵمەندانە، بەڵام نەلە دەروون و نە لە دەرەوەی دەروونیشدا ئامادە باشی نیە، بەڵکو دەرئەنجامی جەدەلێکە کەلەنێوان زانست و کرداردا هەیە، واتە

بەختەوەری لە ئامێری بەرهەم و مەرجی بەرهەمهێنان بەرهەمهاتووە، واتە زانست و کردار کاتێك داخوازی بەختەوەری دەکەن ئەوا داوای شتێکی دەرەوەی خۆیان یان داوای شتێکی نامۆ ناکەن بەڵکو داواو هەوڵی بەدەستهێنانی بەختەوەری دەدەن هەروەك بڵێی ژیانی عەقڵمەندان کە زانست و کردار تێیدا یەکدەگرن ئەو شوێنەیە کە بەختەوەری بەرهەمدێت، ئەم ژیانەش لە گەوهەرو ناوەڕۆکیدا بریتیە ژیانی دەروونی مرۆڤایەتی لە گەشتیدا بەناو جەستە و لەپاش جەستەش.

باسکردنی بەختەوەری باسکردن نیە لە کەمالیات و زەروریاتەکان هەروەك ئێمە ئەمڕۆکە و لەم سەردەمەدا باسی دەکەین، وە هەروەها باسێك نیە هەروەك هەندێك ناویان لێناوە خۆشویستنی مانەوە یان جوانی مانەوە، وە هەروەها باسکردنیش نیە لە سود و بەرژەوەندی، بەڵکو بەختەوەری لەکۆتاییدا تەنها بریتیە لە بەرهەمی عەقڵ و کردار، واتە بریتیە لە ژیانی عەقڵ و کردار.

باسکردنی بەختەوەری تەنها لەفەلسەفەی غەزالیدا کورت نەکراوەتەوە، هەرچەندە گرنگیەکی زۆر گەورەی پێداوە ئیتر لەڕووی دیاریکردنیەوە بێت لەڕوانگەی تیۆریەوە یان بەتایبەت لەڕوانگەی باسکردنی مەرجەکانی وەدیهێنانیەوە بێت لەڕووی کرداریەوە، ئەو شتەیە کە وایلێکردووە سەرقاڵی باسگەلێکی قوڵ بێت لە شارەزایی دەروون و ئاشکراکردنی قۆناغەکانی و باسکردنی چۆنیەتی پاککردنەوەی و ملکەچپێکردنی، لەگەڵ ئەوەی کە بتوانێت وایلێبکات توانای بەرهەمهێنانی بەختەوەری هەبێت، بنەڕەت و ئەصڵیش لە بەرهەمهێناندا زۆر لەخۆکردن و ویست و ئیرادەیە، چوونکە لەکۆتاییدا دڵ لەسەر نەریتی خۆی ڕادەهێنێت و ئەخلاق لەدڵی خاوەنەکەیدا دەنەخشێنێت و ئەم دەڵێی ئەوە و ئەویش دەڵێی ئەمە، (هەرکەسێك بچێنێت دروێنە دەکاتەوە و هەرکەسێکیش بڕوات

دەگاتە جێ و هەرکەسێکیش داوا بکات دەستیدەکەوێت) [٢٦٩] کاتێك غەزالی لەباسکردنی دەروونیدا خاوەنی داهێنانێك نیە کە هێنابێتی و پێشینانی باسیان نەکردبێت، هەرچەندە بەباشی نوێگەری تێدا کردبێت، ئەمە مانای ئەوەیە کە بەختەوەری مەسەلەیەکە کە هاوڕێیەتی بیرکردنەوەی فەلسەفی کردووە، پێش غەزالیش یۆنانی و ئەسکەندەری و فەیلەسوفە موسوڵمانە پێشینەکان و شوێنکەوتوانی گروپە ئاینیەکان باسی بەختەوەریان کردووە، بەڵام ئەم زاراوەیە چەندین هەڵوێستی دژ بەیەکی بەخۆیەوە بینیوە وەك جیاوازی خوێندنەوە و هەڵوێست لەبارەی خودی فەلسەفەی ئیسلامیەوە.

لەدیارترین سەرچاوە فەلسەفیەکان کە دەتوانین بگەڕێینەوە بۆیان بریتیە لەسەرچاوەی ئەرستۆیی تایبەت بە ئەخلاق کە نامەیەکە و لەبارەی ئەخلاقەوە ناردوویەتی بۆ نیقوماخوس کە ئەرستۆ لەکتێبی یەکەمیدا بەناوی تێڕوانینی خێر و بەختەوەری یازدە باب و بەشی بۆ تەرخانکردووە، کە تێیدا پێناسەی بەختەوەری و مەرج و بنەماکان و هۆکارەکان و پەیوەندیەکانی بەعەقڵ و زانست و کردارەوە دیاریکردووە، واتە پەیوەندی بەدەروونەوە بەشێوەیەکی گشتی.

## ١ — هەڵوێستی ئەرستۆیی:

ئەرستۆ پێناسەی بەختەوەری دەکات بەوەی کە(کاراییەکە لەدەروونیدا کە بەڕێڕەوی چاکەکاری تەواودا دەڕوات) ئەم کاراییە تایبەتەی دەروون باسەکەی لەلای ئەرستۆ گۆڕیوە بۆ باسکردنی چاکەکاری کە دواتر پێناسەی دەکات بۆ ئەوەی ڕاستیەتی و مەرجەکانی بزانێت. ئەرستۆ هەوڵدەدات حەقیقەت و ڕاستیەتی

---

[٢٦٩] کیمیا السعادە لا ٢٨.

بەختەوەری بدۆزێتەوە، هەربۆیە چەندین گریمانەمان پێشکەشدەکات کە لەسەر یەك بنەما وەستاوە ئەویش زانین و مەعریفەیە. کەواتە(مادەم هەموو مەعریفە و هەموو بڕیارێك عەقڵمان بڕیاری لەسەر دەدات و مەبەست لێی خێرێکی پێویستە ئیتر لەهەر جۆرێك هەبێت. با ئێستە ڕوونیبکەینەوە و بزانین خێر کامەیە کە لەسەر بۆچوونەکەی ئێمە سیاسەت بەدوایدا دەگەڕێت، لەئەنجامدا خێری باڵا کە دەتوانین لەهەموو کارەکانی ژیانی ڕۆژانەماندا پەیڕەوی بکەین ئەوەیە کەباسکرا و ئەو زاراوەیەش کە مانای ئەو دەبەخشێت لەلای خەڵکی بەزۆری وەرگیراوو قبوڵکراوە. نەخوێندەوارە کانیش وەك ڕۆشنبیران بەم خێرەباڵایە دەڵێن بەختەوەری. لەبۆچوونی گشتی ئەواندا خۆشی ژیان و کرداری جوان هاومانایە لەگەڵ ووشەی بەختەوەری مرۆڤدا [٢٧٠]. بەمشێوەیە پێناسەیەکی باو لەلای ئێمە پەیدا بووە سەبارەت بەبەختەوەری کە خۆشگەزەرانی و کرداری جوانە، لەم پێناسەیەوە ئەوە ڕووندەبێتەوە کە بەختەوەری پەیوەندی بە ژیانی مادی مرۆڤی ئاساییەوە هەیە، بەڵام بابزانین خودی سروشتی بەختەوەری کامەیە؟

ئەرستۆ وەڵامێك دەداتەوە کە زۆر دوورە لە تێگەشتنی حەکیمەکانەوە و دەڵێت: : بەختەوەری هەندێکجار پەیوەستە بەلەزەت و خۆشی و سەروەت و ڕێزو گەورەییەوە، بەڵام ئەم بۆچوونە هەندێکجار گۆڕانکاری لەفیکرەدا لەبارەیەوە دروستدەبێت بەپێی ئەو بارودۆخەی کە لەسەری دەژی. نەخۆش بەختەوەری لە تەندروستیدا دەبینێت، هەژار لە دەوڵەمەندیدا و نەزان لە زانیاری خەڵکانی تردا

---

[٢٧٠] علم الاخلاق بۆ نیقوماخوس ك ١ ب ٢ ف ١ + ٢.

تێبینی بکە ئەم دیاریکردن و پێناسە نەخوێندەوارانەیە بۆ بەختەوەری هەمان ئەو دیاریکردن و پێناسەی ئێمەیە لەم سەردەمەدا ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئێمە کەوتووینەتە چوارچێوەی دژ بوونێکەوە واتە بەتایبەت لەبەرامبەر پێشینان و ئەرستۆییەوە، هەڵویستی ئەوان ڕۆحانیە و هەڵوێستی ئێمە مادیە.

دەبیبنێت، کەواتە هەڵە نیە کە خەڵکی بەختەوەری بەوە بزانن کە شیاوە لەگەلّ حەقیقەتی فەلسەفەو بەپێی سروشتی ژیانی خۆیان(چوونکە سروشت و تەبعەکان بەختەوەری لە خۆشی و لەزەتدا دەبینن) [٢٧١] وە هەروەها ئەم بەشێوەیەکی گشتی بەشەکانی لەزەت وەرگرتنی مادی وەر دەگرێت، هەروەك چۆن ئەرستۆ سێ بەش لەژیان باسدەکات: یەکەمیان ژیانی ئاژەلّی، دووەم: ژیانی سیاسی، سێیەمیش: ژیانی بیرکردنەوە و عەقلّی، هەرکەسێك بەختەوەری خۆی بەپێی ئەوەی کە ژیانی خۆی دەیخوازێت دیاریدەکات، بەلاّم ئەرستۆ زۆر فراوانتر لەبارەی ژیانی عەقلّی و بیرکردنەوەوە باسدەکات بەپێی دیاریکردنی ئەو ئامانجە ڕاستەقینەیەی ژیانی مرۆڤ کە مرۆڤ بۆ خودی خۆی پێی خۆشە، هەربۆیە خۆڕاگر دەبێت لەبەرامبەر سەختی و نارەحەتی و تێکۆشانەکانی ژیاندا. لێرەوە دەتوانین مانای گشتی بەختەوەری دیاریبکەین و بلّێین بریتیە لە ئامانجی کۆتایی هەموو کارو کردارەکانی مرۆڤە کە تەنها بە ناسینی کردەوەی تایبەتی مرۆڤ لێی تێدەگەین ئەم کردەوەیەش کارابیەکە لەدەرووندا کە بەرێڕەوی چاکەکاری تەواودا دەڕوات. کاملّ و کۆتایی و تەواو ئەوەیە کە بەردەوام بۆ خۆی پێویستە و بەهیچ شێوەیەك بۆ شتەکانی تر داوای ناکات [٢٧٢].

(کەوابوو بەختەوەری بەمانا ڕاستەقینەکەی بریتیە لە شتێکی کۆتایی تەواوی خودکەفا مادەم ئامانجی هەموو کارە گونجاوەکانی مرۆڤە) [٢٧٣].

ئەگەر ئەمە پێناسەی بەختەوەری بێت، ئەوا ئەرستۆ لەلایەکی ترەوە پێناسەی دەکات و زاراوەی خێر بەکار دەهێنێت و تەنانەت لەزۆر شوێندا دەیبینین هەردەلّێی جیاکاری ناکات لەنێوان هەردوو زاراوەکەدا بەلاّم لەم شوێنەدا جۆرێك لەڕوونی

---

[٢٧١] علم الاخلاق ك ١ ب ٢ ف ١٠.

[٢٧٢] علم الاخلاق ك ١ ب ٤ ف ٤.

[٢٧٣] علم الاخلاق ك ١ ب ٤ ف ٨

دەردەخات لەم قسەیەیدا کەدەڵێت: (بەڵام لەوانەیە هەندێکجار لەگەڵ هاوڕابوونمان لەسەر ئەوەی کە بەختەوەری بەبێ ڕکابەر بریتیە لەگەورەترینی خێرو چاکەکان، خێری باڵا لەوانەیە لەگەڵ ئەمەشدا حەزی لەوەبێت کە سروشتیشی بناسێت لەبەر ئەوەی کە زۆر ڕوون و ئاشکرایە) [٢٧٤].

لەپاش ئەمە ئەرستۆ وەڵامدەداتەوە و دەڵێت: (دڵنیاترین و جەخت لەسەر کراوەترین هۆکار بۆ بەدەستهێنانی ئەم بنەما تەواوە بریتیە لەزانست کە کاری تایبەتی مرۆڤە) [٢٧٥] ئەرستۆ ئەم کردارە تایبەتەش دیاریدەکات بەم قسەی کە دەڵێت: (دەتوانین ئەوە بسەلمێنین کە کرداری تایبەتی مرۆڤ بەگشتی بریتیە لەجۆرێك ژیان ئەم ژیانە تایبەتەش بریتیە لە کارایی و بەردەوامبوونی کارانێك کە هاوڕێیە لەگەڵ عەقڵدا) [٢٧٦].

ئەم پێناسە و دیاریکردنەی کە زیاتر و بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك لەگەڵ ئەرستۆدا ڕووندەبێتەوە کە بەختەوەری دەداتە پاڵ دەروون نەك بۆ لای چاکە دەرەکی و چاکەکانی جەستە.

لەپاش ئەمەوە ئەرستۆ خێرو چاکە دەرەکیەکان دەهێنێتە ناو پێناسەی بەختەوەریەوە و دەڵێت: (شتێکی مەحاڵە یان بەلایەنی کەمەوە ئاسان نیە کە مرۆڤ بتوانێت خێر بکات و لە هەموو شتێك بەدوور بێت، لەهەندێك شتدا هاوڕێیان و پارە و دەسەڵاتی سیاسی دەبنە ئامێرگەلێك کە مرۆڤ بێنیاز نیە لێیان. هەندێك شتی تریشمان هەن کە بێبەشبوون لێیان دەبێتە هۆی تێکدانی بەختەوەری خەڵکی کە پێویستیان بەم شتانە هەیە، ڕێزی شوێنی لەدایکبوون خێزانی بەختەوەر و جوانی،

---

[٢٧٤] علم الاخلاق ك ١ ب ٤ ف ٩.

[٢٧٥] علم الاخلاق ك ١ ب ٤ ف ١٠.

[٢٧٦] علم الاخلاق ك ١ ب ٤ ف ١٤.

چوونکە ناکرێت بەمرۆڤ بگوترێت بەختەوەر کاتێك ناشیرین بێت یان لەشوێنێکی پەستدا لەدایکبوبێت یان هیچ منداڵێکی نیە وەجاخ کوێربێت، یان لەوانەیە لەمەش کەمتر بێت کاتێك مرۆڤێك هاوڕێ و منداڵی ڕەوشت ناشیرینی هەبێت، ئەمەش دیسانەوە نابێتە بەختەوەری ڕاستەقینە، یان لەوانەیە منداڵ و هاوڕێی باشی هەبووبن بەڵام مردن لێی ستاندبێتەوە، ئەم حاڵەتەش لەبەختەوەری بێبەشیناکات) [٢٧٧] ئەم شتە زیادانەی کە بەڵگەن لەسەر خێرە دەرەکیەکان و خێرەکانی جەستە لەگەڵ خێرەکانی دەروون مانای ڕواڵەتی بەختەوەری و گشتی دەگەیەنن بەڵام سەبارەت بەچاکەکاری مەسەلەکە بەپێچەوانەوەیە، لێرەدایە شوێنی ئەو تێکەڵبوونەی کە لەنێوان بەختەوەری چاکەکاریدا هەیە، لوتفی سەیدی وەرگێڕ لەپەراوێزدا باسدەکات و دەڵێت: : سوقرات نمونەیەکی نوێیە لەم بابەدا چوونکە ئەو بەبێ بوونی خێرێك لەخێرە دەرەکیەکان دەبینین لەڕاستیدا ناوبراو بەختەوەرترین و چاکەکارترینی خەڵکی بووە لەیەك کاتدا.

ئەگەر بەختەوەری هێندە پلەو پایەی بەرزە و هێندە مەترسیدارە لەسەر ژیانی مرۆڤ ئەواو بێگومان وەك بەخششێکی خودایی وایە(لەڕاستیدا ئەگەر لەدوونیادا بەخششێك هەبێت کە خوداکان ببیەخشن بە خەڵکی ئەوا دەتوانین بەبڕوایەکی بەهێزەوە بڵێین بەختەوەری بریتیە لەو نیعمەت و بەخششەی کە بەرەو ئێمە دێت و مرۆڤیش دەبێت پێشوازی لەم عەقیدە و بیروباوەڕە بکات چوونکە هیچ شتێك بەلای ئەوەوە پلە و پایەی لەو بەرزتر نیە) [٢٧٨] بەڵام ئەمە نەرێی ئەوە ناکات کە بەفێربوون و خوێندن و گرنگیدان و چاودێریکردنی گونجاو بەدەستدێت، وە

---

[٢٧٧] علم الاخلاق ك ١ ب ٦ ف ١٤ +١٥.

[٢٧٨] علم الاخلاق ك ١ ب ٧ ف ٢.

هەروەها نابێت بەمندالْ بگوترێت بەختەوەر چوونکە بەختەوەری دوو مەرجی پێویستە: مەرجی چاکەکاری تەواو مەرجی ژیان کە بەتەواوی کامڵبووە. هەرچەندە ئەم دوو مەرجە هەندێك لە مەسەلە و پرسیارگەلێك دەوروژێنن کە ئایا بەپیاوێك دەگوترێت بەختەوەر مادەم زیندووبێت، یان پێویستە چاوەڕێی ئەوە بکەین و بزانین کەی دەمرێت ئەوکات بڵێین مرۆڤ بەختەوەرنابێت و ناگاتە بەختەوەر مەگەر لەپاش مردنی نەبێت؟

ئەرستۆ وەلأمی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێت: (ئەگەر ئێمە نەتوانین ئەوە بسەلمێنین کە مرۆڤ بەختەوەر نابێت مەگەر لەپاش مرن نەبێت... وە ئەگەر تەنها بمانەوێت بڵێین ناکرێت مرۆڤێك بەدڵنیاییەوە ناوبنێین بەختەوەر مەگەر ئەو کاتەی کە بەدوور دەبێت لە هەموو خراپە و خراپەکاری و بەلأو موسیبەتێکی زەمانە، ئەوا ئەم بۆچوونە تەسکە تاوەکو ئەم ئاستە ناتوانێت بەردەوام وەك بابەتی جێگەی جیاوازی بمێنێتەوە) [٢٧٩].

ئەم جیاوازیە کاتێك توندتر دەبێتە کە ئێمە پرسیاربکەین لە گونجانی بەدەستهاتنی بەختەوەری یان بەدبەختی لەپاش مردن لە کەسانێکدا کە نەوەکانیان بوونەتە هۆی بەختەوەریان، چوونکە لەگەڵ نەوەکانیاندا و بەهۆی ئەم هەموو گۆڕانکاریەوە جارێك لەگەڵ ئەواندا هەستدەکەن بەختەوەرن و جارێکیش هەست بە بەدبەختی دەکەن.

بۆ دەرچوون لەم جیاوازیە کەڵەکە بوو پێشهاتووە بۆ هەردوو مەرجی بەختەوەری ئەرستۆ دان بەوەدا دەنێت کە(پیاوی بەرێز کە داوای بەختەوەری ناکات مەگەر لە چاکەکاریەوە نەبێت هەرگیز ناکرێت بێ هیوا بێت مادەم کردەوەی

---

[٢٧٩] علم الاخلاق ك ١ ب ٧ ف ١٤.

خراپ و ناپەسەندی ئەنجام نەداوە، بەبۆچوونی ئێمەش مرۆڤی چاکەکاری ڕاستەقینە و مرۆڤی دانا و حەکیمی ڕاستەقینە دەزانێت کە توانای هەموو گۆڕانکارییەکانی زەمانەی هەیە بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لە ڕێزو کەسایەتی خۆی لەدەستبدات) [٢٨٠].سەرەڕای ئەم چارەسەرەی تر بەلاّم ئەرستۆ گومانی خۆی ناشارێتەوە لەبارەی بەختەوەری و بەدبەختی مردوەوە هەرچەندە دانی پێدا دەنێت، هەرچەندە گەرم و گوڕیەکەی زۆر کەمە.

لەبەر ڕووناکی ئەم باسکردنە خێرایەدا بۆ چەمکی بەختەوەری لەلای ئەرستۆ کە دەتوانین لەم قسەیەی دا کورتی بکەینەوە کە دەڵێت: (بەختەوەری بەپێی پێناسەی ئێمە بریتیە لەکارایییەکی دەروون کە بەچاکەکاری تەواودا دەڕوات) [٢٨١] دەتوانین بەمشێوەیەی خوارەوە پێناسەی بکەین: بەختەوەری بریتیە لەکارایییەکانی دەروون، بەپێی چاکەکاری کە پێویستی بەدوو مەرج هەیە مەرجی چاکەکاری تەواو لەگەڵ مەرجی کامڵبوونی ژیان کە بەخششێکی خوداییە هەروەك چۆن دەکرێت بەدەستهاتوو بێت بەفێربوون و گرنگیدان، چوونکە بەختەوەری پەیوەندی بەزانستەوە هەیە کە کاری تایبەتی مرۆڤە بەپشت بەستن بەعەقڵ، وە هەروەها ئەم بەختەوەرییەش کامڵ و تەواو نابێت مەگەر ئەو کاتەی کە مرۆڤ لەژیانیدا بەختەوەرییەکی تەواوی هەبێت ئەمەش مەسەلەی گریمانی بوونی بەختەوەری لەپاش مردن دەوروژێنێت کە مەسەلەیەکبووە ئەرستۆ گومانی خۆی تێدا نەشاردووەتەوە.

---

[٢٨٠] علم الاخلاق ك١ ب ٨ ف ٨.

[٢٨١] علم الاخلاق ك ١ ب ١١ ف ١.

ئەم بارودۆخە ئەرستۆییەی بەختەوەری بەپێی ئەخلاقی نیقوماخوسی بەختەوەری بنیات دەنێت، بەڵام ناتوانێت بناغەیەکی پتە و بەهێزی بۆ دابنێت چوونکە بنیاتنانێکی هاوڕێیە لەگەڵ گوماندا لەو مەسەلانەی کە بوونی خۆیان سەپاندووە بەسەریدا، وەك کامڵی و تەواوی بەختەوەری بەستراوە بە تەواوی ژیان و پەیوەست بوونی پێیەوە، هەروەك چۆن دامەزراندنێکی هاوڕێیە لەگەڵ مەرجێکدا کە ئەرستۆ خۆی دڵنیا نەبووە لە ڕاستبوونی، بەڵام ئەگەر ڕاستیەتی سەلمێنرا ئەوکات بەباشترین و چاکترین عەقیدە و بیروباوەڕێك دادەنرێت کە پێویستە پێشوازی لێبکرێت، مەبەستیشمان بەم مەرجە دانانی خودایە بە بەخشندەی ڕاستەقینەی بەختەوەری، فێر بوون بەبێ ئەوە نابێت کە ئینکاری ئەوە نەکەین کە فێربوون گرنگی خۆی هەیە، بەڵام بەخششی ئیلاهی ئەولاترو تەواوترو کامڵترە لە فێربووندا. هەربۆیە ئەرستۆ پێشوازی لێدەکرد ئەگەر بوونی هەبوایە.

بەم مانایە و لەبەردەم دانانی ئەم مانایە بۆ بەختەوەری لەلای ئەرستۆ لەوە تێدەگەین کە بۆچی نوسینە ئەخلاقیەکان پڕن لەباسگەلێکی تایبەت سەبارەت بە بەختەوەری، فەیلەسوفە موسوڵمانەکانیش کاریگەری ئەم بنە ئەرستۆییەیان لەسەر بووە، چوونکە چەمکو کێشمەکێشمەکانی شوێنەوارگەلێکی ڕوون و ئاشکرای لەدوای خۆی بەجێهێشتووە لە نوسینەکانیاندا کە تەنها لەسەر دەروونی ئەرستۆیی نەماوەتەوە بەڵکو تێکەڵیان کردووە لەگەڵ بنەماگەلێکی تردا کە گرنگیان لەوان کەمتر نیە وەك ڕواقی و ئەفلاتونیەکان، بەڵام ئەرستۆییەت وەك پێشەنگ ماوەتەوە کە یەکەمجار دەبێتە خۆراکپێدەری هەموو هەوڵێك کە بۆ دامەزراندنی ئەخلاق دەدرێت، ئەگەر بمانزانیایە کە ئەرستۆ دامەزراندنی میتافیزیکی بۆ ئەخلاق بە دوور دەزانێت کە بەتایبەت دەردەکەوێت بۆ ڕەخنەگرتن لەنمونە ئەفلاتونیەکان هەربۆیە

لەوە تێدەگەین کە بۆچی فەیلەسوفە ئیسلامیەکان ئەرستۆییەتیان لەگەڵ شتەکانی تردا تێکەڵ کردووە بەتایبەت ئەفلاتونیەت کە بەردەوام دەرروونی میتافیزکی ئاینی پاراستووە، چوونکە سوقرات باوەڕی بە هەرهەریەت(الخلود) ی ڕۆح هەیە و ئەو دادوەرەی کە لەپاش مردن و ئەم ژیانە پێی دەگات یەکسەر لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکات و هیچ شتێك نیە بەهۆی تاوانەکانیەوە لێی بترسێت... مرۆڤ لەم ژیانەدا بێجگە لەترسان لەتۆڵەی قیامەتی شتێکی تری نیە کە لێی بترسێت و توانای هەبێت کە خۆی لێ لابدات. ئەگەر بزانێت چۆن دەژی ئەوا لەلای خەڵکی هیچ شتێك لەدەستنادات، بەڵکو لەلای خوداکان هەموو شتێك دەباتەوە چوونکە زۆر بەتوندی چاودێری چاکەکاری دەکەن کە سەرچاوەیەتی و هەر ئەوانن کە یارمەتی دەری دەبن لەسەری [٣٨٢]. ئێمەش دەتوانین کۆتایی بەقسەکە بهێنین بەوەی کە(لەم ڕەخنە و باسکردنە شتێکی ئەوتۆ گرنگ نیە بەلامانەوە بێجگە لەوەی کە بیسەلمێنین کە دەکرێت ئەخلاقێك هەبێت کە جیاوازبێت لەوەی کە ئەرستۆ پەیڕەوی کردووە کاتێك وویستویەتی بنەما میتافیزیکیەکان لە ئەخلاق جیابکاتەوە کە پێی دەگوترێت سەربەخۆیی زانست و گونجانی کردار) [٣٨٣].

وە هەروەها دامەزراندنی ئەخلاق لەفیکری ئیسلامیدا ئەم نارەحەتی و ئاستەنگانەی ڕووبەڕوو بووەتەوە، کە دامەزراندنێکە سەرەتا لەسەر بنەماکانی ڕۆشنبیری ئیسلامی بەسود وەرگرتن لەو بنەمایانەی کە لە فەلسەفەی یۆنانی و فەلسەفەکانی ترەوە هاتوونەتە ناویەوە دامەزراوە، کتێبی میزان العملی غەزالیش تەنها یەکێکە لەو دانراوانەی کە بەڕوونی ئاستی سەربەخۆیی ئەو دامەزراندنە لەلای

---

[٣٨٢] پێشەکی وەرگێڕ بۆ کتێبی زانستی ئەخلاق لا ٥٩.

[٣٨٣] الفلسفة الاخلاقية فى الفكر الاسلامى لا ٢٢ د احمد محمد صبحي، دار المعارف الطبعة الثانية – ١٩٨٣.

موسوڵمانەکان دەخاتە ڕوو کە دژ نیە لەگەڵ سود وەرگرتن لە یۆنانیەکان و خەڵکانی تریش ئێمە لێرەدا واینابینین و باوەڕیشمان بەوە نیە کە بارون کارادوق باوەڕی پێیەتی و دەڵێت: (چەندین کەش و فشی گەورە دەبینین لە نێو ئەدەبی عەرەبیدا لەبارەی ئەخلاقەوە کە لە قوتابخانە مەشائی و ئەفلاتونیە نوێکانەوە سەرچاوەیانگرتووە) [٣٨٤] هەرچەندە ئەم لێکۆڵەرە پێشەنگی دەدات بە بنەما غەیرە ئیسلامیەکان بەڵام لەلێکۆڵینەوەکانیدا لەسەر غەزالی سەرسامی خۆی ناشارێتە سەبارەت بەوەی کە هەندێك شتی لای غەزالی دەگێڕێتەوە بۆ سەر یۆنانیەکان و دەڵێت: (زانستی ئەخلاق لەلای غەزالی بریتیە لەزانستی دەروونی هەڵسووکەوتی تایبەت دیارو ئاشکرایە کە ناوبراو کەمێك قەرزداری زانستی ئەخلاقی یۆنانیەکانە بۆ کەسێکیش کە پێدا چوونەوە بکات زانستی ئەخلاق شتێکی کەمتر نیە لە و پەروەردە ئەخلاقیەی کە لەلای گاورەکان هەیە لەو کاتەدا، بەڵام ئێمە سەرچاوەگەلی پێویستمان لەلا نیە کە ئەو چاوگانەمان بۆ ئاشکرا بکەن) [٣٨٥] من تێناگەم کە چۆن ئەم لێکۆڵەرە ڕێگە بەخۆی دەدات حوکمگەلێکی لەمجۆرە دەربکات بەبێ بەڵگەی پێویست و سەلمێنەر هەروەك خۆی دان بەنەبوونی وەها بەڵگە گەلێکدا دەنێت. بەڵام دەتوانین ئەمە بەدڵەڕاوکێی دەروونی تەفسیر بکەین کە ئەو خۆرهەڵاتناسە لەکاتی باسەکەی سەبارەت بەبیرمەندانی ئیسلام تێیدا ژیاوە، ئەو ناتوانێت سەرسامی خۆی بشارێتەوە بەڵام دەبینین بە هەندێك حوکمی خاڵی لە ڕاستیەتی و ئەمانەتی زانستی دەیشارێتەوە، چوونکە ئەو خۆرهەڵاتناسانە بەبێ زانست و بەرچاو ڕوونی و هیچ جۆرە ڕێنماییەك قسە دەکەن.

---

[٣٨٤] ( الغزالی) بارون کارادوقو لا ١٢١، ترجمه عادل زعیتر.

[٣٨٥] هەمان سەرچاوە لا ١٣٠.

ئەم ئیمامە واتە غەزالی کە وادەردەکەوێت لەچەندین کەلتورەوە شتی گێڕابێتەوە و نقڵی کردبێت و سەرنجی بارونی ڕاکێشابێت، ئەمەش لەو قسەیەیدا دەردەکەوێت کە دەڵێت: (هەندێك لەم سەرەتاو دەستپێکە ئاڵۆزانەی کە لەبارەی زانستی ئەخلاقی ئیسلامیەوە گوتراون غەزالی کتوپڕ وەك پیاوێکی شارەزاو زانا لەبارەی ئەخلاقەوە جڵەوی بابەتەکانی بەتەواوی و بەتوندی دەگرێت، کە زۆر وورده لەو ئامانجە دەروونیەدا و دانەرێکی سەرسوڕهێنەریشە لە هەموو بەشەکانی ئەخلاقدا) [٢٨٦] یەکێك لە سەیرترین و داهێنەر ترین کتێبەکانی بریتیە لە کتێبی(میزان العمل) کە لەپاش یەکلاییکردنەوەی هەڵوێستەکانی هێناویەتی لەبارەی فەیلەسوفەکانەوە، واتە لەپاش کتێبی(مقاصد الفلاسفە) و(تهافت الفلاسفە) و(معیار العلم). میزان العمل بەچوارچێوەیەکی تیۆری دادەنرێت کە غەزالی بنەمای تەسەوورەکانی لەبارەی ئەخلاقەوە تێدا دادەنێت، کە لەم کتێبەدای تیۆرو کرداری کۆکردووەتەوە لە یەکبوونێکی جەدەلیدا کە قوڵایی تێڕوانین و فراوانی دیدو بۆچوون دەردەخات کە لە بەختەوەری و چۆنیەتیەکانیەوە دەستپێدەکات کە ئامانجی هەموو زانست و هەڵسووکەوتەکانە بۆ ئەوەی بگاتەوە بەو ئەصڵ و بنەمایەی کە پێویستە هەموو زانست و هەڵسووکەوتەکان لەوەوە سەرچاوە بگرن کە بریتیە لەوەی کە(لەڕێگەی تێڕوانینەوە داوای حەق بکرێت بۆ ئەوەی ببیتە خاوەنی مەزهەبێك و وەك کەسێکی کوێر نەبیت و تەقلید و چاولێکەری بکەیت و بکەویتە سەر ڕێگەیەك کە لەدەوروبەرتدا هەزار نمونە هەبێت و بانگت بکەن کە تۆیان لەناوبرد و گومڕایانکردیت و لەڕێگەی ڕاست لایانداویت، لەکۆتاییشدا دەزانیت کە لە تاریکیدا دەژیت، هەربۆیە ڕزگارت نابێت مەگەر بە سەربەخۆیی نەبێت:

---

[٢٨٦] هەمان سەرچاوە لا ١٣٠.

خذ ماتراه ودع شيئا سمعت به

في طالع الشمس مايغنيك عن زحل

واتە: وەرگرە ئەوەی کە دەیبینی و واز لەوشتە بهێنە کە بیستووتە، کاتێك خۆرهەڵهات ئیتر پێویستت بە ئەستێرەی زوحەل نابێت.

ئەگەر لەرێزەوی ئەم ووشانەدا شتێکی تری بێجگە لە گومان هەبوایە لەسەر بیروباوەری بۆماوەییت ئەوکات هەوڵی فێربوونت دەدا بەڵام سودێکی نیە چوونکە وەك غەزالی دەڵێت: : گومانەکانن مرۆڤ دەگەیەننە حەق و راستی، هەرکەسێك گومان نەکات تێروانین ناکات هەرکەسێکیش تێروانین نەکات نابینێت، وە هەرکەسێکیش نەبینێت لە کوێری گومراییدا دەمێنێتەوە، پەنا دەگرین بەخودا لەمە، درود و سلاوات بۆ سەر پێغەمبەر و خانەوادە و یارو یاوەرانی) [٢٨٧].

ئەگەر غەزالی تەقلید و چاولێکەری رەتدەکاتەوە و رووودەکاتەوە گومان و تێروانین کە دامەزرێنەری یەقین و دڵنیابیە، کەواتە دەبێت لەم کتێبەیدا(میزان العمل) رێگەی کەسێکی سەربەخۆی گرتبێتە بەر، هەربۆیە ئەگەر لە دیاریکردن و پێناسەکردنەکەیدا بۆ بەختەوەری مەزهەبێکی تایبەتی گرتبێتە بەر، دەبینین رەگ و ریشەکانی دەگەرێتەوە بۆ فەیلەسوفە موسوڵمانەکان، بەڵام حەقیقەت و راستی بیناکردنەکە جیاوازە چوونکە غەزالی لە رۆحی خۆی خستووەتە سەری و کردوویەتیە تەسەوورێکی غەزالیانەی بێگەرد بەسود وەرگرتن لەئاماژە ئاینیەکانی سوقرات و بۆچوونە میتافیزیکیەکانی ئەرستۆ و هەوڵە گونجاندنیە(التوفیقیە) کانی

---

[٢٨٧] میزان العمل لا ١٣٧.

بیرمەندە ئیسلامیەکان، ئێستە بابزانین بارودۆخی بەختەوەری لە کتێبی میزان العملی غەزالیدا چۆنە؟

## ٢ هەڵوێستی غەزالی:

بەختەوەری لەلای ئیمامی غەزالی دەدرێتە پاڵ رۆژی دوایی، هەربۆیە غەزالی خۆی پێناسەی بەختەوەری دەکات بەوەی کە(مانەوەیەکی بێ لەناوچوونە، لەزەت و خۆشیەکی بێ ماندوبونە، دڵخۆشیەکی بێ سەرشۆڕیە، بەگشتی هەموو ئەو شتانەیە کە خوازیارو ئارەزوومەندێك ئەیەوێت، ئەبەدی ناو ئەبەدی و هەرهەریەکانە و بەهۆی سەردەم و دوورو درێژیەکانی زەمانەوە توشی کەموکورتی نابێت) [٢٨٨]. سنورەکانی ئەم بەختەوەریە بریتیە لە لەزەت و مانەوە و خۆشی و کامڵبوونەکان، بەلآم هەرشتێك لەو سنورە تێپەڕی ئەوا دەگاتە سنورێك کە لەناو چوون و ماندووبون و سەر شۆڕی و کەموکورتی تێدایە، بەلآم لەگەڵ ئەمەش خەڵکی حەزیان لێیەتی و خوازیاری خۆی هەیە و خاوەنەکەی ئامادەیە هەموو سەر شۆڕی دۆڕانێك قبوڵبکات بۆ ئەوەی کەمێك خۆشی و لەزەت بەدەستبهێنێت، هەر لەسەرەتاشەوە دەزانێت کە ئەم خۆشیانە بەردەوام نین چوونکە مردن لە بۆسەدایە و لەوانەیە پێش ئەوەی بگات بە هەموو ئامانج و خۆشی و لەزەتەکانی دوونیا بمرێت، لەگەڵ ئەمەش لە هەوڵ و کۆشش بەردەوامە بەتەماعی ئەم قەرەبووکردنەوەیە.

ئەگەر ئەمە حاڵی بەختەوەری دوونیابێت ئەوا بەختەوەری قیامەت وەسفدارە بەسیفەتەکانی کامڵبوون لە خۆشی و لەزەت و مانەوەدا ئەگەر یەکەمیان خوازراو بوو سەرەڕای کەموکورتیەکەی ئەوا بێ عەقڵیە کە داوای بەختەوەری دووەم

---

[٢٨٨] میزان العمل لا ٥.

نەکرێت(واتە لەزەت) چوونکە(عەقڵی کەموکورت دەبێتە چەتەو ڕێگری سەر ڕێگەی بەختەوەری سەرەڕای کامڵبوونی بەختەوەریەکەش) [٢٨٩] ئەگەر مەسەلەکە بەو جۆرەبێت کە ڕوونمانکردەوە کەواتە لاوازی باوەڕ سەبارەت بەڕۆژی دوایی بووتە هۆی ئەوەی کە بوونەوەران لەسەر ڕێگەی بەختەوەری خاوبوونەتەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە غەزالی هۆکاری خاوبوونەوە لەگەڕان بەشوێن بەختەوەری ڕاستەقینەدا بگێڕێتەوە بۆ لاوازی ئیمان و باوەڕ بەڕۆژی دوایی نەك باوەڕ نەبوون پێی، چوونکە عەقڵمەندان باوەڕیان پێی هەبووە و لەناخی دڵیاندا پێیانوابووە کە بەختەوەری ڕاستەقینە تەنها دەبێت بەختەوەریەکی ئەو دونیایی بێت واتە لەپاش مردن دێتەدی، ئەمەش یەکەمین جێگەی جیاوازیە لەنێوان مەرجەعیەتی غەزالی و ئەرستۆییدا، مەبەستیشم لەجێگەی جیاوازیەکان بنەمای یەکەمە کە غەزالی تیۆرەکەی لەبارەی بەختەوەریەوە لەسەر بنیات دەنێت، واتە داننان بە ڕۆژی دوایی و ژیان لەپاش مردن، ئەم دانپێدانانەش دەبینین لەلای ئەرستۆ کەمێك لاوازە و لەو پەڕی گوماندایە، چوونکە ئەرستۆ گومانی لەبوونی جۆرێك لە پەیوەندی هەبووە لەنێوان ژیان و دوای مردن واتە بوونی بەختەوەری لەپاش مردن.

بنەمای دووەم لەسەر داننانی غەزالی وەستاوە بەوەی کە خودا بەخشندەی ڕاستەقینەی بەختەوەریە لەکاتی وەدیهاتنی زانست و کرداردا، هەربۆیە حەقیقەت و ڕاستەقینەیی بەختەوەری لەسەر داواکردنی بەهەشت و ترسان لەئاگر ناوەستێت بەڵکو ڕووکردنە خودا ئامانجێکی بەڕێزی هەموو مەبەستێکە ئەم بنەما ناجێگیرەش لەلای ئەرستۆ خودی ئەرستۆ بە کامڵ و تەواوی دادەنێت ئەگەر بوونی هەبێت، کەواتە ئەوەی لەسەر غەزالی پێویستە بۆ ئەوەی تەواوترین بەختەوەری

---

[٢٨٩] میزان العمل لا ٦.

دابمەزرێنێت دەبێت ئەو دوو شتە بسەلمێنێت کە ئەرستۆ گومانی هەبووە تێیاندا ئەوانیش بریتین لەوەی کە: بەختەوەری بەخششێکی خودایییە، بەختەوەری ڕاستەقینە لە ڕۆژی قیامەتدایە.

(مرۆڤەکان لەبارەی قیامەت دەبن بەچوار بەشەوە [٢٩٠]: سێ گروپیان باوەڕیان پێیەتی، یەکێکیشیان باوەڕی پێی نیە و پێیوایە کە مردن نەبوونێکی ڕووتە)[٢٩١] بەڵام باوەڕدارو ئیماندارەکان باوەڕێکی پتەویان پێی هەیە و دان بەوەدا دەنێن کە لەزەت و خۆشیەکی ئەو دونیایی هەیە بەڵام لەبارەی سروشتەکەیەوە جیاوازن.

گروپی یەکەم: لەزەت و خۆشیە هەستپێکراوەکانیان سەلماندووە کە دەگەڕێنەوە بۆ هاوسەرگیری و خۆراك و بۆنکردن و دەستلێدان و جلوبەرگ لەبەر کردن و بینراو) [٢٩٢] لە گەڵ ئەم خۆشیانەشدا جۆرێك لە دڵخۆشی و چەند بەشێکی لەزەتمان هەیە کە لە باسکردن نایەن ئەوانیش بریتین لە هەموو گروپی موسوڵمانان بەگشتی و شوێنکەوتوانی ئاینەکانی جولەکە و مەسیحی.

گروپی دووەم: بوونیان بۆ خودێك سەلماندووە کە(چۆنیەتیەکەی بەدڵ و خەیاڵی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتووە) [٢٩٣] کە بریتیە لەو لەزەت و خۆشیە عەقڵیەی کە خودێکی هەستپێکراوی دەرەکی نیە، فیکرەی ئەمانەش دژە لەگەڵ گروپی یەکەمدا، هەرچەندە ئەوانیش لەڕێگەی خەیاڵەوە و لەکاتی خەوتندا سەلماندوویانە، چوونکە خەوتن حاڵەتێکە وەك مردن هەرچەندە خەوتن ناوبڕی تێدەکەوێت بەڵام مردن بەو جۆرە نیە و بەردەوامە هەروەك چۆن مردن نەبوونێکی ڕووت نیە،

---

[٢٩٠] میزان العمل لا ٧.

[٢٩١] میزان العمل لا ٩.

[٢٩٢] میزان العمل لا ٧.

[٢٩٣] میزان العمل لا ٧.

شوێنکەوتوانی ئەم گروپە بریتین لە فەیلەسوفەکان و هەندێك لە ئیلاهیە ئیسلامیەکان.

گرووپی سێیەم: ئینکاری لەزەت و خۆشی هەستپێکراویان کردووە لەڕێگەی حەقیقەت و خەیاڵەوە، چوونکە مردن پەیوەندی نێوان دەروون و جەستە دەپچڕێنێت و بەهیچ شێوەیەك ناگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی چوونکە لە ڕاستی مەسەلەکەدا خودێکی هەستپێکراو بوونی نیە مەگەر ئەو کۆمەڵە نمونەیە نەبێت کە خودا(شارع) ویستوویەتی وێنەکان لە زەینی لاوازی مرۆڤەکان نزیکبکاتەوە(بەلاَم لەبەر ئەوەی کە تێگەشتنی کەموکورتە لە هەستپێکردن و دەرکی باڵادا بەکەمترین و کەم بەهاترین شت نمونەی هێناوەتەوە ئەمەش وەك سۆزو بەزەییەکە بۆ گەشتنی بەوەی کە بەختەوەری ئەوی تێدایە) [٣٩٤] شوێنکەوتوانی ئەم گروپەش ئیلاهی و صۆفیە فەیلەسوفەکانن [٣٩٥].

---

[٣٩٤] میزان العمل لا ٨.

[٣٩٥] شتێکی بەسودە کە لەم جێگەیەدا هەڵوێستی غەزالی تۆمار بکەین لەبارەی فەیلەسوفەکانەوە کاتێك کە لەسێ مەسەلەدا کافریاندەکات کە گوتوویانە:

أ – جەستەکان حەشر ناکرێن بەڵکو پاداشتدراو سزادراو بریتین لە ڕۆحە ڕووتەکان، کەواتە پاداشت و سزاکان ڕۆحانین نەك جەستەیی، لەسەلماندنی ڕۆحانیەتدا سەرکەوتوو بون چوونکە خۆی سەلمێنراوە بەلاَم درۆیانکردووە لەوەی کە ئینکاری جەستەیی بوونیان کردووە و ئەوەی کە گوتوویانە کوفر کردن بووە بەشەریعەت.

ب – یەکێکی تریش لە کوفرەکانیان ئەم قسەیانە کە دەڵێن( خودا شتە گشتیەکان دەزانێت و شتە لقی و لاوەکی و ناسەرەکیەکان نازانێت، دیسانەوە ئەمەش کوفرێکی ڕاشکاوانەیە بەڵکو حەق و ڕاستی ئەوەیە کە خودا( لایعزب عنه مثقال ذرة فی السموات ولا فی الأرض) واتە یەك مسقاڵە زەڕەو گەردیلە لەئاسمانەکان و زەویدا لە خودا وون نابێت.

ج – یەکێکی تریش لە قسە کوفرەکانیان بریتیە لەوەی کە( باوەڕیان بە کۆنی جیهان و ئەزەلیەتی هەیە، ئەمە لەکاتێکدایە کە هیچکام لەموسوڵمانەکان ئەم باوەڕەیان نەبووە. سەیری المنقذ من الضلال بکە لاپەڕەکانی ١٠٦ – ١٠٧، وە الاقتصاد فی الاعتقاد لاپەڕەکانی ١٢٤ – ١٢٥ – ١٢٦ – ١٢٧ – ١٢٨ –.

لە الاقتصاد فە الاعتقاددا ئەم قسەیەی غەزالی هاتووە کە دەڵێت: ئەمە کوفرێکی ڕاشکاوانەیە و باسکردنیشی بەتاڵکردنەوەی سودی شەرعەکانە و داخستنی دەرگای ڕێنماییە بە ڕووناکی قورئان) ص ١٢٦.

بەڵام لەلایەکی ترەوە تێبینی دەکەین کە غەزالی حوکمی بەکوفر یان بەشتەکانی تر نەداوە بەسەر ئەم گروپانەی کە ئینکاری خودی هەست دەکەن، کە بریتین لە گروپی فەیلەسوفە ئیلاهیە صۆفیەکان، لە گۆشەنیگایەکی شەرعیەوە نیە بەتایبەت کە غەزالی لەکتێبەکەیدا الاقتصاد فی الاعتقاد ئاگاداریکردووینەتەوە حوکمدان بە کافرکردن یان بەشتەکانی تر تەنها حوکمێکی شەرعیە، غەزالی دەڵێت( کەوابوو ناسینی درۆ و نەزانی دەکرێت عەقڵی بێت، ناسینی ئەوەش کە کافر بێت یان موسوڵمان بێت تەنها شتێکی شەرعیە) لا ١٢٤.

ئەم قسەیە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە بیرکردنەوەی غەزالی لەبارەی فەیلەسوفەکانەوە لەسەر بنەمای شەریعەت وەستاوە و لەسەر زمانی شەرع باسی فەلسەفەکەیمان بۆ دەکات نەك لەسەر زمانی عەقڵ، چوونکە عەقڵ حوکمەکانی لە ڕاست و درۆ زیاتر تێپەڕناکەن، بەڵام بیرکردنەوە بەو جۆرە نیە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کتێبی تهافت الفلاسفە سەرەڕای ئەوەی کە کتیبێکە غەزالی موجادەلەی تێدا کردووە لەگەڵ فەیلەسوفەکاندا و فیکرەکانی تێکشکاندوون، بەڵام کارەکەی مەحکومە بە پەراوێزی بوونی تێڕوانین، یەکەمیان فەلسەفیەکی جەدەلیە و دوومیان شەرعیە، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە تێکشکاندنەکەی بۆ قسەکانیان کۆتایی و تەواوە، بەدرۆخستنەوەی کاری فەلسەفەیە و کافرکردنەکەی کاری شەریعەتە.

لە ڕووی سێیەمەوە حوکمەکەی غەزالی بەسەر فەیلەسوفەکاندا، دەکرێت بیگۆڕین بۆ صۆفیەکان، چوونکە ئینکاریەکی تەواوی زاتی جەستەیی دەکات لە هەموو ڕووەکانەوە، لەگەڵ ئەمەشدا غەزالی لەکتێبەکانیدا بە ڕاشکاوانە بەکافری ناوی بردبن، بەڵکو بەپێچەوانەوە وەسفیاندەکات و و بەدووروو درێژی باسیاندەکات، ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە غەزالی وەك قسەکەرێك بەسەرزمانی هەلی تەسەووفەوە وایلێهاتووە بیروباوەڕی وەك ئەوانی لێبێت، ئەمە لەحەشردا وەك بیروباوەڕی فەیلەسوفەکان وایە و هەڵوێستی خۆی گۆڕیوە و گونجاوە لەگەڵیاندا، هەربۆیە لەمیزان العمل دا دەبیینین فەیلەسوف و صۆفیەکان بەیەکەوە لە کۆمەڵەیەکدا کۆدەکاتەوە کە ئینکاری زاتی جەستەیی دەکات بەبێ باسکردن و ئاماژەدان بە کافرکردنیان هەروەك لە تهافت الفلاسفە کردوویەتی.

ناکرێت بڵێین غەزالی بۆچوونەکەی گۆڕیوە بەپێچەوانەی حیکمەت هاشمەوە کاتێك لەسەر کتێبی میزان العمل نوسیویەتی وەك پێشەکی، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە کتێبەکانی غەزالی بەتایبەت ئەوانەی کە لەکۆتایی ژیانیدا نوسیونی هەمان هەڵوێستی یەکەمی کە لە ئەحیائو تهافت الفلاسفە و ئیقتیصاد و مەزمونی کەبیرو صەغیردا هەیبووە ئێستەش دەریدەبڕێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کە پارێزگاری لە هەڵوێستی یەکەمی دەکات، ئێستە دەبێت بەچ شێوەیەك لەو هەڵوێستە تیبگەین کە لەمیزان العمل دا هاتووە ؟

ئەوەی کە من لەخوێندنەوە و لێکۆڵینەوەکانمدا پێی گەشتووم لەپاش خوێندنەوەم بۆ غەزالی ئەوەیە کە ئەم ئیمامە هەر لەسەرەتاوە لەسەر یەك هێڵی ڕوون و بەرەو سەر دەڕوات لادانیشی بۆ لای صۆفیگەری کێشە نەبووە، بەڵکو پلەیەکی بەرز بووە لە گەشە و پێشکەوتنی زانستی و ڕۆحی ناوبراو کە وەك بەردەوامی ناوەدەبرێت لەوەی

---

کە دابڕان بێت، ( چوونکە کۆتا شت کە لەسەرو مێشکی ڕاستگۆکاندا دەهێزێتە دەرەوە خۆشەویستی سەرۆکایەتیە)( میزان العمل لا ٧٨).( لەزەت و خۆشی سەرۆکایەتی و زاڵبوون زیاتر بەعەقڵمەندانەوە دەلکێت) هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە. واتە غەزالی لە ماوەکانی کۆتایی ژیانیدا خۆشەویستی سەرۆکایەتی و دەسەلاتی لەمێشکی خۆی دەرکردووە بۆ ئەوەی بگاتە ڕیزی ئەولیاو پیاوچاکان کە هێزی عەقڵیان بەدەستهێناوە کە خۆی بۆخۆی حیکمەتە و کۆتا قۆناغیشە کە مرۆڤ تەماعی تێدەکات.

دانە پاڵی ئیمامی غەزالی بۆلای صۆفیگەری و ئارامبوونی لەناویاندا مانای ئەوە نیە کە باوەڕی بەهەموو بیروباوەڕەکانیان هەیە، چوونکە لەچەندین شوێندا ڕەخنەی لەبیروباوەڕەکانیان گرتووە، لەدیارترینی ئەو ڕەخنانەش ڕەخنەگرتنی ناوبراوە لێیان لە بارەی هەڵوێستیان لەبارەی عەقڵ و تەئویلەوە، سەبارەت بە هەڵوێستی یەکەمیان لەبەشی سێیەمدا دەرم خستووە: ( بەهای عەقڵ / تیۆر).

وەهەروەها لەبارەی هەڵوێستیانەوە لەبارەی تەئویلەوە دەتوانین ئەوە باسبکەین کە غەزالی لەکتێبی مشکاە الانواردا هێناویەتی و دەڵێت( من دیارو نادیار کۆدەکەمەوە ئەمەش تەواوەو هەمان مانایە کە خۆی دەیڵێت( ئەهلی حەقیقەت و ڕاستی) کامڵ ئەوەیە کە هیچ ڕووناکیەك مەعریفەو وەرعەکەی نەشارێتەوە، هەربۆیە مرۆڤی کامڵ ڕێگە نادات کە سنورێك لەسنورەکانی شەرع وازلێبهێنێت لەگەڵ کامڵبوونی بەصیرەت و بیناییدا، ئەمەش هەڵەیەکە کە هەندێك لەسالیکینی خستووەتە ناو ئیباحەت و ڕاستن و پانکردنەوەی حوکمەکان بەشێوەیەکی ڕواڵەتی، تەنانەت هەندێکجار ئەگەر کەسێکیان نوێژی تەرك کرد بەڵام لەدڵیدا هەمیشە وایدەزانی لەنوێژدایە ئەوە شتێکی ڕەوایە... بەدلنیاییەوە ئەمە هەڵەیەکی گەورو بێ ئەقڵانەیە. ئەوەی کە ئێمە باسمانکرد بریتیە لە پژمەی ئەسپێك و چفەی سالیکێك کە شەیتان توشی ئیرەیی کردووە و بەپەتی لەخۆباییبوون ڕایکێشاوە. لا ١٦٢.

لەگەڵ ئەم ڕەخنەیەشدا غەزالی بەتایبەت ڕەخنە ئاراستەی صۆفیەکان دەکات کە باوەڕیان بە تولنەوە و یەکبوون و گەیشتن هەیە، دەڵێت هەموو ئەمانە هەڵەن، ( مونقیز لا ١٤١). لەوەی کە ڕابورد تێدەگەین کە دانەپاڵی غەزالی بۆلای صۆفیەکان مانای ئەوەنیە کە باوەڕی بە هەموو بیروباوەڕەکانیان کردبێت، بەڵکو لەلەمەسەلەی عەقڵ و حوکمی ڕواڵەت و نادیاردا لەبارەی شەرع و یەکبوون و فەنابوونەوە دژایەتیکردوون، وە هەروەها غەزالی باوەڕی بە حەشری جەستەیی هەبووە، بەڵام بەردەوام لەزەت و خۆشی عەقڵی ڕوونکردووەتەوە چوونکە دوورترە لەتەسەوورەوە بەپێچەوانەی لەزەتی جەستەییەوە ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە دەقی شەرع بەپێی بۆچوونی غەزالی دەبێت لەزاهیرو باتینیدا قبوڵمان بێت.

قورئان دیارو نادیاری هەیە سەرەتا و کۆتایی هەیە، دەبێت ئیمان و باوەڕمان بەهەموو ئەم پلانە هەبێت و تەنها سەرقاڵی یەکێکیان بین چوونکە تەنها سەرقاڵبوون بەیەکێکیانەوە وەك حەشویە بێعەقڵەکانمان لێدێت کە ئەهلی ڕواڵەتن و تووشی بێ عەقڵی و نەفامی ئەهلی نادیارو باتینیش دەبین. حیکمەتیش بریتیە لە کامڵبوون واتە باسکردنیان بەیەکەوە، چوونکە حەشر جەستەییە هەروەك لە ڕواڵەت و زاهیری ئایەتەکەدا هاتووە و عەقڵیشە هەروەك لە ناخ و نهێنی ئایەتەکەدا هەیە.

گروپی چوارەم: (بریتین لە کۆمەڵ و جەماوەری بێ عەقڵەکان کە ئینکاری قیامەت دەکەن و غەزالیش بەمشێوەیە باسیاندەکات و وەك گروپیش ناویان ناهێنێت، چوونکە پێی وایە لە چینی تێڕوانینکاران نین و پێیانوایە کە مردن تەنها نەبوونێکی ڕووتە.

غەزالی لەگەڵ ئەم گروپەدا موناقەشەی کردووە بۆ ئەوەی بێ عەقڵیەکەیان ئاشکرا بکات بەپێی بۆچوونی خۆی و هەڵوێستەکەیانی گێڕاوەتەوە بۆ زاڵبوونی هەواو ئارەزوو بەسەریاندا و نەیانتوانیوە ڕووبەڕوی ئارەزووەکانیان ببنەوە و ئەم هەڵوێستانەشیان دەدەنە پاڵ کەسانێکی ناوداری وەك ئەرستۆ و ئەفلاتون بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان هەبێت لەسەر ئەوەی کە ئەم بۆچونانەیان لەو فەیلەسوفانەوە وەرگرتووە، چوونکە ئەو کەسەی کە ئینکاری ڕۆژی دوایی دەکات سورە لەسەر بەڵگە هێنانەوە لەکارێکی تردا کە پەیوەندی بەژیان گوزەرانیەوە هەبێت، (ئەگەر لەگەڵ سروشتیدا گونجا ئەوا بەڕاستی دەزانێت و داوای بەڵگەی لێ ناکات لەکێوە ئەم مەزهەبەی هێناوە، بەڵام ئەگەر باسی مەزهەبێکی بۆبکات کە لەوانەیە دینارو دیرهەمی لەدەست دەربچێت، ئەوا بەبەڵگە نەبێت باوەڕی پێ ناکات) [٢٩٦].

غەزالی هەنگاوێك بەرەو ئەم ئاراستەیە دەڕوات لە موناقەشەکانیدا و ئەوە ڕووندەکاتەوە کە مرۆڤ هەڵوێستی لەگەڵ باوەڕ یان بێباوەڕیدا هەرچۆنێك بێت ئەوا دەبێت سەرقاڵی زانست و کردار و پشتکردن بێت لە خۆشیەکانی دوونیا. چوونکە مرۆڤ لەژیانیدا قوربانی گەلێکی زۆر دەدات و چاوەڕێی دەرئەنجامگەلێك دەکات کە گومانی هەیە بێنە دی و وەدیهاتنیان نەبڕاوەتەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە

---

[٢٩٦] میزان العمل لا ٩.

هەرکاتێك مەسەلەی قیامەت لە قۆناغی گوماندا بوو ئەوکات عەقڵ پێویستە هەوڵ و ماندووبون بەخەرج بدات، (عەقڵت دادوەرتە و داوات لێدەکات کە ڕێگەیەکی ئارام و بێخەم بگریتەبەر و لەم جۆرە مەترسیە بەدوور بیت) [٢٩٧] ئەگەر بێت و قیامەت وەهم بێت ئەوکات هیچ شتێك لەدەست نادەین، وە ئەگەر حەق و یەقینیش بێت ئەوا ڕزگارماندەبێت، ئەم بەڵگە هێنانەوەیە هێزی بەڵگەی فەلسەفی وەرناگرێت بەڵکو کاراییەکەی لەڕوانگەی دەروونەوە وەردەگرێت، مرۆڤی ئاقڵ ڕقی لە پەلەکردنە و کافریش بە ڕۆژی دوایی بەهۆی پەلە کردنەوەیە چوونکە هیچ بەڵگەیەك نیە کە پشتی پێببەسترێت بۆ ئاگادار بوون و ئامادەباشبوون. ئەم مەسەلەیە زۆر مەترسیدارە مرۆڤی ئاقڵیش نابێت هەڵوێستێکی نازانم و گوماناوی لەبارەیەوە هەبێت، وەهەروەها ئەگەر بڵێین لەوانەیە واش بێت ئەوکات قسەکە یەکسانە بە وا نەبوون، ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی دەروون ئامادەباش بێت بۆ ڕۆژی دوایی، هەندێکجار لەوانەیە گونجاو حەق بێت ئەمەش ڕزگاری مرۆڤی تێدایە، بەڵام ئەگەر گونجاوەکە وەهم بێت ئەوکات مرۆڤ هیچ شتێك لەدەست نادات، چوونکە هەموو ئەو گروپانەی کە باوەڕیان بەڕۆژی دوایی هەیە و بەپێچەوانەشەوە هاوڕان لەسەر بوونی بەختەوەری دوونیایی کە تێیدا سەربەرزی و ڕێزو پلە و پایە و هێزو سەلامەتی لە خەم و خەفەتەکان و بەردەوامی ئیسراحەت و ئارامی و دڵخۆشی بوونیان هەیە. لەمەشدا مرۆڤ سەرکەوتوونابێت مەگەر بە زانست و کردار نەبێت [٢٩٨].

زانستیش لەزەت و خۆشیەکی تایبەتی تێدایە و کەسێك کە لەزەتی دۆزینەوەی کێشەکانی نەچەشتبێت کە لەزەت و خۆشیەکی بێ کۆتایە ئەوا ئەو خۆشی و

[٢٩٧] میزان العمل لا ١٠.

[٢٩٨] میزان العمل لا ١٢.

لەزەتە ناناسێت، چوونکە زانستەکانیش بێ کۆتایین، بەڵام کردەوە بریتیە لە ڕیازەت و خۆڕاهێنانی هەواو ئارەزووە دەروونیەکان و کۆنترۆڵکردنی تورەیی و ملکەچپێکردنی بۆ عەقڵ بەمەبەستی وەدیهێنانی ئازادی، (کەواتە زانای کاراو کارزان لەلای ئەو کەسانەی کە تەنها بەختەوەری بەژیانی خۆشی دوونیا دەبینن باشترین حاڵی هەیە لە خەڵکانی تر) وە ئەو کەسەش کە ڕۆچووە لە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووەکانیدا ئەوا بەلای هەموانەوە بەدبەختی دوونیاو قیامەتە و هەرسێ بەشەکەی خەڵکیش هاوڕان لەسەر ئەمە، هەرکەسێك داوای بەختەوەری قیامەت نەکات ئەویش لە حاڵەتی بێئاگاییدا دەژی.

کەواتە ئێستە بۆمان ڕوونبوویەوە کە بەختەوەری لەلای ئیمامی غەزالی نابێتە بەختەوەریەکی ڕاستەقینە، مەگەر ببێتە قیامەتی، وە ڕێگەی بەدیهاتنیشی بریتیە لە زانست و کردار کە هەمان ئەو ڕێگەی باوەڕدارانە بە بەختەوەری دوونیایی، هەربۆیە پێویستە لەسەر عەقڵمەندان بەشوێن زانست و زانیاریدا بگەڕێن و دەستپێشخەریش بکەن لەکرداردا بە بەرزبوونە لەئاستی چاولێکەری و شوێنکەوتنی لوتکەی بینایی و شکاندنی ئارەزووەکان و تۆراندیان و ڕزگارکردنی عەقڵ لەبەندایەتیان بە بیرکردنەوە و تێڕوانین لە مەلەکوتی ئاسمانەکان و زەوی و ناخی دەروون تاوەکو دەگاتە کامڵبوونە تایبەتەکەی(چوونکە بەختەوەری هیچ مانایەکی نیە بێجگە لە بەدەستهێنانی کامڵبوونی دەروون کە گونجاوە بۆی) [٢٩٩].

کەواتە بەختەوەری ڕاستەقینە بریتیە لە بەختەوەری قیامەت و ئەو دوونیا، ئەمەش یەکەمین سەلماندنێکە کە غەزالی خستوویەتیەڕوو دەریهێناوە لەمانای بەختەوەری ئەرستۆییەوە. بەڵام سەلماندنی دووەمیش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە

---

[٢٩٩] میزان العمل لا ١٥.

بەختەوەری کە کامڵبوونی دەروونە لەپاش موجاهەدە و تێکۆشان لەدژی دڵ و دەروون و ڕیازەت دێتەدی تاوەکو ئیلهامی خودایی بۆ ئاشکرا دەبێت و دەیدۆزێتەوە.(گەشتن بە بەختەوەریش بە خۆ دارنین دەبێت لە شتە خۆ هەڵواسەکانی دوونیا بەمرۆڤدا و بەهەموو هیممەتیەوە ڕوویکاتە بیکردنەوە لەبارەی مەسەلە ئیلاهیەکان تاوەکو بەئیلهامی خودایی ڕوونیەکانی بۆ ئاشکرا دەبێت، ئەمەش بەپاکردنەوەی دەروونی دەبێت لەم لێڵیانە. گەشتن بەمەش بریتیە لە بەختەوەری و کرداریش یارمەتیدەر و پشتیوانە بۆ گەشتن بەو بەختەوەریە) [٤٠٠] کەواتە ڕێگەی بەدەستهێنانی بەختەوەری زانست و کردارە ئەمەش ڕێگەیەکە کە هەموو عەقڵمەندان هاوڕان لەسەری بەپێی بۆچوونی ئیمامی غەزالی، ڕێگەیەکی تریش هەیە بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەری ئەویش بریتیە لە بەصیرەت کە دۆزینەوە و کەشفی خودایی دەکاتە گونجاو بەختەوەریش خۆی بەخششێکی خوداییە، بەم سەلماندنەی دووەم چەمکی بەختەوەری لەلای ئیمامی غەزالی تایبەتمەندیە ئیسلامیەکەی وەردەگرێت ئیتر بڵێین بەزانست یان کردار یان بەصیرەت دەبێت.

سنوری بەختەوەریش بریتیە لە بەدیهێنانی کامڵبوونی دەروون یەکێکیان بەزانست و کردار دەبێت(واتە بەفێرکاری مرۆیی و زۆر لەخۆکردنێکی ئیختیاری کە پێویستی بەکات و ڕاهێنان و پەیڕەو کردن هەیە... دووەمیش بە بەخششی خودایی دێتەدی، هەندێك دەڵێن ئەمە بۆ غەیری پێغەمبەرانیش ڕوودەدات، کە پێیاندەگوترێت ئەولیاکان) [٤٠١]. کامڵبوونی دەروونیش بەستراوەتەوە بەکامڵبوونی

---

[٤٠٠] میزان العمل لا ١٦.

[٤٠١] میزان العمل لا ١٥.

هێزەکانیەوە واتە بە هاتنەدی دایکی چاکەکاریە کانەوە، کامڵبوونی هێزی عەقڵی بریتیە لە بەدیهاتنی حیکمەت کامڵبوونی هێزی توڕەییش بەدیهاتنی ئازایەتیە. کامڵبوونی هێزی هەواو ئارەزووش بریتیە لە پاکداوێنی، کامڵبوونی گشتی دەروونیش بریتیە لە ڕاسترەوی و مامناوەندی کە یاسای جیهانە.(بەم ڕێکخستن و دادپەروەری و مامناوەندیە ئاسمانەکان و زەوی وەستاون تاوەکو جیهان وەك یەك کەسی لێهاتووە کە هەموو بەش و هێزەکانی هاوکاری یەکتری دەکەن) [٤٠٢].(وە هەرکەسێك واگومان ببات کە قیامەت هیچ ئەسڵ و ئەساسێکی نیە و درۆیە ئەوە کوفری ڕووتیکردووە و لە گومڕاییەکی تەواودایە [٤٠٣]

هەرچەندە ئەم بیروباوەڕە گشتگیرە و مرۆڤایەتی لە خاوەنەکەی دوور خستووەتەوە و لەهەموو حاڵەکاندا بەرەو هەلاکەت و لەناوچوونی بردووە) [٤٠٤].

---

[٤٠٢] میزان العمل لا ٦٠.

[٤٠٣] باسکردنی کوفری ڕووت و گومڕایی تەواو حوکمێکە کە بەناوی حەقیقەتەوە قسە دەکات هەربۆیە ڕووت و تەواوەتیە، بەڵام کافرکردنی فەیلەسوفەکان بەحوکمی شەرعە، چوونکە فەیلەسوفەکان باوەڕیان بەڕۆژی دوایی هەیە بەڵام بەشێوەیەکی تر کە جیاوازە لەو جۆرەی کە شەرع باسیدەکات، ئاگادار بوون لەم جیاوازیە سودی ئەوەی دەبێت کە بتوانین لە هەڵوێستی غەزالی تێبگەین لەبارەی فەیلەسوفەکان و مەسەلەی کافرکردن و تێگەشتن لە هەڵوێستە تایبەتەکەی لەبارەی ڕۆژی قیامەتەوە.

غەزالی لە کتێبی میزان العمل دا سەرقاڵی سەلماندنی ڕاستیەتی ڕۆژی دواییە و سەرقاڵی سەلماندنی ڕووەکانی نیە ئەمەش لەبەر بەرابەرکردنیەتی لەگەڵ ئەو کەسانەی کە نینکاری و ملە جەڕێی بوونی دەکەن، لەنێو نینکاری و سەلماندندا هەڵوێستگەلێکی پێچەوانەی یەکتری بوونیان هەیە لەبارەی ژیانی دونیا و قیامەت و خودی بەختەوەریەوە بەتایبەت کە غەزالی لەکتێبەکەیدا دەستیکردووە بەمکارە و فیقهی دەروونی دامەزراندووە.

[٤٠٤] میزان العمل لا ٦٩.

باسکردنی ڕۆژی دوایی بەپێی بۆچوونی غەزالی تەنها شتێکی ئاینی نیە، بەڵکو قسەیەکە کە مرۆڤبوونی مرۆڤ دەیسەلمێنێت، ئامێرێکی وەدیهێنانی ئەوە، لەمەوە بەپێی غەزالی تێدەگەین کە هۆکاری ئەو ململانێیانەی کە لەنێوان خەڵکیدا هەن دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی ئیمان و باوەڕ و کامڵ نەبوونی چەمکی مرۆڤایەتی چ وەك تاك چ وەك کۆمەڵ، ئەم کامڵ نەبوونەش تەفسیری سەرکردایەتیەکی عەقڵی بەرژەوەندی خوداز دەکات وەك ئامانجێکی

ئەگەر بەختەوەری ڕاستەقینە بریتیە لە بەختەوەری ئەو دوونیا، ئایا لەلای ئیمامی غەزالی چۆن دێتەدی؟

غەزالی پێیوایە بەختەوەری دوونیایی ڕێگەی گەشتنە بە بەختەوەری قیامەتی(جیاوازی نیە لەنێوان بەختەوەری دوونیایی و قیامەتیدا، تەنها مەسەلەی پاش و پێشە، وەگەرنا خێرو چاکە خواستی هەموو ئاقڵێکە، ئیتر لەئێستەدا بێت یان لەدواتر و قیامەتدا) [٤٠٥]

هەربۆیە ئەو باوەڕی وایە کە هۆکارو بەدیهێنەرەکانی خێرە دوونیاییەکان بەپێی پلەی مرۆڤ کە لە پێشکەوتن و گەشانەوەی خوددا پێیان گەشتووە سێ جۆرن:

پلەی نەخوێندەواران کە خوازیاری ئارەزوویان هەیە و هۆکارو وەدیهێنەری خێر لەلای ئەو هاندان و ترساندنە(الترغيب والترهيب) لەوەی کە ڕوودەدات و لێی دەترسێت لەئێستە و داهاتووشدا.

بەڵام پلەی سوڵتان و پاشاو گەورەکانی دوونیا کە لە عەقڵمەندانن کە خوازیاری شەرم و شکۆیە و هۆکارو بەدیهێنەرەکەی هیوای بە سوپاسکردن و ترسە لە لۆمە کردن لەلایەن ئەو کەسانەی کە چاکەیان دەڵێن یان لۆمەیان دەکەن. پلەی ئەولیاو حەکیمەکان و بەدیهێنەرانی عەقڵمەندان خوازیاری پابەندبوونە و هۆکارەکەشی خوازیاری چاکەکاری و کامڵبوونی دەروونە چوونکە کامڵبوون و چاکەکاریەکە کە هیچ ئامانجێکی تری لەپشتەوە نیە. چوونکە ئەخلاق و چاکەکاری بێجگە لە بەدیهێنانی خودی خۆی ئەم بەدیهێنانەش پێی دەگوترێت بەختەوەری. هەروەك

---

مرۆیی کە مرۆڤایەتی هەوڵی بەدەستهێنانی دەدات کە خۆی بۆخۆی دوور کەوتنەوەیە لە ماناو چەمکی بەختەوەری. واتە فەلسەفە هاوچەرخەکان کێشەی بەختەوەریان باسنەکردووە، چوونکە خودی چەمکی مرۆڤایەتی گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

[٤٠٥] میزان العمل لا ٦٨.

چۆن لە بەختەوەری دوونیادا مرۆڤەکان پلە و پایەیان جیاوازە بەهەمان شێوەش لە بەختەوەری قیامەتیشدا جیاوازن، هەندێك تەنها ئەو پاداشتەیان دەوێت کە باسیان بۆکراوە و لەبەهەشتدا هەیە، ئەمانە پلەی نەخوێندە وارەکانە، هەندێکیش هیوا دەخوازن کە خودایان لێ ڕازی بێت و لە لۆمەی دەترسن لەڕووی شەرعەوە ئەمەش پلەی پیاوچاکانە(الصالحین) هەندێکیشیان هەیە کە بێجگە لەڕەزامەندی خودا هیچی تریان ناوێت ئەمەش پلەی ڕاستگۆیان و پێغەمبەرانە(الصدیقین والنبیین)[٤٠٦].

ئەم پلە دوونیایی و قیامەتیانە گونجاو هاو ئاهەنگن.بەپێی ئەو پلەیەی کە مرۆڤ بەدەستیدەهینێت لە دونیادا ئەوا لەقیامەتیشدا هەمان ئەندازە و پلەی دەستدەکەوێتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مەسەلەی قیامەت هێندە لە مەسەلەی دوونیاوو گرنگیپێدانیەوە دوورنیە، چوونکە سەرەتا گرنگیدانە بەدوونیا چوونکە کێڵگەی قیامەتە و ڕێگەی بەرەو ئەو دوونیا چوونە، (هاوکارو پشتیوان

---

[٤٠٦] هەندێك لە صۆفیەکان لەپلەی ڕاستگۆکاندایە و بێجگە لە ڕەزامەندی خودا و بینینی دەمووچاوی هیچی تریان ناوێت لەم ڕوانگەیەوەیە ئینکاری لەزەت و خۆشی هەستی دەکەن، ئەم ئینکاریەش مانای مەحاڵبوونی هاتنەدی نیە چوونکە عەقڵ ئەمە ناڵێت، لەگەڵ ئەوەشدا شەرع باسیکردووە کە هەیە، چوونکە تەسلیمبوون لەسەرەتاوە قورسترە لە تەسلیمبوون لە دووبارە بوونەوە، چوونکە دووبارە کردنەوە دروستکرنێکی ترە. ئینکاریکردنیان تەنها مانای ئەو ڕەتکردنەوە تایبەتەیاندەگەیەنێت بۆ خۆشی هەیستەکان چوونکە ئەوان تەماعی بینینی دەمووچاوی خودایان هەیە و هیچی تر( کەسێك کە بەندەی خودابێت لەبەر بەهەشت و ترسان لەئاگر، ئەوە کەسێکی ڕژد و پەستە، چوونکە ئامانجی کەسانی خودا وویست لەمە گەورەترە) ئەوان داوای بەڕێزترین شت دەکەن، هەرکەسێکیش داوای ئەم پلەیەی کرد ئەوا باوەڕی بەبوونی پلە نزمەکانیش هەیە بەڵام بۆ خۆی ئینکاریاندەکات، چوونکە کامڵترو گەشاوەترە. ئەگەر ئەم تێگەشتنە لەم ڕووەوە گونجاو بێت ئەی بۆچی غەزالی ئەو صۆفیانەی کە ئینکاری لەزەت و خۆشی هەستەکانیانکردووە لەقیامەتدا بەکافریان نازانێت هەروەك ئەوەی بەرامبەر فەیلەسوفەکان کردی، چوونکە فەیلەسوفەکان بەڕاشکاوانەی ئینکاری حەشری جەستەکانیانکردووە و لەحوکمی شەرعدا کوفرە و لە حوکمی عەقڵیشدا هەڵەیە. وە هەروەها غەزالی لەکتێبی میزاندا باسی سێ جۆر حەشرمان بۆ دەکات بەپێی پلەی خەڵکی نەخوێندەوار و پیاوچاکان و ڕاستگۆکان.

لەسەر دابینکردنی پێویستیەکانی دوونیا هاوکاری قیامەتیشە، چوونکە بەم هۆکارە دوونیاییانە دەتوانین بگەینە قیامەت)[٤٠٧]

بەختەوەری دوونیایی کە پشتیوانی قیامەتە بریتیە لە بەختەوەریەکی راستەقینە بەلاَم ناوی لێبنرێت ئەو دوونیایی ڕاسترە، بەلاَم ئەوەی کە پشتیوانی بەختەوەری قیامەت نیە ئەوە بەختەوەریەکی مەجازی یان هەڵەیە، ئەم بەختەوەریەش گونجاوە لەگەڵ ماناکانی تردا وەك بەرژەوەندی و جوانی لەزەت و خۆشی، پێناسەکردنی ئەم مانایانەش پێویستی بەزانیاری هەیە لەبارەی ڕاستی و حەقیقەتی مەسەلەکانەوە بۆ ئەوەی مرۆڤ بزانێت چی دەمێنێتەوە و باقیە و چی نامێنێتەوە و فانیە، ئەوکات دەزانێت کە بەختەوەری ئەو دوونیا بەرێزترین بەختەوەریە چوونکە لەناو ناچێت و بەردەوامە و ناگۆرێت و بۆ خۆی دەمێنێتەوە و بەرهەمەکەی لەقیامەتدا نەبڕاوە و بێ کۆتایە)[٤٠٨]

بەلاَم بەختەوەری دوونیایی لەناوچوو فانیە، چوونکە مرۆڤ دۆڕاوی برسیەتی و کوژراوی دەستی تێریە)[٤٠٩] هەموو لەزەت و خۆشیەکانی دوونیا حەوت دانەن: خواردن خواردنەوە هاوسەرگیری جلوبەرگ شوێنی نیشتەجێبوون بیستن بینین بۆنکردن کە هەموویان پەستن)[٤١٠]. لە دەردو نەخۆشیەکانیشی ئەوەیە کە هەریەکەیان دەگونجێن و ڕێکن لەگەڵیدا لەپاش بەدیهاتنی لە یەك چرکەساتدا، باسەیری حاڵەتی نەبوونی سەرجێی و خۆراك بکەین و بزانین چۆن حاڵەتی خوازراو ئاوەژو دەبێتەوە و یەکسەر لێی ڕادەکات، ئیتر چۆن لەگەڵ ئەمەدا دەگونجێت کە

---

[٤٠٧] میزان العمل لا ٧٣.

[٤٠٨] میزان العمل لا ٧٨.

[٤٠٩] میزان العمل لا ٧٨.

[٤١٠] میزان العمل لا ٧٨.

لەزەتەکانی لادەبەن و ئیسراحەتی هەمیشیەی لێ تێکدەدەن. بۆ خۆپاراستن لە ئافەت و دەردەکانی ئەم شتە پەستانە پێویستە دەروون لەسەر چاکەکاری ڕابهێنرێت، بەتایبەت پێویستە بەزانست و کرداری باش زاڵببین بەسەر هەموویاندا.[٤١١] ئەم وێناکردنە پڕ لەڕۆحانیەتە کە غەزالی دەیدات بەمانای بەختەوەری ئیتر دوونیایی بێت یان قیامەتی، هەڵوێستێکی دیاریکراو لەبارەی هەردووکیانەوە نیشاندەدات، کە هەڵوێستێکە ئەو دژایەتیە زیندووە دەداتەوە کە پێویستە وەك خۆی هەستپێبکرێت، ئەویش ئەوەیە کە(خۆشەویستی دوونیا سەری هەموو تاوانەکانە و دوونیا کێڵگەی قیامەتە و خێری بەسود و ژەهری کوشندەشی تێدایە)[٤١٢].

حەقیقەتی هەستکردن بەم دژبوون و پێچەوانەییە خۆی لە دۆزینەوەی ئەو چۆنیەتیەدا دەبینێتەوە کە چاکەی بەسود و خراپەی کوشندەی پێ جیادەکەینەوە، چوونکە هەردووکیان لەیەك شوێندان، بێئاگا ئەو کەسەیە کە ژەهرەکەی دەیکوژێت بەڵام مرۆڤی ئاقڵ سود لە مادە هۆشبەرو بێئاگاکەرەکەی وەردەگرێت، هەربۆیە هەرچیەك لەم ژیانی دوونیایەدا هەیە دەبێت بەمشێوەیە سەیر بکرێت چوونکە لەلایەکەوە خێرو چاکەیە و لەلایەکیشەوە شەڕو خراپەیە، واتە بەپێی ئەرکەکەی یان بەپێی ئەو شتەی کە دەدرێتە پاڵی، بەمشێوەیە غەزالی دەگەڕێتەوە بۆ باسکردنی گرنگی زانست لەبارەی ڕاستیەتی ئەو مەسەلانەی کە ئەرك و ڕۆڵ و پلەی هەمووشتەکانمان بۆ ئاشکرا دەکەن، ئەگەر دەروون لەگەڵ

---

[٤١١] میزان العمل لا ٧٩.

[٤١٢] میزان العمل لا ١١٤.

ئامانجەکاندا گونجا ئەوا تووشی بەختەوەری دەبێت بەڵام ئەگەر نەگونجاو تووشی لادان بوو ئەوا لەناودەچێت.

ئەم مانایەش دەچێتە بەشی باسکردن لەمیزانەوە کە ناوەڕۆك و گەوهەری ئەم کتێبەیە، ئەندازە و میزانی چاکە هەستکردنە بەپلەی شتەکە و بەدەستهێنانی ئامانجەکەی، ئەگەر ئەندازەگیری و میزانەکە لایدا ئەوکات کارەکە خراپ دەبێت.(خەڵکی سێ جۆر کەسن: پیاوێك بەهۆی قیامەتیەوە بیری بەلای دوونیای خۆیەوە نەماوە، ئەوە لەسەرفرازو براوەکانە، پیاوێکیش بەهۆی دوونیایەوە بیری بەلای قیامەتیەوە نەماوە، ئەوە لەو کەسانەیە کە لەناو دەچێت، پیاوێکیش سەرقاڵی هەردووکیانە ئەمەش پلەی ئەوانەیە کە مەترسی لادانی بەلای یەکێکیاندا لەسەرە ئەگەر نەتوانێت بالآنسی هەردوولا ڕابگرێت. بەڵام براوەو سەرفراز باشترە لەو کەسەی کە مەترسی لەسەرە) [٤١٣].ئەو پیاوەشی کە بەهۆی قیامەتەوە بیری بەلای دوونیاوە نەماوە ئەوە پێی دەگوترێت زاهید واتە کەسێك کە وازی لەخۆشی و لەزەتەکانی ژیانی دوونیا هێناوە.(زاهید کەسێك نیە کە هیچ ماڵ و سامانێکی نەبێت، بەڵکو زاهید ئەو کەسەیە کە ماڵ و دارایی هەیە بەڵام خۆی سەرقاڵی ماڵ و داراییەکەی نەکردووە، هەرچەندە سامانی هەموو دوونیای هەبێت... ئەگەر پیاوێك هەموو ئەوەی لەسەر زەویدایە هەڵیگرێت بۆخۆی و مەبەستی پێی ڕێگەی خودا بێت ئەوە پێی ناگوترێت خوازیارو ڕاغیبی دوونیا)[٤١٤] چوونکە ڕاغیب هەمیشە خەمبارو خەفەتبارە. وە هەروەها حەزو ڕوغبەتی لەم جۆرە هۆکاری بەدبەختی و سەر لێ شێوانە نەك بەختەوەری.

---

[٤١٣] میزان العمل لا ١٢٠.

[٤١٤] میزان العمل لا ١٢١.

لەو ڕێگانەی کە مرۆڤ دەگەیەننە بەختەوەری دوونیاو قیامەت، نەرێکردنە لە خەم و خەفەت، ئەمەش ناکرێت مەگەر مرۆڤ نەرێ لەهۆکارەکانی خەم بکات، مرۆڤی ئاقڵیش کاتێك لەم شتانە وورد دەبێتەوە زۆربەی خەمەکانی سەر دڵی کەم دەبنەوە. چوونکە هۆکاری غەم بریتیە لەخەفەت خواردن بۆ ڕابوردو یان ترسانە لەداهاتوو یان دڵتەنگیە لەو حاڵەی کە ئێستە مرۆڤی تێدایە، ئەگەر خەمەکە لەسەر شتێکی لەدەستچووبێت ئەوا مرۆڤی ئاقڵ دەزانێت کە خەمخواردن لەسەر شتێك کە ڕۆشتووە زیادە و هیچ مانایەکی نیە، ترسیش لەوەی کە دواترو لەداهاتوودا دێت لەبەر شتێکە کە چارەسەرەکەی مەحاڵە وەك مردن ئەمەش خەمخواردن بۆی بێ عەقڵیە. لەم شیکاریەشدا جەختکردنەوەیە لەسەر سروشتی کرداری ئەزموونی کە غەزالی لەسەری ڕۆشتووە لە زۆربەی قۆناغەکانی ئەم کتێبەدا، بەڵکو ئەم باب و بەشەدا بەشێکی بەسود دەکاتەوە لەجیهانی شیکاری دەروونی و چارەسەرکردنی هەندێك دیاردەی نەخۆشی وەك دڵەڕاوکێ و خەمۆکی، غەزالیش لەم خاڵەدا مەعریفەیەکی قوڵی سەلماندووە لەبارەی حاڵەتەکانی دەروون و نەخۆشی و چارەسەرەکانی، بەبەراوورد لەگەڵ ئەوەی کە لێکۆڵینەوە و شیکاری دەروونی هاوچەرخ پێی گەشتووە لەو بوارەدا.

کاتێك زانیمان کە بەختەوەری ئامانجی هەموو ئامانجەکانە و تاوەکو پێوەرو کێشانەی شتەکان نەزانین ئەویش نایەتەدی، چوونکە زانست پێوەری تایبەت بەخۆی هەیە و غەزالیش لە کتێبی(معیار العلم دا دیاریکردوون، غەزالی بەم دووکتێبە ئەو پێوەرانەی دیاریکردووە کە مرۆڤ بەهۆیانەوە خۆی دەپارێزێت لە کەوتنە ناو هەڵە و هەڵخلیسکانەوە، تیۆریی هاوشانی کرداریەو کرداریش هاوشانی تیۆریە، هەربۆیە ناکرێت مامەڵە لەگەڵ میزان العمل(پێوەر و تەرازووی کردار) دا

بکەین بەبێ هەڵوەستە کردن و وەستان لەسەر معیار العلم(پێوەری زانست)، هەرچەندە معیار العلم ئامانجەکەی بەدیهێنانی یەقین و دڵنیاییە، بەڵام میزان العمل ئامانجەکەی بەدیهێنانی چاکەکاریە، هەروەك چۆن بۆ معیار العلم مەرجگەلێك هەن کە غەزالی لەکتێبی ناوەبراویدا باسیکردوون کە بریتین لە پێشەکیەکانی بەڵگە و مەرجەکانی، بەهەمان شێوەش میزان العمل یش نیشانەی تایبەت بەخۆی هەیە کە شەرعە(چوونکە ناکرێت ئەم ڕێگە بگرینەبەر مەگەر دوای لەبەرکردن و پەیڕەوکردنی چەمکە شەرعیەکان نەبێت) [٤١٥]، بەپێی بۆچوونی ئیمامی غەزالی شەریعەت(حەنیفی لێبوردەیە هەرکاتێك پێویستیەك هەبوو ئەوکات شەرع مۆڵەتی داوە هەرکەسێك لەشوێنی مۆڵەتەکەدا بەبێ ئەوەی پێویستبکات کاریکرد ئەوا بە هەوەسی خۆی زیادەڕەوی کردووە) [٤١٦] کاتێك پابەند بوون بە پێوەر و تەرازووەوە هەبوو لەدەرووندا توانای هەڵسووکەوت دروستدەبێت لەڕێگەی خوادا بەمەبەستی نزیکبوونەوە لێی ئەمەش نزیکی کامڵبوونە نەك نزیکی شوێن بێت، بەم شێوەیە مەرجگەلێك تێك دەئاڵێن کە بەهۆی ئەوانەوەیە بەختەوەری دێتەدی و لەزانست و کرداردا کورتدەکرێتەوە بەپێی ئەو مانایەی کە شیکاریمان بۆ کرد لەناوەڕاستی کارەکەدا، پشت و پەنای ئەم مەرجانە و هۆکاری وەدیهاتنیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وویست و ئیرادەیەی کە مرۆڤ خۆی پێ ئارایشت دەکات و هەیەتی لەڕێگەی خۆدارِنینی گشتی و یەکجارەکی لەچاولێکەری بۆ ئەوەی ببێتە خاوەن مەزهەب و تەریقەت و ڕێگەی تایبەت بەخۆی بۆ ئەوەی گومانبەر بێت و گومانیش بەڵگەی تێڕوانین و ئامادەباشی چاوەکانە، (هەرکەسێك گومان نەکات تێڕوانینی نیە وە

---

[٤١٥] میزان العمل لا ١٣٠.

[٤١٦] میزان العمل لا ١٣١.

هەرکەسێکیش تێڕوانینی نەبێت بەصیرەتی نیە هەرکەسێکیش بەصیرەت وبینایی نەبێت لە کوێری و گومڕاییدا دەمێنێتەوە)[٤١٧].

کەواتە تێگەشتنی غەزالی لەبەختەوەری بنەماگەلێکی ئەرستۆیی هەیە بەڵام بەڕۆحی ئەفلاتونی تێرکراون بەڵام چوارچێوەی بیرکردنەوەکەی ئیسلامیە بەتایبەت ئەو سەرچاوانەی کە ئەم پشتیان پێ دەبەستێت لەئاست و سنوری ئایەتە قورئانیی فەرموودەکانی پێغەمبەر و قسەی پێشەواکان تێپەڕناکەن، غەزالی لەم مانایەدا لەگەڵ فەیلەسوفە ئیسلامیەکاندا ڕۆشتووە بەتایبەت ئەوانەی کە ڕێزی پێشینەییان هەیە بەتایبەت فارابی و ئیبن سینا، چوونکە ئەم دوانە لەنوسینە فەلسەفیەکانیاندا بەشگەل و کتێبانێکیان تایبەتکردووە بە کێشەی بەختەوەریەوە. بۆ نمونە فارابی لەدووکتێبی بەنرخدا توانیویەتی لێکۆڵینەوە و شیکاری چەمکی بەختەوەری بکات.

ئیبراهیم مەدکور لە کتێبەکەیدا(فی الفلسفة الاسلامیة منهجه وتطبیقه) لا ٤١ دا دەڵێت: (فارابی زۆر گرنگیداوە بە بابەتی بەختەوەری لەڕووی زانست و کردارەوە و دووکتێب لەکتێبەکانی تایبەتکردووە پێیەوە کە تێیدا زۆربەی بۆچوونە جیاوازەکانی صۆفیەکانی تێدا شەرح و ڕاڤە کردووە و ئەو پەیامانەی ڕوونکردووەتەوە کە مرۆڤ دەگەیەننە بەختەوەری. ئەو دووکتێبەش بریتین لە(تحصیل السعادە) واتە: بەدەستهێنانی بەختەوەر، لەگەڵ(تنبیه السعادە) واتە: ئاگادار کردنەوە لەبارەی بەختەوەریەوە. کە لەشاری حەیدەر ئاباد لەساڵەکانی ١٣٤٥ – ١٣٤٦ ك چاپکران و هەموو ئەو پەیامانەی فارابیان لەخۆ گرتبوو کە بەووردی بابەت و ڕوونی شێوازەکانیان بەئێمە گەشتبوو... فارابی هەربەم لێکۆڵینەوە تیۆریەوە نەوەستا بەڵکو زۆربەبڕشتەوە هەوڵیدەدا کە خۆی تامی

---

[٤١٧] میزان العمل لا ١٣٧.

بەختەوەری بچێژێت و بە بیرکردنەوە و تێفکران بگاتە قۆناغی فەیزو ئیلهامی ئیلاهی هەروەك چۆن پێشتر ئەفلاتون کارێکی لەو شێوەیەی کردووە و دەڵێن جارێك یان دووجار گەشتووە بەو فەیزە [٤١٨]. لەم لاکردنەوەیەدا هێندە بەسە کە پێناسەی ناوبراو بۆ بەختەوەری بخوێنیتەوە کە پێناسەیەکی نزیکە لەڕووی ماناوە لە پێناسەکەی غەزالی، (بەختەوەری ئەوەیە کە دەروونی مرۆڤ لەکامڵبوونەوە بەناو بووندا ڕێبکات بەجۆرێك بۆ ئەو کارەی پێویستی بە مادە نەبێت) [٤١٩].

بەڵام جیاوازیەکە بەردەوام لەنێوان هەردوو فەیلەسوفەکەدا دەمێنێتەوە لەمەسەلەی فەیزدا کە بەناوەڕۆك و گەوهەری فەلسەفەی فارابی دەزانرێت و غەزالی لێی ڕازی نەبووە و وویستوویەتی ڕەخنەی لێبگرێت و هێرشیبکاتە سەر، حاڵی ئەم جیاوازیە هەرچۆنێك بێت بەڵام پەیوەندی نێوان غەزالی فارابی لەم مەسەلەیەدا بەپتەوی دەمێنێتەوە، وە لەوانەیە گونجانی بەرابەرکردنێکی زانستی لەنێوان ئەو صۆفیگەریەی کە فەیلەسوفەکان پێناسەیانکردووە لەگەڵ صۆفیگەری صۆفیەکاندا کردارێکی گرنگ و جیدی بێت، چوونکە یەکبوونی ئەو بیرکردنەوەیە ئاشکرا دەکات کە لەناخی فەیلەسوفدایە، کە هەمان ئەو شتەیە غەزالی هەوڵیداوە لەفەلسەفە زانستی و کرداریەکەیدا بەو جۆرە بێت، کاتێك تێڕوانین و تەسەووفی بەیەکەوە کۆکردەوە لەیەکەیەکدا کە نەرێی هەموو ململانێکان دەکات، لەوانەیە ئەم یەکبوونە جۆراوجۆرەیە کە وایلە صۆفیەکی وەك ئیبن سەبعین کردبێت کە غەزالی بە چەندین سیفەتی ناشیرین ناوزەد بکات چوونکە لە ئاسایی و نەریت دەرچووە، ئاسایش بەلای ئیبن سەبعینەوە ئەوەیە کە هەمووشتێك بیت، ئیبن سەبعین دەڵێت: (غەزالی

---

[٤١٨] فی الفلسفة الاسلامیة منهجه وتطبیقه لا ٤١.

[٤١٩] اهل المدینة الفاضلة لا ٤٧

زمانێکی بێ دەربڕینە دەنگێکی بێ قسەیە، تێکەڵکردنێکی دژەکان و سەرسامی جەرگبڕینەکانە و جارێك صۆفیە و جارێکیش فەیلەسوفە جاری سێیەمیش ئەشعەریە و جاری چوارەمیش فەقیهە و جاری پێنجەمیش سەرگەردانکەرە و مرۆڤ تووشی سەرگەردانی دەکات... ئەوەی کە غەزالی وویستویەتی ڕاست نیە چوونکە ئەو وویستوویەتی ناوی عەقڵ و دەروون لەتەسەووفەوە بنێت بە زانستی پێشینان و زاراوەکانیان، کە نەلەصۆفیگەری ڕزگاربووە و نەپێیشی دەگوترێت فەیلەسوف)[٤٢٠].

بەڵام ئەم پیاهەڵدانە بە ژیرانە دەرناکەوێت لەتێگەشتن لەفەلسەفەی غەزالی و صۆفیگەریەکەی، بەڵکو هەڵوێستێکی بەپەلەیە و دەچێتە چوارچێوەی ئەو ململانێ و دژایەتیەوە کە لەنێوان فەیلەسوف و صۆفیەکاندا و لەنێوان فەقیهو صۆفیەکان و فەیلەسوف و موتەکەلیمەکاندا هەیە، ئەوەی لەم بۆنەیەدا بەلای ئێمەوە گرنگە بریتیە لە هەڵسەنگاندنی ئاراستەی فیکریی غەزالی لەبارەی مانای بەختەوەریەوە چوونکە ئامانجی فەلسەفەکەیەتی.

## ٣ – هەڵسەنگاندن و دەرئەنجام:

فەلسەفاندنی غەزالی بەپێی ئەوەی کە ڕابورد لەسەر باسکردن و گەڕان وەستاوە لەبارەی سروشتی ئەو پەیوەندیەی کە لەنێوان عەقڵ و بووندا هەیە، واتە لەسەر سروشتی زانست، لەگەڵ ئەوەی کە(زانست ماناکەی بریتیە لە: نمونەیەکی گونجاو لەگەڵ زانراودا وەك شێوە و هەڵوەشاندنەوە کە نمونەی شتە) [٤٢١] ئەم ئاراستەیەی کە غەزالی بەڕوونی لەکتێبی مونقیزدا دەربڕیوە و دەڵێت: (تینویەتی بۆ زانینی

---

[٤٢٠] بد العارف ابن سبعين لا ١٤٤.

[٤٢١] معيار العلم لا ٣١٢.

حەقیقەتەکان نەریتی و تێڕوانینیە) وە هەروەها دەڵێت: (مەبەست زانیاریە لەبارەی حەقیقەتی مەسەلەکانەوە) [٤٢٢] هەرئەمەیە کە بانگهێشتی دەکات بۆ(داواکردنی حەقیقەتی زانست چیە) [٤٢٣] بەتایبەت کە لەنێو گروپ و مەزهەبەکاندا شتێك نیە کە بێزاریەکەی چاکبکاتەوە و تینویەتی بشکێنێت، چوونکە لەبارەی زانستی کەلامەوە گوتوویەتی کە(زانستێکی شیاو بە مەبەستەکەی ئەوو نەشیاو بە مەبەستەکەی من) چوونکە زانستێکە ئامانج لێی پاراستنی عەقیدەی ئەهلی سوننە کە ئامانجێکە زۆر مەبەستی غەزالی نیە.

لەبارەی زانستی فەلسەفەوە گوتوویەتی کە(ئاگاداری ئەو خەڵەتاندن و تێکەڵی و ئاڵۆزکردنە هەم بەجۆرێك هیچ گومان و دودڵیەکم تێیدا نیە) [٤٢٤] هەمان ئەو شتەی لەبارەی باتینیەکانیشەوە گوتووە، بەڵام کاتێك لایداوەتەوە بەلای صۆفیگەریدا لەوە تێگەشت کە(ئەوان پیاوانی حاڵەتەکانن نەك پیاوی قسەکان) وە لەوەش دڵنیابوویەوە کە(صۆفیەکانن کە بەتایبەت ڕێگەی خودایان گرتووە) [٤٢٥].

گەشتی مەعریفی و ڕەخنەیی غەزالی لەنێو گروپەکاندا لەکۆتاییدا بووەتە پێویستی باسکردن لەبارەی یاساو ناونیشانە گەلێك کە یەقینی پیێ دەزانرێت و زانستی پێ بنیات دەنێت، سەرقاڵی بە معیار العلم و محك نەزەر و قیستاسی موستەقیم و موستەصفا، هەر لەم سۆنگەیەوەیە [٤٢٦] لەگەڵ ئەوەی ئەم کتێبانە دانراون بۆ ئەوەی ببنە بنەمای زانست ئیتر زانستەکە بەڵگەیی بێت یان فیقهی لەوە

---

[٤٢٢] المنقذ من الضلال لا ٨١ – ٨٢.

[٤٢٣] المنقذ من الضلال لا ٨٢.

[٤٢٤] المنقذ من الضلال لا ٩٥.

[٤٢٥] المنقذ من الضلال لا ١٣٣ – ١٣٩.

[٤٢٦] ئەم کتێبانەم بەپێی ڕێکخستنی مێژوویی دانەناوە.

تێگەشت کە کارەی تەنها بە گەڕان بەدوای پێوەرێکی تردا دەکرێت کە لایەنی کرداری بەلاوە گرنگ بێت، ئەویش میزان العملە.

ئەم گرنگیدان و دانراوانەی کە پێیاندەگوترێت ناوەڕۆکی معیار وامان لێدەکەن کە وەك فەیلەسوفێك سەیری غەزالی بکەین کە لەناخی بەهادایە بەتایبەت بەهای حەق و چاکە کاری، هەروەك چۆن ناوی کتێبە ناوبراوەکان مانای ئەمە دەگەیەنن، ئەمەش مانای ئەوەنیە کە غەزالی باوەڕی بەبوونی دوو بەها هەبووە کە فەرمانڕەوایی بەسەر تەسەوورو هەڵوێستەکانماندا لەبارەی بوون و مرۆڤەوە هەیە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە غەزالی لەکۆتاییدا هەوڵی دۆزینەوەی یەك بەهاو جوڵێنەر دەدات کە بریتیە لە کامڵبوون، مەبەستم کامڵبوونی دەروونە، هەروەك چۆن دەشکرێت کەببێتە بەهای دادپەروەری، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەم ناوانە لەڕاستی و حەقیقەتیاندا و بەپێی بۆچوونی ئیمامی غەزالی لەسەر قوڵی یەك بەهان، بەختەوەری بەمانای کامڵبوونی تایبەت بەدەروونە واتە کاتێك دەروون دادپەروەری و کامڵبوونەکەی دەهێنێتەدی واتە بەختەوەریەکەی، ئەم وەدیهاتنەش پێویستی بە ناسینی چۆنیەتی هەیە و ئەم چۆنیەتیەش دەمانبات بەرەو مانای زانست کە بەهایەکی ترە، بەلاّم سەربەخۆ نیە، چوونکە بەبەهای یەکەم ئاراستە کراوە کە بریتیە لە دادپەروەری / بەختەوەری / کامڵبوون.

بەهای زانست لەناسینی حەق و ڕاستیدا واتە دامەزراندنی چاکەی حیکمەت و دانایی کە پێوەری خۆی هەیە، بەلاّم ئەم پێوەرە چەند مەرجێکی تری هەیە کە لەخودی خۆی بەدەرن، بەلاّم لەهەمانکاتدا مەرجن بۆ وەدیهاتنی، چوونکە پێوەر بریتیە لە کۆمەڵێك مەرج و پێوەری ناوخۆیی تایبەت بەبنیاتنانی زانست لەخودی خۆیدا واتە غەزالی باوەڕی بەوە هەیە کە زانست ناکرێت لە واقیعە زیندووەکەی

دایبڕنێت، واتە واقیعە مرۆییەکەی بەهەموو ئالۆزیە کانیەوە، هەربۆیە زۆر ئاگاداری ژینگە کۆمەلأیەتی و سیاسی و کاتیەکەی بووە، ئەم دابەزینەش کە نیشانەکانی لەنێو معیار العلم دا هەن چۆنیەتیەکەی لە میزان العمل دا دەبینین، زانست کاری عەقڵە واتە چالاکی و کارابیەکی مرۆییە، هەروەها بریتیە لە بەهایەکی ڕاوەستاو لەسەر پێوەری یەقینو دڵنیایی/ حەقو ڕاستی.

کاری عەقڵیش هێندە بەرز نیە لەکەسێکی ووشیار چوونکە پێچراوە بەکارێکی بەهێزترەوە کە بەهاکەی لەم کەمتر نیە ئەویش کاری هێزی توڕەیی و هەواو ئارەزووە، چوونکە(بیرۆکەکە لەنێوان ئارەزوو عەقڵدایە) وە هەروەها(توڕەیش خێوی عەقڵە)، کەواتە بەهای عەقڵ بارمتەی بەهاکانی ترە، وەك بەهای ئازایەتی کە کامڵبوونێکە لەهێزی توڕەییدا ڕوودەدات، بەهای پاکداوێنی کە کامڵبوونێکە لە هێزی ئارەزوودا ڕوودەدات، وەدیهاتن و ڕوودانی ئەم کامڵبوونەش بە موجاهەدە و تێکۆشاندەبێت لەدژی دەروون کە ڕیازەت و خۆڕاهێنانێکی دەروونی کرداریە کە خود پێی هەڵدەستێت، بەمشێوەیە هەموو بەهاکان لەکرداری دامەزراندنیاندا دەگەڕێنەوە بۆ کردارو هەڵسووکەوتی تاکەکەسی و کۆمەلأیەتی، موجاهەدە هەرچەندە زامنی ئەم چاکەکاریانەیە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێتە گرنتی هەمیشەیی بۆ بەهای حەق، چوونکە حەقێکە کە تەنها بەهۆی کردەوەی عەقڵەوە وەدینەهاتووە بەڵکو لەکاری عەقڵی ملکەچەوە هاتووە بۆ کرداری موجاهەدە بۆ ئەوەی فیکرە لە عەقڵدا جێگیر بێت، هەروەك چۆن لەسەرەتاوە بەو جۆرە بووە.

ئەم قسەیەش سودی ئەوەمان پێ دەگەیەنێت کە بەهای ئەو یەقینە بناسین کە غەزالی داوایدەکات، ئەمەش یەقین و دڵنیاییەکە کە ڕوودانی هەڵەو وەهمی تێدا نیە

بەبێ پشت بەستن بەهیچ گرنتیەك [٤٢٧]. چوونکە بە پاککردنەوە و پاڵفتەکردن لەڕێگەی موجاهەدەوە دەستیپێکردووە، ئەقلیش بێگەردی و ناوەڕۆکی و گەوهەریەکەی زانی و بوویە ڕووناکیەکی بێگەردی دوور لەتاریکی کە ئاگاداری جیهانی لاسوت و لاهوتیش بوو، ئاگاداریەك کە وا لەخاوەنەکەی دەکات کە بیخاتە جیهانی عەقڵی پاك و بێگەردەوە، واتە عەقڵی غەریزی کە عەقڵێکە لە نووری ئیلاهی پێکهاتووە و لەگەڵ کەشف و دۆزینەوە و ئیلهامدا ژیاوە، چوونکە لە دەرگای عیرفانی داوە، لەپاش ئەوەی کە لەسەر زەوی پاڵکەوتووە و لاربووەتەوە بۆلای.

میزان العمل ئەو مەرجە کرداریانە ئامادە دەکات کە قسەی کرداری دەکاتە گونجاو، دواتر معیار العلم بنیاتنانی خودی زانست لەئەستۆ دەگرێت، لێرەوە بەکارهێنانی هێزی عەقڵی چاکەکاریەکی ئەولاترە کە دەتوانێت هێزی توڕەیی و ئارەزوو کامڵ بکات، ئەمەش کردارێکی جەدەلیە لەبەرزبوونەوە ناوەستێت، چوونکە کامڵبوونی خودایی کە هیچ شتێك ناتوانێت باسی کاریگەری شتەکان لەسەری و کاریگەر بوونی ئەم لەسەر شتەکانی تری وەك کار کاردانەوە موجاهەدە و تێکۆشان کەشف و دۆزینەوە بکات.

بەهای گشتی واتە بەهای کامڵبوون یان دادپەروەری یان بەختەوەری کە تێڕوانینمان بۆ جیهان و شتەکان تەرجەمە دەکاتەوە و وەریاندەگێڕێت، وە هەر ئەوە کە چۆنیەتی هەڵسووکەوتمان لەبەرامبەریەوە دیاریدەکات، ئەخلاقمان

---

[٤٢٧] هەروەك ئەوەی کە دیکارت کردی کاتێك یەقینی کردە ئەو چەمکەی کە لەسەر گرنتی خودایی وەستاوە، بەڵام ڕەخنەی شیکاری دەرووونی ئەوەی سەلماند کاتێك عەقڵ بیر دەکاتەوە ئەوە خۆی نیە کە بیر دەکاتەوە، وە هەروەها دەبێت بەناخیدا بچینە خوارەوە بۆ ئەوەی پێکهاتە لاشعوری و نەستیەکانی ئاشکرابکەین و بیاندۆزینەوە، چوونکە ئەوانەن لەبری عەقڵ بیر دەکەنەوە.

دروستدەكات واتە پەیوەندیەكانمان ڕێكدەخات، لەم ئاستەشدایە كە دەگەینە ئاستی پەروەردە و فێركردن، كە ئاستێكە توانای ئافراندنی نمونە ئەخلاقیەكان/ هەڵسووكەوتیەكانی هەیە و لەوێشەوە بەرەو نمونەی باڵا هەنگاو دەنێت كە بەكاملْبوون یان بەدەستهێنانی بەختەوەری ناوزەدمانكردووە، وەهەروەها وەك جەختكردنەوەیەك لەسەر دیاردەی گۆڕان كە نەریتی تایبەتی هەڵسووكەوتی مرۆڤایەتیە ئەگەر خۆی گەوهەرو ناوەڕۆكی بوونەكەی نەبێت، بەڵام گۆڕانكاریەكە ڕوودەكاتە ئامانجێك كە لەناخیدا ئەو بەهایانەی پێیە كە ئەیەوێت بیانهێنێتەدی ئەم ئامانجەش برتیە لە بەختەوەری كە خۆی بۆخۆی داواكراوو خوازراوە.

ئەم قسەیە مانای ئەوەنیە كە غەزالی لەشوێنكەوتوانی فیكرەی ناچار كردن و ئیلزامە لە ئەخلاقدا، واتە لە پشتیوانانی تیۆرەكانی ناچاركردن و ئیلزام بێت(دیونتولوجیا) تیۆری واجب و پێویست [٤٢٨] كە ئەخلاق دەكاتە كۆمەڵێك لە فەرمان و ڕێگری، ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە غەزالی لەلایەكی ترەوە و وەك گونجانێك لەگەڵ واقیعیەت و پەیوەندی لەگەڵ هۆكارە مادیەكانی دەوروبەری ئەخلاقی باو دەگێڕێتەوە بۆ بنەما كۆمەڵایەتی و هۆكارە دەروونی و ڕۆشنبیریەكانی و تەنانەت بایۆلۆجیەكانیشی، بەمشێوەیە شیكاریەك بۆ كێشەی هەڵسووكەوت دەخاتە ڕوو هۆكارو پاڵنەرەكانی ئاشكرا دەكات و دیاردەكانی دەردەخات و ئاگاداری پاشخانە شاراوە و ناخیەكانی هەیە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە واقیعی مادی دەسەڵاتی بەسەر هەڵسووكەوتدا هەیە و دەرچوون لێی زۆر قورسە، چوونكە دەسەڵاتی نەریتە، بەڵام ڕۆڵی شەیخ و مامۆستا لە گۆڕینی هەڵسووكەوتدا وەك ڕۆڵی پزیشك وایە لەچارەسەر كردنی جەستە كاندا، چوونكە شەیخ چارەسەرێكی قوتابی و

---

[٤٢٨] نظرية القيم فی الفكر المعاصر د صلاح قانصوة لا ٤٥.

موریدەکەی دەکات کە شیاو بێت لەگەڵ پلە و پایەیدا، بەپاککردنەوە دەستپێدەکات و بەبەدەستهێنانی هەڵسوکەوتێکی نوێ کۆتایی دێت، کە دواتر دەبێتە هەڵسوکەوتێکی تەبعی و سروشتی، لەپاش ئەوەی کە پێشتر بەزۆر لەخۆکردن وەدیهاتبوو. لەم بەشەشدا غەزالی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی بۆ هەڵسوکەوت کردووە و کرداری شێوازی شیکاری دەروونی پەیڕەو کردووە، لەوانەیە صۆفیگەریش بە ئامێرگەلێکی ووردی کارکردن پشتیوانی و هاوکاری کردبێت لەتێگەشتن لە هەڵسوکەوت و گۆڕینیدا.

فەلسەفەی کردار بریتیە لە فەلسەفەی دەروونی مرۆیی کە هاوکاریماندەکات لە دۆزینەوەی هەرحەقیقەت و ڕاستیەك کە هەیە و چارەسەرکردنیشی بەپێی توانا، ئەمەش فەلسەفەیەکە لە ئەخلاقدا کە دروستکەری نمونەکانە بەپێی پێوەرەکانی زانست و کێشانەکانی کردار بەپشتبەستن بە گەوهەری عەقڵ کە غەزالی ئیجتیهاد و تێکۆشانی کردووە لە زانینی و کۆنترۆڵکردنی هەموو شورەکانیدا بۆ ئەوەی لە خراپە بیپارێزێت، چوونکە ئارەزوو توڕەیی هەست و ئیدراك و تێڕوانینی عەقڵ تێکدەدەن، ئەم شورانەش پشتبەستوون بە ڕاسپاردەکانی شەرع، چوونکە فەلسەفەی کرداری لەناخیدا خوازیاری ئامادەباشی شەرعە، نمونەکەی سەبارەت بەعەقڵ وەك خۆر وایە سەبارەت بە چاو، ئەمەش مانای بەرتەسککردنەوەی بواری عەقڵ نیە، بەڵکو بەکارهێنانی هەندێك لە دەرئەنجامەکانیەتی، چوونکە ڕاستیەتی شەرع لە عەقڵەوە زانراوە.

ئەوەی کە لە هێزی ئامادەباشی و کارایی شەرع زیاد دەکات لەکرداردا ئەو شتەیە کە مەعریفەو گوێڕایەڵی خودایی کردووەتە واجب، چوونکە عەقڵ شتێك لەم بابەتە واجب ناکات. لەم باسەدایە کە غەزالی موناقەشە لەگەڵ موعتەزیلەدا دەکات

کە پێیانوایە ناسینی خودا و گوێڕایەڵیکردنی واجبە لەڕووی عەقڵەوە، ئەم بانگەشەیەش دژە لەگەڵ غەزالیدا کە دەڵێت: (ناسینی خودای گەورەو گوێڕایەڵیکردنی واجبە بەوەی کە خودا پێویستیکردووە لەسەر مرۆڤەکان، نەك عەقڵ واجبی کردبێت لەسەر خەڵکی بەپێچەوانەی موعتەزیلەوە) [٤٢٩] چوونکە چۆن دەکرێت کە عەقڵ مانای گوێڕایەڵی خودا بزانێت ئەگەر بەپێوانەکردنی گوێڕایەڵی بوونەوەر بۆ بوونەوەر نەبێت، ئەمەش مەحاڵە چوونکە هیچ شتێك وەك خودا نیە و قیاسکردنی لەگەڵ شتەکانی تردا مەحاڵە، ئەوە شەرعە کە خەڵکی فێری چۆنیەتی واجبی پەرستش و گوێڕایەڵی خودا دەکات، ئەو عەقڵەی کە ڕاستیەتی شەرعی زانیوە و لەخوداوەیە کە گوێڕایەڵی واجب کردووە، چوونکە لەمەدا گوێڕایەڵی خودی خۆی دەکات، بەڵکو غەزالی لەمە دوورتر دەڕوات، ئەگەر فەلسەفەی کردار لەلای ئیمامی غەزالی بریتی بێت لە فەلسەفەی بەها کە بەرەو بەختەوەری خودایی ئاراستە کراوە ئەوا بنەمای فەلسەفی کە لێیەوە دەرچووە دان بەوەدا دەنێت کە بوون(الوجود) پێویست و زەروری نیە لە خودی خۆیدا، بەڵکو دەبوو جیهان نەبوایە یان بەشێوەیەکی تر هەبوایە یان لەسەر شێوەیەکی تر هەبوایە، یان هەبوایە بەبێ ئەوەی کە مرۆڤ ئەرکی لەسەر بوایە یان فەرمانی پێبکرایە کە گوێڕایەڵی بکات. لە ئەرکەکانیشدا لەوانیە ئەرکێکی بخاتە سەرشان کە توانای هەڵگرتنی نەبێت، خودا بۆی هەیە کە ئازار و سزای خەڵکی بدات بەبێ تاوانێکی پێشوەختە و پاداشتێك لەدوا ڕۆژدا، خودا بۆی هەیە هەرچیەکی بوێت بەبەندەکانی بیکات و ناچارنیە کە ڕەچاوی باشترین بکات بۆیان [٤٣٠].

---

[٤٢٩] الاحیا ب ١ لا ١١٣. الاقتصاد فی الاعتقاد لا ٩٧.

[٤٣٠] الاحیا ب ١ لا ١١٢ – الاقتصاد فی الاعتقاد لا ٩٠ – ٩١.

**ئەم بنەمایانەی کە غەزالی دایاندەنێت فیکرەی غائیەکان لادەبات لە بوونەوەردا، چوونکە لێرەدا شتێك نیە کە بهێنرێتە بوون، چوونکە بوون و هەموو شێوەکانی تەنها لە چوارچێوەی گونجاندان خوداش بەهێزو ئیرادەی خۆی لەکۆتاییدا مەسەلەکەدا دەگەڕێتەوە بۆی ئیتر مەسەلەی بەدیهێنان بێت یان بەدینەهێنان(الإیجاد او الإعدام) [٤٣١] وە هەروەها پێویست بوو لەگەڵ بەدیهێنان و**

[٤٣١] ئەگەر عەقڵ لەنێو بووندا بەشوێن ئامانج و مەبەستی بووندا بگەڕایە هیچی نەدەدۆزیەوە و دەیبینی کە بوون لەخودی خۆیدا مەحکومە بەڕێککەوت( الصدفە) و بوونەوەرەکانی ناویشی بەبێ ئامانج وەدیهاتوون، چوونکە لە بوونەوەردا شتێك نیە کە بەڵگە بێت لەسەر بوونی ئەم بوونەوەرە و شتەکانی تر.
ئەمڕۆکە زانستی بایەلۆجی بەتایبەت لەپاش شۆڕشی داروینی دان بەم مانایەدا دەنێت و تاوەکو دوور ترین سنورەکانیش لەگەڵیدا چووە، فرانسوا جاکوب کە زانایەکی بایەلۆجی فەرەنسی هاوچەرخە دەڵێت: ( دانانی ئەو شتە کە دێتە پێشەوە وئاسمانەکان و شتەکان ملکەچن بۆی لەشوێنی پێویستبوونی جیهانێکی زیندودا هەروەك هەیە و ناکرێت کە بوونەوەران بەپێچەوانەی ئەمەوە بوونایە ئەوکات بەمجۆرەی ئێستەنەدەبوون.
لەوانەیە لە وەچەخستنەوەدا چەندین گۆڕانکاری بهاتنایاتە ئاراوە و بەیەکیشەوە بگونجانایە ئیتر سەبارەت بەو شتانە بێت کە لەبووندا پێشی کەوتبن بگونجێت وەك دیمەنێك لە دیمەنەکانی پێشکەوتن یان داڕووخان لەو شێوازەی کە سروشت بەکاری دەهێنێت بۆ داهێنانی دیاردە گەلێکی نوێ هیچ نیەت و مەبەست و فیکرەو بیرۆکەیەکی پێشکەوتن و داڕوخان و خێر شەڕ و باش ناباش نیە جۆراو جۆر بوون بە هەڵکەوت دەبێت واتە لە نادیاری پەیوەندی هۆکار بە دەرئەنجامەوە دروستدەبێت، ئیتر پەیوەندیەکە هەرجۆرێك بێت، بوونەوەری زیندوو ڕووبەڕوی بارودۆخەکان نابێتەوە مەگەر لەپاش دەرکەوتنی تاپیکردنەوەش بە کاندیدەکان ناکات بۆ زاوزێ مەگەر کاتێك کە بێنە جیهانی زیندەوەرانەوە.
ئەم مانایەی کە ئەمڕۆکە بووەتە باو بەتایبەت لە زانستە بایەلۆجیەکاندا مانای ئەوەیە کە عەقڵ ناتوانێت هیچ ئامانجێك پێکبهێنێت لە بووندا، بەڵکو تەسەووری بوونی و نادیاری دەکات بەبێ تەسەوورکردنی هیچ پێویستی و زەرورەتێك. ئەگەر شەرع بخەینە سەر ئەم عەقڵە ئەوکات دەیزانی کە ئامانج لەسروشتدا نیە و ناشکرێت بەتایبەت لەڕێگەی سروشت و بایەلۆجیەوە بزانرێت ئەمەش مانای ئەوەیە کە عەقڵ ناتوانێت هیچ ئامانجێك لەبووندا بدۆزێتەوە و ئاشکرای بکات بەڵکو تەسەووری هەبوون و نادیاریەکەی دەکات بەبێ تەسەوور کردنی هیچ پێویستیەکی تر.
ئەگەر شەرع بخەینە سەر ئەم عەقڵە ئەوکات دەیزانی کە ئامانج لەسەر سروشت نەوەستاوە و لەڕێگەی سروشتیشەوە ناناسرێت بەڵکو سەرچاوەکەی پێغەمبەرایەتیە، ئامانج لە ئافراندنی بوونەوەر پەرستشە بە مانا

بووندا ڕێگەی ڕێنمایش هەبوایە، بۆئەوەی دروستکراوەکان بیانزانیایە کە ئەرك و لێپرسراویەتیان لەسەرشانە و گەوهەرو ناوەڕۆکی ئەرکەکەشیان لەسەر گوێڕایەڵی وەستاوە و گوێڕایەڵیش تەنها بەو چۆنیەتیە دەبێت کە خودا ئەیەوێت، جوانیش هەرئەوەیە کە خودا دیاریکردووە، ناشیرینیش هەربەو شێوەیە، نەك ئەوەی کە مرۆڤ بەجوانی زانیوە. چوونکە هەڵوێستەکانی مرۆڤ لەبارەی جوانی و ناشیرینی و ئەخلاق و ڕەوشتەکانی ترەوە جیاوازن و ملکەچن بۆ پێکهاتەی کۆمەلأیەتی و سیاسی و ئابوری، واتە ملکەچن بۆ مەسەلەی ژیان و گوزەران و نەریتیان، ئەخلاق بەپێی شوێن و کات دەگۆڕێت، بەم ئەخلاقەش پەرستش ناکرێت، چوونکە پەرستش تەنها پەیوەندیکردن نیە بەخوداوە بەڵکو بەزۆری پەیوەندیە بەخەڵکانی ترو جیهانەوە بە جۆرێك کە مەبەست لەم پەیوەندیە تەنها لەبەر خودا بێت، هەرشتێکیش لەبەر خودا بێت ئەوە گوێڕایەڵی ئەوە ئەگەرچی ئارەزووبازی ڕێگە پێدراویش بێت، هەستکردن بەم شتە لاوەکی و ناسەرەکیانە لەژیاندا شتێکی گونجاو نیە مەگەر لەڕێگەی شەرعی بەستراو بە عەقڵەوە نەبێت یان بەعەقڵی تەمبێکراو بەشەرع، (بەگشتی عەقڵ ناچێتە ناو ووردەکاری شتە شەرعیەکانەوە، شەرعیش هەندێکجار بە هۆی بڕیارێکەوە دێت کە عەقڵی لەسەر جێگیر بووە و جارێکیش بەئاگادار کردنەوەی بێئاگاکان و دەرخستنی بەڵگە بۆ ئەوەی ئاگاداری

---

ئاینیە فراوانەکەی، پەرستشیش مەسەلەیەکی ئاینی نیە کە بە عەقڵ بتوانرێت بزانرێت، چوونکە ئەگەر شەرع نەبوایە مرۆڤ ئەم ئامانجەی نەدەزانی و تەنانەت وەك ئەرکیش واجب نەدەکرا لەسەری، بەڵام لەلایەکی ترەوە عەقڵ کاتێك ئەم ئامانجەی شەرع دەزانێت ناتوانێت ڕەتیبکاتەوە، چوونکە لە عەقڵدا هۆکاری پێویست و بەیەس نیە بۆ ئەو ڕەتکردنەوەیە، پەرستش شتێکی گونجاوە لەنێو عەقڵدا و دەچێتە چوارچێوەی پێویستیەوە بەهۆی هاتنی شەرع و بوونی ئەرکەکانەوە( التكاليف) ئەمەش مانای عەقڵی تەمبێکراوە بەشەرع بەپێی بۆچوونی ئیمامی غەزالی.

ڕاستی و حەقیقەتی مەعریفە ببێتەوە و جارێکیش بە بیرخستنەوەی ئاقڵ بۆ ئەوەی هەرچییەکی لەبیرکردووە بەبیری بێتەوە، وە هەندێکجاریش بەفێرکاری دەبێت، ئەمەش لە حوکمە شەرعیەکان و باسکردنی دووروودرێژی زیندوبوونەوەدا دەبێت.

شەرع بریتیە لە سیستەمی بیروباوەڕە ڕاست و کارە ڕێکەکان کە بەڵگەن لەسەر بەرژەوەندیەکانی دوونیا و ڕۆژی دوایی، ئەوەی لێیان لابدات ئەوە لەڕێگەی ڕاست لایداوە، خودای گەورە ئاماژەی بە عەقڵ و شەرع کردووە بە هەردوو ووشەی(الفضل) چاکە و(الرحمة) میهرەبانی، هەروەك لەم ئایەتدا هاتووە(ولولا فضل الله ورحمته لاتبعتم الشيطان الا قليلا) واتە: ئەگەر چاکەی خودا و میهرەبانی ئەو نەبوایە هەمووتان شوێنی شەیتان دەکەوتن بێجگە کەمێکتان نەبێت. مەبەستیشی لە(کەمێکتان نەبێت) ئەوانەن کە پاك و بێگەردن و هەڵبژاردەن [٤٣٢].

کەواتە ئەم تێڕوانینە بۆ جیهان و مرۆڤ لەسەر گەوهەرو ناوەڕۆکێکی ڕۆحی وەستاوە کە عەقڵی تەواوە، بەم عەقڵەش سیاسەت و ڕێز و پیشەی گەشانەوە بەختەوەری دێتەدی، وە هەروەها دەبێتە هۆی دامەزراندنی ئەو شارستانیەتەی کە مرۆڤ بەچەندین پلە دەباتە سەرەوەی ریزی ووڵاخ و چوار پێکانەوە، هەروەك بلێی گەوهەرو ناوەڕۆکی شارستانیەت لەلای ئیمامی غەزالی بریتیە لە ئەخلاق، چوونکە هەموو کردارو فیکرەیەك کە بۆ ژیانی مرۆڤ گرنگ بێت مەحکومە بەو ئامانجانەی کە مرۆڤ دایناون لەگەڵ ئەو مانایانەی کە چاندوونی، کاتێك خودا بریتیە لە مانای بوون و ئامانجەکەی، ئەوکات هەموو کارو شێوازەکانی عەقلگری بەرەو خودا دەچن و ئامانجیان ئەوە، تەسەووف بەم مانایە بریتیە لەبەرەو خودا چوون، بەرەو خودا چوونیش مانای پچڕاندنی پەیوەندیەکان نیە بەمرۆڤ و جیهانەوە، بەڵکو دامەزراندنی

---

[٤٣٢] معارج القدس لا ٥٨ – ٥٩، ئایەتەکەش لە سورەتی النساء ٤ – ٨٣.

ئەم پەیوەندیانەیە بەشێوازێك كە خودا ئامادەیە تێیاندا، بەڵكو خودا دەبێتە مانای ڕاستەقینەیان(لێرەوەیە كە عاریفەكان لە گۆڕەپانی مەجازەوە بەرز دەبنەوە بۆ پلەی حەقیقەت و میعراج و بەرزبوونەوەكەیان كاملْدەكەن، بەچاوی سەر دەبینن بێجگە لەخودا هیچ شتێكی تر لە ژیاندا بوونی نیە و هەموو شتێك بێجگە لەو لەناوچووە و مرۆڤیش ڕۆژێك لەڕۆژان لەناو دەچێت، بەڵكو لەئەزەل و ئەبەدیشدا هەر لەناوچوو بووە، هەموو شتێكیش بێجگە لەو ئەگەر خودی لەڕووی خۆیەوە سەیر بكەیت نەبوونێكی ڕووتە و ئەگەریش لەڕووی ئەوەی كە بەدوای بەدیهێنەرەكەیدا دێت ئەوكات هەبوو تەنها خودای گەورەیە، هەموو شتێك دوو ڕووی هەیە ڕوویەك بەرەو خۆی و ڕوویەكیش بەرەو خوداكەی، ئەوكات مرۆڤ لەڕووی خۆیەوە نەبوونە و لەڕووی خوداشەوە هەبووەو هەیە [٤٣٣].

ئەم یەكبوونەی بوون(الوحده الوجودیه) كە غەزالی وەك حاڵێك لەحاڵەكانی بەرزبوونەوە باسیدەكات لەلای صۆفیەكان بەخێرایی دەگەڕێتەوە بۆ سەر عەقڵ و فام(قسەی عاشقان لەكاتی سەرخۆشیدا دەپێچرێتەوە و ناگێڕدرێتەوە، بەلام كاتێك سەرخۆشیەكەیان نەما و گەڕانەوە بۆ دەسەڵاتی عەقڵ كە تەرازووی خودایە لەسەر زەویەكەیدا ئەوكات تێدەگەن كە ئەمە حەقیقەتی یەكبوون نیە بەڵكو نیمچە یەكبوونێكە [٤٣٤].

ژیانی سەر زەوی لەسەر تەرازووی عەقڵ وەستاوە كە لەحەقیقەت و ڕاستیەكەیدا(شەرعێكە لەناوەوە) وە هەروەها ژیانی سەرزەوی بریتیە لە ژیانێكی ئەخلاقی كە لەسەر پاككردنەوە وەستاوە كە پێی دەگوترێت موجاهەدە وەك

---

[٤٣٣] مشكاة الانوار لا ١٣٨.

[٤٣٤] مشكاة الانوار لا ١٤٠.

هەوڵدانێك بۆ گەشتن بەكاملبوون، ئەگەر مرۆڤ لەرێگەی ئەم بەرزبوونەوەیەدا بەردەوامبێت، دەگاتە حاڵێكی تر كە لەدەروونی خۆیدا فەنا دەبێت(بەزمانی مەجاز پێی دەگوترێت یەكبوون و بەزمانی حەقیقەتیش یەكتاپەرستی، لەپشتی ئەم حەقیقەت و ڕاستیانەشەوە نهێنی گەلێك هەن كە ڕۆچوون تێیاندا درێژە دەكێشێت)[٤٣٥] لەبەر ئەوەی ژیان لە گەوهەرو ناوەڕۆكیدا شتێكی ئەخلاقیە بەپێی ئەم نمونەیەی كە غەزالی بانگەشەی بۆ دەكات، ئەوكات دەبێت بەپێی قسەی ئەو فەلسەفەی كردار تەنها زانستێكە لەبارەی دەروون و چۆنیەتی ژیان و گوزەرانی ماڵ و منداڵ و زانستی سیاسەتی خەڵكی وولآت و ناوچەكان و ڕێكخستنیانە. بناغەی پتەوو فەرمانڕەوا لەم زانستانەدا بریتیە لە زانستی دەروون، چوونكە هەركەسێك خۆی بناسێت لەجیهانیش تێدەگات واتە خوداكەشی دەناسێت چوونكە خودا حەقیقەت و ڕاستی ئەم جیهانەیە، هەروەك پێشتر باسمانكرد، وە هەروەها سیاسەتەكان بەرێزترین بنەمای زانست و پیشەكان بوون، چوونكە جیهان بەبێ ئەو ناوەستێت، بەرێزترینی ئەم چوار سیاسەتە لەپاش پێغەمبەرایەتیەوە گەیاندنی زانست و پاككردنەوەی دەروونی خەڵكی بووە[٤٣٦].

ئیمامی غەزالی بەم لۆژیكە زانستی دەروون و زانستی سیاسەت بۆ جیهانی مرۆڤ دادەمەزرێنێت و دەیخاتە پێش سیاسەتی والی و سوڵتانەكانەوە، چوونكە فەرمانڕەوایكردنی خەڵكی تایبەت و نەخوێنەوارو گشتی تەنها بەدەستی سوڵتان و دەسەلآتدارەكانە بەلآم ئەوەی كە یاسا بۆ ئەم دەسەلآتە دادەنێن و ئاراستەی دەكەن بریتین لەزاناكان كە میراتگری پێغەمبەرانن، كە شارەزای حەقیقەت و

---

[٤٣٥] مشكاة الانوار لا ١٤١.

[٤٣٦] میزان العمل لا ٨٨.

ڕاستەقینەی مرۆڤن، بەو مەرجەی زاناو کەسی سیاسی بەیەکەوە نەبن، پێویستی جیاکردنەوەی ئەم دوانە(زانا و سیاسی) لەیەکتری ناتوانین خۆمانی لێ لابدەین بۆ ئەوەی دادگەری بڵاو ببێتەوە و دەسەڵات مل بۆ شەرع کەچ بکات، چوونکە دەسەڵات شەرع نیە بەڵکو خزمەتکارو ئامێرێکی ئاشکرا کردنیەتی، چوونکە ئەگەر دەسەڵات بریتی بوایە لەشەرع ئەوکات دەسەڵاتدارەکان بەئارەزووی خۆیان فەرمانڕەواییان بەسەر خەڵکیەوە دەکرد.

حاڵی خەڵکیش ڕاست نابێتەوە مەگەر بە دەسەڵاتێك نەبێت کە شارەزای بە دیارو نایاری مرۆڤ بێت، ئەم شارەزاییەش ئەرکی زانا شارەزاکانە، بەبێ ئەوەی لەم ئەرکەیان تێپەڕبکەن و بەرەو دەسەڵات بچن. زانای شەرع و یاسادانەر نابێتە دەسەڵاتدار، بەڵکو پێویستی بەدەسەڵاتدارێك هەیە، دین و دەسەڵات گونجاون بەیەکەوە، بەڵام لەڕووی ئەرکەوە لەیەکتری جیاوازن و هەریەکەیان خزمەتی ئەویتر دەکات. ئەرکی ئاین بنیاتنانی بنچینە و بناغەیە و ئەرکی دەسەڵاتیش پاسەوانی کردنیەتی، هەرشتێکیش بناغەی باشی نەبێت بەدڵنیاییەوە دەڕووخێت و ئەوەشی کە پاسەوانی نەبێت لەناو دەچێت [٤٢٧]، چوونکە سروشتی مرۆڤ لەسەر کۆمەڵایەتی بوون وەستاوە و کۆمەڵگەش پێویستە لەنێوان تاکەکانیدا دادپەروەری پەیڕەو بکرێت بەهۆی یاسایەکی مامەڵە کردنەوە، ئەگەر یاسایەك نەبێت ئەوکات کێشە و

---

[٤٢٧] میزان العمل لا ٧٢.

غەزالی بانگەشەی جیاکردنەوەی دین دەسەڵات دەکات لەیەکتری بەتایبەت لە سیاسەتی بەڕێوە بردنی ژیانی مرۆڤدا، چوونکە هەریەکەیان جۆرێك لەسیاسەتیان هەیە و لەیەکتری جیاوازو سەربەخۆن، سیاسەتی ئاین گەشاوەترە چونکە بناغە دروستدەکات، زاناکانن کە تێکەڵیدەکەن، بەڵام ئەم تێکەڵی دەستێوەردانە دەبێت بگۆڕێت بەدەسەڵات بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتەکەی و بڵاو کردنەوەی دەسەڵاتەکەی، بەڵام بەپێی شەرع، ئەمەش جیاکردنەوەیان لەیەکتری لەڕووی پێوە لکان لەلایەك و پەیوەندیشە لەلایەکی ترەوە.

کوشتارو لەناوچوون لەنێو خەڵکیدا دروستدەبێت، فیقهیش بریتیە لەجێگەی باسکردن و خستنە ڕووی ئەم یاسایە [٤٣٨] دەسەڵاتیش بریتیە لە پەیڕەوکردنی ئەم یاسایە و جێبەجێکردنی، چوونکە هەرکەسێك شارەزایی و زانستی لەبارەی ناخەوە هەبێت ئەوا لەبارەی دیارو ڕواڵەتیشەوە شارەزایە، ئەمەش حاڵی زاناکانە و پێچەوانەکەی نەگونجاوە کە حاڵی دەسەڵاتدارەکانە(واتە دەسەڵاتدارەکان تەنها شارەزای دیارو ڕواڵەتی خەڵکین بەڵام زاناکان لەناخ و ڕرواڵەتی خەڵکیش ئاگادارن لەڕێگەی شەرعەوە).

بەپێی ئەم مانایە فەلسەفەی کردار لەلای ئیمامی غەزالی لەسەر دەروونزانی وەستاوە و ئامانجەکەشی دامەزراندنی زانستێکە لەبارەی مرۆڤەوە واتە زانست لەبارەی چۆنیەتی کارکردن، ئەمەش زانستێکە کە ناکرێت دابمەزرێت مەگەر بە زانستێکی تیۆری چاوکراوە بەرەو جیهانی ئاسمان نەبێت، مەرجی وەدیهاتنەکەشی تەنها بەسیاسەتی دەروون و جەستەکان دەبێت لەگەڵ ناسینی هۆکارەکانی و چۆنیەتی چارەسەر کردنیان بەشێوەیەکی کرداری کە وورده وورده مرۆڤ بەرەو کامڵبوونی مرۆیی گونجاو ببات، بەمشێوەیە دیدی غەزالی بۆ جیهان کە تێڕوانینی ناوبراوی بۆ بۆ مرۆڤ و سیاسەتەکەی دیاریدەکات هەرچەندە گەوهەرو ناوەڕۆکی تێڕوانینی بۆ جیهان صۆفیگەرایەکی مەحکومە بەعەقڵی کامڵ [٤٣٩]. گەوهەری تێڕوانینی بۆ مرۆڤ تێڕوانینێکی ئەخلاقی مەحکومە بە عەقڵ و شەرع ئەمەش نمونەی شارستانیەتی ئیسلامیە کە غەزالی ئەیەوێت بەپێی زانستی خۆی و ئەوەی

---

[٤٣٨] میزان العمل لا ١٠٦.

[٤٣٩] عەقڵی کامڵ: عەقڵی صۆفیگەرانەیە کە پلەی چێژو حاڵە کە بەرزترین پلەکانی عەقڵی تیۆری و عەقڵی کرداریە، ئەمەش دەکاتە ئەو عەقڵەی کە دەرئەنجامی زانستەکانیەتی بەڵکو هەموو زانستەکانیشیەتی، خودی خۆی بە گەشەی زانستەکانی بەرز دەبێتەوە بۆ ئاستە باڵاکان( احیاء بیان تفاوت الناس فی العقل ب ١ لا ٨٧ بەرەو دواوە.

کە هەست و ئیدراکی پێی گەشتووە بیهێنێتەدی، ئەگەر ئەخلاق بەمشێوەیە دامەزرا ئەوکات مرۆڤ لەکەسایەتی و پەیوەندیەکان و زانست و کردارەکانیدا ڕاست دەبێت و پێچەوانەکەشی مەحاڵە.

بەمشێوەیە مرۆڤ سەربەخۆیی بەدەستدەهێنێت و بەڕاستی و بەبێ مەجاز لەجیهانی حەیوانات بەرز دەبێتەوە، هەروەك چۆن ئەم نمونە شارستانیەی کە بەدەستەواژەی ئیسلامی ناونراوە و سودی لە دەریای زانستی زاناکان وەرگرتووە تەنها لەلای غەزالی نابینین بەڵکو ئەمە ئامانجی گەل و نەتەوە جیاوازەکان بووە کە بەشوێن دەریچەیەکدا گەڕاون بۆ ئەوەی لە خەم و خەفەتەکانیان ڕزگاریان ببێت و کێشەکانیان چارەسەر بکرێت، واتە بەشوێن نمونەیەکی شارستانی نوێدا دەگەڕێن چوونکە ئەمرۆکە نمونەی باو تووشی چەندین نەخۆشی بووە و خانەنشینکراوە و دانیشێنراوە، ئەوەتا ئێستەش بیرمەندەکان لێکۆڵینەوە و شیکاری سروشتی ئەم نەخۆشیانە دەکەن و بەشوێن شێوازەکانی چارەسەر کردنیاندا دەگەڕێن.

# بەشی دووەم

## شارستانیەت و ئەخلاق

ئەگەر شارستانیەت بریتی بێت لەو هۆکارەی کە مرۆڤ بەهۆیەوە لەپلەی حەیوانات و گیانەوەران بەرز دەبێتەوە بەپێی پێناسەی فرۆیدی [440] ئەوکات ڕێڕەوە هاوچەرخەکەی بووەتە هۆی کێشەگەلێکی توند چوونکە(پێشکەوتنمان لەشارستانیەتی مادیدا بووەتە هۆی توندی کێشە کۆمەلآیەتی و سیاسیەکان بەشێوەیەکی ڕووخێنەر. کێشە کۆمەلآیەتیە نوێکان دەمانباتە نێو ململانێیەکی چینایەتی کە پایەو کۆڵەکەی پەیوەندیە ئابوری و نەتەوایەتیەکان لەرزۆك دەکات) [441]. ئەم شارستانیەتەی کە مرۆڤی هاوچەرخی دروستکردووە جەستەی کردووەتە قەوارەیەکی زەبەلاح(بەجۆرێك زیادەڕەوی کردووە لە قەڵەویدا و ڕۆحی وەك خۆی ماوەتەوە و بەردەوام لە کەموکورتیدایە و ناتوانێت پڕی بکات و هێندە لاوازبووە کە ناتوانێت ئاراستەی بکات، ئەمەش دەربڕی ئەو بۆشاییە کە لەنێوانیاندا دروستبووە، وە هەروەها ڕاڤەی کێشە کۆمەلآیەتی و سیاسی و نێودەوڵەتیە مەترسیدارەکان

---

[440] کتێبی( قلق فی الحضارة) ن فرۆید.

[441] فلسفة الحضارة — البرت اشفیتشر.

دەکات کە کۆمەڵێك کێشەن و وەك پێناسەن بۆ ئەم بۆشایی و کێشانە بە هەوڵدان بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە. ئەمڕۆکە هەولگەلێکی گەورە دەروژێنرێت کە بەشێوەیەکی نارێك و هەوانتە دەڕوات، ئەوەی کە لێرەدا ئێمە پێویستمانە بریتیە لە ئازووقو گەلێکی نوێ بۆ ووزەیەکی شاراوە کە دەبێت ئەمجارە ئەخلاقی بێت...

کاتێك جەستە گەورەو زەبەلاح دەبێت پێویستی بە ڕۆحێکی زیاتر هەیە و میکانیکاش پێویستی بەصۆفیگەری هەیە... ئەم میکانیکایەش ڕووی ڕاستەقینەی بۆ ناگەڕێتەوە و خزمەتگوزاریگەلێك پێشکەش ناکات کە گونجاو بێت، مەگەر مرۆڤایەتی کە بەتەواوەتی لاربووەتەوە بەهۆی ئەمەوە ڕابپەڕێت و بەرەو ئاسمان بەرزبێتەوە [442]. کەواتە ئەم دەستکەوتە مادیانە(شارستانیەت نین و ناشبنە شارستانیەت مەگەر بەئەندازەی توانای عەقڵیەتی گەلە شارستانیە کان نەبێت کە بەئاراستەی کامڵبوونی تاکە کەسی و کۆمەڵگە ئاراستەی دەکەن، بەشوێن ئەمەشدا لەوکاتەی کە پێویستە توخمی ڕۆحی لەشارستانیەتدا بەهەموو هێزیەوە بوەستێت و هەبێت، ئەوکات ڕێگەی لەناوچوون و فەوتانیشی پێدەدەین) [443].

بارودۆخی ئەمڕۆی شارستانیەت بووەتە جێگەی ڕەخنەی فەیلەسوف و بیرمەندەکان بە هەموو ڕەوتەکانیانەوە، مارکیوز پێی وایە کە(پاشخانی تەکنۆلۆجیا پاشخانێکی سیاسیە بە حوکمی ئەوەی کە گۆڕانی سروشت دەبێتە هۆی گۆڕان لە مرۆڤدا، بەهۆی ئەوەی کە داهێنانەکانی مرۆڤ لە کۆمەڵەی کۆمەڵایەتیەوە دروستدەبێت و دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆی، دەتوانین بەردەوام بڵێین کە سروشتی

---

[442] برطسون – منبعا الاخلاق والدين الفصل السابع.

[443] فلسفة الحضارة لا ١١١.

ئامێری جیهانی تەکنۆلۆجی تەنها ئامانجە سیاسیەکان ناهێنێتەدی، بەڵکو دەتوانێت شۆڕشێك لەناو کۆمەڵگەدا دروستبکات یان ببێتە هۆی دواکەوتنی) [٤٤٤].

هەربۆیە پێگەی مرۆڤ لەم جیهانەدا لەژێر دەسەڵاتی دەزگاو پەیوەندیەکاندا بووەتە واقیع(جەستە نابێتە هێزێکی بەسود مەگەر جەستەیەکی بەرهەمهێن و بەبەردە کراو بێت لەیەك کاتدا) [٤٤٥] واتە ملکەچە بۆ ئەو دەسەڵاتەی کە ئامێرەکانی زاڵبوونی بەدەستەوەیە، میشال فۆکۆش پێی دەڵێت: تەکنۆلۆجیای سیاسەتی جەستە.

مرۆڤ لەجەستەدا کورتکراوەتەوە و جەستەش لە سودو قازانجدا کورتکراوەتەوە و سودیش تەنها بە بەردەکردن دێتەدی، چوونکە هۆکاری وەدیهاتنی سود بریتیە لە بەرهەمهێنان، ئەم ئاراستەیەش بەهۆی ئەو گۆڕانکاریەوەیە کە لەماناو چەمکی کرداردا وەدیهاتووە و لەئاستی ئابوری تێپەڕ ناکات، واتە دیمەنی بەرهەمهێنان و ئامێرەکەیەتی، لەبارەی پەیوەندیشی بەمرۆڤەوە بووەتە ئامێرێکی بەدیهێنانی مرۆڤبوونی مرۆڤ و جەختکردنەوە لەخودی خۆی، واتە مرۆڤ ئەوە ڕووندەکاتەوە کە دەبێت بەکێ ئەمەش بەڕوونکردنەوەی ئەوەی کە توانای هەیە بەسەریدا، باسکردنی ئەوەشی کە توانای بەسەریدا بوونی هەیە بەشتێکی سنوردار [٤٤٦]. ئەم مانا تەسکەی کە بۆ چەمکی مرۆڤ کراوە و ئاراستە مارکسیەکانی لەسەر ئامادەکراوە و بەرگری لەم مانایە دەکەن و دژن لەگەڵ دژەکانیدا ئەمەیە کە کارایی ڕاستەقینەیی مرۆڤی نەهێشتووە کە مرۆڤێکی بەتوانای بەوویست و ئازاد و لێپرسراوە و کردوویەتیە ئامێرێکی ملکەچ بۆ یاسای سروشت لەلایەك و یاسای کۆمەڵایەتی و

---

[٤٤٤] هاربارت مارکیوز( الانسان ذو البعد الواحد).

[٤٤٥] میشال فوکو( المراقبە والعقاب) لا ٣٠.

[٤٤٦] بور ریکور – الحقیقە والتأریخ لا ٢٢٤.

سیاسی لەلایەکی ترەوە، بەڵکو هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەجیهاندا ڕوودەدەن بەشێوەیەکی سەربەخۆو جیاواز لە ئیرادەی مرۆڤەوە ڕوودەدەن، مارکس دەڵێت: (مرۆڤەکان لەبەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیدا لەبەر بوونیان دەچنە ناو پەیوەندیگەلێکی سنورداری پێویستی سەربەخۆ لەئیرادەی خۆیان کە بریتین لە و پەیوەندیە بەرهەمهێنیانەی کە لەگەڵ پلەی پێشکەوتنی تایبەت کە هێزە بەرهەمهێنەرە مادیەکانی لای ئەوان پێی گەشتوون)[٤٤٧].

کەواتە مرۆڤ بەرهەمی واقیعی ئابوریە، لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بەبەهاکانەوە هەیە، ئیتر ئەوانەی کە پەیوەستن بەبەهای حەق یان خێر یان جوانی یان شتەکانی ترەوە، لەڕاستی و حەقیقەتیاندا دەگەڕێنەوە بۆ ئەم واقیعە، کە دەتوانین لە ووشەی ماڵ و ساماندا کورتی بکەینەوە کە مارکس و ئەوانەی دوای ئەویش کردوویانەتە کۆمەڵگەی مادی لە شێوازی نوێیدا کە بەرابەرە لەگەڵ ووشەی مرۆڤدا، مارکس دەڵێت: (من لەخودی خۆمدا بەهیچ شێوەیەك سنوردارنیم، نابم و ناشبمە ئەوەی کە دەتوانم، لەوانەیە کەسێکی دەموچاو ناشیرین بم بەڵام دەتوانم لە ژیانمدا جوانترین ژن بکرم کەواتە من دەموچاو ناشیرین نیم... لەوانەیە من پیاوێکی شەل بم بەڵام بەپارە دەتوانم بیست و چوار پیاوم هەبێت و بەدەورمدا بن و کاروبارەکانم بۆ ڕاپەڕێنن کەواتە من پیاوێکی شەل نیم... لەوانەیە من کەسێکی پەست و بێویژدان و بێ کەسایەتی بم، بەڵام بەهۆی ماڵ سامانەوە دەبمە کەسێکی زۆر بەڕێز، ماڵ و سامان ئەو پەڕی خێرو چاکەیە کەواتە خاوەن ماڵ و سامانیش پیاوێکی چاکە، وە هەروەها پارەو سامان ڕزگارم دەکات لە خراپەی پیاوانی پەست، کەواتە خەڵکی وادەزانن من کەسێکی پاك و بێگەردم،

---

[٤٤٧] کارل مارکس – نقد الاقتصاد السیاسی.

لەوانەیە کەسێکی بێ کەسایەتی بم بەڵام پارەو سامان بریتیە لە کەسایەتی ڕاستەقینە بۆ هەمووشتەکان، ئیتر چۆن دەکرێت خاوەنی ماڵ و سامان کەسێکی بێ کەسایەتی بێت؟ ! سەرەڕای ئەمەش پارەو سامان دەتوانێت خەڵکانێکی خاوەن کەسایەتی و خاوەن بیرو فیکر بکڕێت، ئایا کەسێك کە دەسەڵاتی بەسەر خاوەن کەسایەتی و فیکرەکاندا نیە لەم بوارەدا دوورترنیە لە خودی پیاوی فیکرەکە؟ کەواتە من بەپارەو سامان توانای وەدیهێنانی هەموو ئەو شتانەم هەیە کە دڵ بۆیان لێدەدات، ئایا ئێستە خاوەنی هەموو دەسەڵاتە مرۆییەکان نیم؟ ئایا پارەو سامانەکەم هەموو بێتواناییەکانمی نەکردووتە هێزو توانا؟) [٤٤٨].

پێناسەی مرۆڤ تەنها گۆیایی و قسەکردن نیە، بەڵکو بووەتە ماڵ و دارایی و هەموو بەهاکانی مرۆڤ لەکۆتاییدا دەگەڕێتەوە بۆ بەهاو نرخی ماڵ و دارایی. ئایا باسکردنی ئەم نمونانە لەفەلسەفەی خۆرئاوایی هاوچەرخدا بەڕوونی بەهاو پلەی مرۆڤ نیشاندەدات؟ هەرچەندە کە هۆشیاری بە نەرێنی بوونی ئەم بەهایانەش ئامادەباشی هەیە و قوڵی ئەم هۆشیاریەش وورده وورده جەختی لەسەر دەکرێتەوە، بەڵام ئەو هێزە پێویستەی نیە کە وایلێبکات زاڵبێت بەسەر مانای باودا، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە دواتر ناتوانێت بنیاتی تێڕوانینێکی بوونەوەری نوێی

---

[٤٤٨] مارکس دەستنوسەکان ١٨٤٤ – دەستنوسی سێیەم – ١١٩ – ١٢١.

غەزالی ناتوانێت قسەی لەسەر ئەم بڕگەیە هەبێت مەگەر بەم قسەیە نەبێت کە دەڵێت( ئەوەی کە هەواو ئارەزووەکانی بتۆرێنێت ئەوە بەڕاستی کەسێکی ئازادە و پاشای ڕاستەقینەیە، هەربۆیە هەندێك لەزاهیدەکان بە هەندێك پاشایان گوتووە: مولکەکەی من لە مولك و دەسەڵاتەکەی تۆ گەورەترە، پاشاکەش گوتوویەتی چۆن ؟ ئەوەی کە تۆ بویتە بەندەی عەبدی منە، مەبەستیی ئەوەبووە کە پاشا بەندەی هەواو ئارەزووەکانی بووە و ئارەزووەکانی زاڵبوون بەسەریدا و بووەتە بەندەیان و توانای تۆراندن و تێکشکاندنیانی نەماوە و بەسروشتی خۆی بووەتە بەندە و دیلی ئارەزوو لە ناڕەحەتی و بێزاریەکی بەردەوامدایە وئەگەر ڕۆژێك بەخۆشی بژی لەوانەیە چەرخی زەمانە وابگەڕێت کە چەندین ڕۆژ بکەوێتە ناو تاڵیەکانی ژیانەوە( میزان العمل لا ١٢).

پتە و دابمەزرێنێت(هەوڵەکانی فەلسەفەی تیۆری بۆ دۆزینەوەی بنەمایەك بۆ ئەخلاق لەناسینی سروشتی جیهاندا تووشی خنکان بووەتەوە و ئەوە بینراوە کە ئەو ئەخلاقەی لەسەر زانست و کۆمەڵگە دروستبووە ئەخلاقێکە کە هیچ پشت و پەناو هێزێکی نیە.... هەربۆیە ئەخلاق لەم سەردەمانەی دواییدا و لەسەدەی نۆزدەیەمدا لە بارۆدۆخێدا بووە کە ئیرەیی پیّ نەبراوە) [٤٤٩].

ئەو حاڵەتە بەرەلأییەی کە لە خۆرئاوادا بلأو بوویەوە هەموو مامەڵەکانی لەگەڵ فیکردا تووشی نائومێدیکرد و فیکرەش پلە و پایەیەکی شیاو بەخۆی بۆ نەمایەوە، چوونکە گۆڕدرابوو بەهێزی ماڵ و دارایی و تێڕوانینی ڕەشبینانە زاڵبوو هەموو نمونە بالأکان دیار نەمان(تێڕوانینی وورد لە تیۆری بوونەوەردا کە فیکر دایمەزراندبوو تاکە ڕێگەی گونجاو بوو بۆ دۆزینەوەی ئاراستەی ڕاست و دروست لەنێو ئە کێشکە و ململانێیانەدا کە ئەمڕۆ جیهانی تێکەوتووە) [٤٥٠] بەلأم بابزانین ئەم تیۆرە چی لێدێت؟ خاوەنی فەلسەفەی شارستانیەت وەلأمدەداتەوە و دەڵێت: (ئەو ئەخلاقەی کە فیکر ڕازیدەکات پێویستە لە تەسەووفەوە سەرچاوە بگرێت، هەموو فەلسەفەیەکی قوڵ و هەموو ئاینێکی قوڵ هەردووکیان لەکۆتاییەکەیاندا تێکۆشانێکە لەپێناو صۆفیگەری ئەخلاقی و ئەخلاقی صۆفیەتدا، ئێمەی خۆرئاوایی کە بە تێکۆشانێکی زۆر هەوڵی ئەوەماندا وە کە تیۆرێکی ئەخلاقی کارا لەجیهان و ژیاندا دابین بکەین ڕێگە نادەین کە تەسەووف بگاتە ئامانجەکانی. صۆفیگەری بەشێوەیەکی گۆشەگیرانە لەناوماندا دەژی و بەشێوەیەکی غەریزی هەستدەکەین کە دژایەتی هەیە لەگەڵ ئەخلاقی کارادا، هەربۆیە پەیوەندیەکی ناخیمان لەگەڵیدا

---

[٤٤٩] فلسفة الحضار – اشفيتسر لا ٣٠٧.

[٤٥٠] فلسفة الحضارة – اشفيتسر لا ٨٤.

نیە، لەگەڵ ئەمەشدا هەڵەی گەورەمان ئەوەیە کە باوەڕمان وایە کە دەتوانین بەبێ تەسەووف دەگەینە تێڕوانینێك لە بوونەوەرو ژیانی ئەخلاقیدا کە فیکر ڕازی بکات... ئێستەش کاتی ئەوە هاتووە کە ڕزگارمان بێت لەم هەڵەیە، چوونکە قوڵبوونەو ڕۆچوون لە بیرکردنەوەدا تێڕوانین بۆ ژیان و جیهانی تایبەت بەئەخلاقی کارا ناهێنن مەگەر ئەو تێڕوانینە لە صۆفیگەرەیەوە سەرچاوەی گرتبێت) [٤٥١].

فیکری خۆرئاوایی نوێ صۆفیگەری بە ڕێنماو چاو ساغ دەزانێت بۆ دووبارە چاو خشاندنەوە بەجیهان و ژیاندا بۆ ئەوەی ئەخلاقگەلێکی کارا بنیات بنێت و لەو حاڵەتە دەریبهێنێت کە بەرەو پەستی دەڕوات لەپاش زاڵبونی ئەخلاقی بەرهەمهێنان و سود و دەسەلات بەسەریدا. ئەگەر ئەم سەردەمەی ئێمە خوازیاری صۆفیگەریە هەروەك برگستون دەڵێت: لەبەر ئەوەی کە دەسەلاتی عەقڵ کە ئامێرێکی دەسەلاتە ناتوانێت مرۆڤی دڵنیا و بێخەم دروستبکات، بەڵکو تەنها مرۆڤی خاوەن دڵەڕاوکێ دروستدەکات کە بەجۆرێك بوون(الوجود) دەبینێت کە لەسەر ڕشانەوە زیندوو دەبێتەوە، هەروەك سارتەر دەڵێت: ، کەواتە دەبێت لەلایەك عەقڵ هێزی ئیدراك و مەعریفە بێت و لەلایەکی تریشەوە هێزی کردار بێت و زەوی و لاربوونەوە و کردار و بەرزبوونەوە ڕێزو جوانی بەیەکەوە کۆبکاتەوە، هیچ عەقڵێکیش ناتوانێت بەم ئەرکە هەستێت مەگەر عەقڵێکی تێرکراو بێت بەژیان و ئیرادە و وویستی بەدەستی خۆی بێت و جڵەوی کارەکانی لەدەستی خۆیدا بێت و زاڵبێت بەسەر وەهم و خەیاڵدا، ئەمەش عەقڵی صۆفیگەرە واتە ئەو عەقڵە کاملەی کە بەردەوام هەوڵدەدات کە هاوڕێکی و مامناوەند بوونی وەستاو لەسەر خۆی و لە بوونەوەردا دروستبکات، گەورەبوون و زەبەلاح بوونی جەستە پێویستی بە

---

[٤٥١] فلسفة الحضارة اشفیتسر لا ٣٧١.

گەورەبوونی ڕۆح هەیە بۆ وەدیهاتنی مامناوەندی و ڕێکی، وەگەرنا مەسەلەکان ئاوەژو دەبنەوە بەهاکان دەکەون، ئەمەش کاری صۆفیگەریە کە دەکاتە هەمان کاری ژیان، واتە ئەخلاقی صۆفی هەمان ئەخلاقی ژیانە، خراپتێگەشتنی تەسەووف بووەتە هۆی ئەوەی کە بیرمەندەکان وەك ئەخلاقێکی نەبوو بێکەڵك سەیری دەکەن کەوەك جەستەیەکی گەورەی بێ ڕۆحێکی بەهێز وایە کە مامناوەندی دروستدەکات، وەك ئەو تەکنۆلۆجیاو تەکنیکەی کە لەژێر وویست و کۆنترۆڵی ئافرێنەرەکەی دەردەچێت، هۆشیاری مرۆڤی خۆرئاوایی لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە بە ڕەگ و ریشەداریەکی زیاترو زیاترەوە دەستیپێکردووە، هەروەك هایدگەر دەڵێت: : (ئێمە دەمانەوێت ببینە گەورە بەسەریەوە(واتە بەسەر تەکنۆلۆجیاوە) ئەم وویست و ئیرادەی سەرۆکبوونەش زیاتر سور دەبێت بەئەندازەی هەڕەشەکانی تەکنۆلۆجیا کە توانای چاو دێریکردنی مرۆڤی نەمێنێت)[٤٥٢].

مرۆڤی خۆرئاوایی ئەیەوێت دووبارە سەرۆکایەتی و دەسەلاتی خۆی دروستبکاتەوە، چوونکە چەمکی مرۆڤ بەلای ئەوانەوە نەماوە و لەناوچووە و تەکنۆلۆجیا بەمانا گشتیەکەی شوێنی گرتووەتەوە، پیشەسازی سەرۆکایەتی مرۆڤ بریتیە لەناوەڕۆك و گەوهەری تەسەووف چوونکە مرۆڤ دەکاتە کەسێکی راکێشراو لەسەر زەوی و ڕوو لەئاسمان، بەدەستەواژە و زمانەکەی برگسون(بنەماکانی ئەم میکانیکیەتە زۆر صۆفیگەرانەیە، ئەم میکانیکیەتەش ڕووی ڕاستەقینەی خۆی بەدەست ناهێنێتەوە و خزمەتگوزاری گونجاوو هێز پێشکەش ناکات تاوەکو مرۆڤایەتی کە زۆر لاربووەتەوە بەرەو زەوی بەهۆی ئەمەوە بەرز ببێتەوە و

---

[٤٥٢] هایدگر مقالات و محاضرات – ل ١٠ – ١٢.

ڕاپەڕێت و ڕووبکاتە ئاسمان) [٤٥٣] و(لەگەڵ کۆمەڵگەی بەکاربەردا[٤٥٤] کۆتی دەستەکانی بقرتێنێت بۆ ئەوەی دەستەکانی بۆ کۆمەڵگەی مامناوەند و ڕێك بکاتەوە، کۆمەڵگەی بەکاربەر زیاتر چەمکی حەیوانی مرۆڤ قولتر دەکاتەوە، ئامانجی شارستانیەتیش بەرزبوونەوە و بەڕێزتر بوونە لەو(واتە چەمکی حەیوانی) هەربۆیە(هەرکەسێك خەموخەفەتی تەنها پڕکردنی ووزگی بێت ئەوا نرخ و بەهای ئەو کەسە بەئەندازەی پاشەڕۆیەکەیەتی) [٤٥٥]. دامەزراندنی بەهایەکی تر بێجگە لەبەهای حەیوانات بریتی بووە لەئامانجی بیرمەند و فەیلەسوفەکان لە خۆرئاوای ئەمڕۆدا و بانگەوازکردن بۆلای صۆفیگەری کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، بانگەواز نەبووە بۆلای مردن بەڵکو بانگەواز بووە بۆلای ژیان [٤٥٦].

خەڵکی سێ بەشن:

---

[٤٥٣] برگسون منبعا الاخلاق والدين الفصل الرابع.

[٤٥٤] ئامانجی کۆمەڵگەی بەکاربەر بەدەستهێنانی خۆشگوزەرانی مادیە بۆ مرۆڤ واتە بەکارهێنان و دەستەمۆکردنی هەموو ئەو هێزو توانایانەیە کە هەیەتی بۆ ئەم مەبەستە، ئەوەتا دەبینین ئەمڕۆکە مەسەلەکە گەشتووەتە دەستەمۆکردنی مرۆڤیش کە لەسەر شێوەکانی بەکارهێنانی ناباش دەردەکەوێت ئیتر لەنێو گەلاندا بێت یان لەنێو چینەکانی کۆمەڵگەدا.

[٤٥٥] میزان العمل لا ٧٩.

[٤٥٦] ئەم قسەیە دەکرێت بکرێتە ڕخنە لە سەر هەڵوێستەکەی زەکریا ئیبراهیم لەبارەی ئەخلاقەوە لەلای ئیمامی غەزالی، چوونکە بەئەخلاقی بێکەلّك ناوزەدی دەکات کە بانگەشە دەکەن بۆ لای مردن.

بەبڕوای من هەڵوێستێکەی لایەنی باشی هەیە و پێویستی بە چاوپیاخشاندنەوە و تێڕوانین هەیە، چوونکە لەوانەیە هەڵوێستەکەی( زکریا ئیبراهیم) بەهۆی سەرسامی ناوبراوەوە بێت بەشارستانیەتی خۆرئاوا و سەرسامبوونی بەشتێك کە عەقڵ والێدەکات توانای بینینی نەبێت، ئەمڕۆکەش کۆمەڵگەی ئیسلامی زۆر پێویستی بە بەصیرەت و بینایی هەیە ئیتر بینینی خەڵکی بێت یان بینینی خودی خۆی بێت، سەرسامبوون لە کاری مرۆڤە ئازادیخوازەکان نیە، ( الاخلاق عند الغزالي) زكريا ابراهيم لا ١٨٤ بەرەو سەر.

بەشی یەکەمیان: ئەوانەن کە لەنێو دوونیادا ڕۆچوون و تەنها بەزمان و باسکردنی دەروون بیریان بەلای قیامەتەوە هەیە، کە زۆربەی خەڵکی پێکدەهێنن و لە قورئانیشدا بە بەندەکانی ستەمکاری و خراپترینی گیانەوەرو چەندین شتی تر ناویان هاتووە.[٤٥٧]

بەشی دووەمیان: بەپێچەوانەی ئەوانەی پێشوون بە هەموو شێوازێك گرنگیان بەقیامەتداوە و بەهیچ شێوەیەك لاناکەنەوە بەلای دوونیادا ئەمانەش صۆفی و ڕەبەنەکانن(الناسكين).

بەشی سێیەمیشیان: ئەوکەسانەن کە ڕێگەی مامناوەندیان گرتووە و گرنگیان بەهەردوو دوونیا داوە و باشترین کەسن لەلای لێکۆڵەرەوەکان، چوونکە بەتەواوەتی دەستیانگرتووە بە هۆکارەکانی دوونیاو قیامەتەوە و پێغەمبەران بەگشتی لەم کەسانەن، چوونکە خودا ناردوونی بۆ بەدیهێنان و پاراستنی بەرژەوەندی بەندەکانی خۆی لەژیانی ئەم دوونیا و ئەو دوونیادا[٤٥٨].

بەدیهاتنی ئەم مامناوەندیە بریتیە لە گەوهەرو ناوەرۆکی تەسەووف کە ناوەرۆك و ڕۆحی ئەو شارستانیەتەیە کە غەزالی لەکتێبەکەیدا(میزان العمل) بانگەشەی بۆ دەکات، وە هەروەها کۆمەڵێکی بێسنوریش لەبیرمەندانی ئەمڕۆکە بانگەشەی بۆ دەکەن، لێرەوە ئامادەباشی و هێزی غەزالی دەر دەکەوێت.

---

[٤٥٧] ئەمەش مانای کۆمەڵگەی بەکاربەری ئەمڕۆیە( ڕۆچووەکان بەناو دونیادا).

[٤٥٨] میزان العمل لا ١٢٠.

# کـــــۆتایی

گەشتکردن بەناو بەرهەمەکانی غەزالیدا زۆر قورسە چوونکە دەزگایەکی تێگەشتنی تایبەتی پێویستە، هەربۆیە گریمانی هەڵە لەکاتی هەوڵدان بۆ تێگەشتن لێیان زۆرە، چوونکە لەوانەیە هەندێك مانا بۆ هەندێك ووشە بکەین بەبێ ئەوەی کە غەزالی مەبەستی بوبێت، لەوانەیە ئەمەش بێت هۆکاری ئەو وەهمەی کە زاڵە بەسەر بەرهەمەکانیدا لەکاتی خوێندنەوەیان، یان لەوانەیە بەهۆی نەزانی و ناشارەزایی خوێنەرەوە بێت سەبارەت بە بەرهەمە ناوازەکانی ئیمامی غەزالی، چوونکە هەندێکجار غەزالی دەستەواژە و زاراوەیەکی دیاریکراو بەکار دەهێنێت بەبێ ئەوەی کە خوێنەر ماناکەی بیزانێت، هەربۆیە پەنا دەبەینە بەر تێگەشتنی تایبەتی خۆمان بەبێ ئەوەی کە بچینە نا قوڵایی ئەو زاراوانەوە لەبارەی پێناسەی تایبەتیەوە، وەك بەکارهێنانی ووشەی(نور) لە کتێبی(المنقذ من الضلال) دا بەبێ پێناسەیەکی تێگەشتنی و نەبوونی شارەزاییەکی تەواو لە(مشکاة الانوار) یان(احیاء) یان(میزان العمل) خوێنەر ناتوانێت لە مانای ڕاستەقینەی ئەم چەمکە(نور) تێبگات، هەربۆیە دەخلیسکێت و دەکەوێتە ناو تێگەشتنگەلێکی خودیەوە و دەیانلکێنێت بە کەسایەتی فەیلەسوفەوە، ئەم بەشەش بەپێی ئەندازەگیری و بۆچوونی من لەدیارترین ئەو بەشانەیە کە هەڵەی تێدا دەکرێت و وەهم بەیەقین دادەنرێت.

ئەگەر ئەم گەشتە قورس بێت ئەوا گەشتیارەکەش وادەزانێت کە لەچوارچێوەیەکی ئیسلامیدایە، چوونکە کتێبەکانی پڕن لەئایەتە قورئانیەکان و

فەرموودەکانی پێغەمبەر و چەندین قسە و باسی تر کە دراونەتەپاڵ هەندێك لەموسوڵمانان، بەڵام لێرەدا غەزالی جیاوازە لە بیرمەندەکانی تری ئیسلام وەك فەقیهەکان، چوونکە دەبینین کار لەسەر ڕاستیەتی ماناو ناوەڕۆکی حەدیس دەکات نەك ڕاستیەتی گێڕانەوەکەی، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە غەزالی کاری لەسەر ڕاستیەتی گێڕانەوەکان کردووە نەك گێڕەرەوەکانیان، واتە ئەگەر ناوەڕۆکی هەر فەرموودە و قسەیەکی هاوەڵان نزیکبوبێت لەڕاستیەوە هێناویەتی و هێندە گوێی نەداوە بە گێڕەرەوە و گۆیاکەی، ئەم بەرگە ئیسلامیەش کە غەزالی کردوویەتیە بەری هەموو کتێبەکانی وایلێکردووە کە بەناوی ئیسلامەوە قسە بکات و ببێتە ووتەبێژی ئیسلام – چوونکە ئیسلام بەڵگەی بووە – ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ڕۆشنبیری غەزالی لەڕووی ووردی و جۆراو جۆریەوە قورسە لەیەك ئاین یان یەك فەلسەفەدا کۆبکرێتەوە، سەرەڕای ئەم جۆراو جۆریە لەبەدەستهێنانی مەعریفەکاندا کە هەمەجۆریەکی پێویستە ئەوکات داهێنان و دەربڕین دەبێت دەربڕی خود بێت واتە دەربڕی کەسایەتیەکی ڕۆشنبیری بێت کە ئەم لایەنگری لێدەکات، بەمەش دەبێتە یارمەتیدەرێکی ڕاستەقینەی ڕۆشنبیری ئوممەتەکەی و زانستەکانی.

کاتێك ئەفلاتون فەلسەفاندنی دەکرد کەسێکی یۆنانی بوو، بەڵام کاتێك فێربوو بوویە کەسێکی جیهانی، ئەمەیە گەورەیی یۆنانیەکان چوونکە توانیان بەخودەکانی خۆیان باسی خۆیان بکەن کە بەهۆی بەریەککەوتنیان لەگەڵ ڕۆشنبیری و کەلتورە جۆراوجۆرەکانەوە پەروەردە بوبو، گەورەیی موسوڵمانانیش لەکۆندا هەرئەمە بوو کاتێك توانیان باسی خودەکانی خۆیان بەخۆیان بکەن و ببنە داهێنەر، کاتێك فێربوون توانیان زانستی جیهانیان لەخودەکانیاندا کۆ بکەنەوە، ئەم تایبەتمەندیە زۆر گرنگە و ووروژاندنیشی بەهەمانشێوە گرنگە چوونکە چارەسەری مەسەلەیەکی مەترسیدار دەکات کە لەجۆریەتی فەلسەفەی فەیلەسوفێکی وەك غەزالیدا بۆ ئێمە لەئێستادا خۆی دەبینێتەوە.

مێژوونوسەکان تەنها کۆمەڵێك لێکۆڵەر و ڕەخنە گرن لەبنەماو پێکهاتە گەلێکی ناسینی فەیلەسوف، دەڵێن ئەمە ئەرستۆییە ئەوە فیساغۆرسیە ئەوەش هرمسیە ئەمەشیان گاورو نەصرانیە.... هتد. نمونەی ئەمەش قسەکەی جابیریە کە دەڵێت: (غەزالی لە کتێبەکەیدا(جواهر القران) خوێندنەوەیەکی هرمسی بۆ قورئان و زانستە زمانەوانی و ئاینیەکانیمان پێشکەش دەکات) [٤٥٩]. ئەم قسەیەش مانای ئەوەیە کە جابیری شارەزای سروشتی خوێندنەوەی هرمسیە و کاتێکیش لەلای غەزالی دەیبینێت کە قورئان دەخوێنێتەوە و دەگاتە دەرئەنجامەکانی ئەو، کە بەبۆچوونی من دەرئەنجامگەلێکی خێران چوونکە پێویست وایە لەگەڵ ئەوەی کە باسم کرد دەبێت زانست و زانیاری لەبارەی خودی قورئانەوە هەبێت لەپاڵ شارەزایی لە هرمسیەتدا، بۆئەوەی دواتر بزانین کە ئایا خوێندنەوەکە هرمسی بووە یان نا، چوونکە لەوانەیە چەندین توخمی هاوبەش هەبن لەنێوان ڕۆشنبیری و کەلتورەکاندا، بارون کارادوفو لە کتێبەکەیدا(الغزالی) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە غەزالی لەئەخلاقەکەیدا دەربری ڕۆحێکی نەصرانی و گاورە، ئایا ئەمە واتای ئەوەیە کە چەمکی برایەتی و داد پەروەری و میهرەبانی تەنها بەهاگەلێکی نەصرانی و مەسیحین و قورئان شارەزایی لەبارەیانەوە نیە؟ یان قورئان لەئاینی ناوبراوەوە وەریگرتوون؟ لەمکاتەشدا ئێمە دەتوانین بڵێین ئەخلاقی مەسیحیەت دەربڕی ڕۆحێکی زوهدیە کە لەئاینە خۆرهەڵاتیە کۆنەکانەوە وەرگیراوە، یان بڵێین یاسای دادگەری لەئەخلاق و مامناوەندبووندا یاسایەکی ئەرستۆییە و غەزالیش لە ئەخلاقە کەیدا دەربڕی ڕۆحێکی ئەرستۆییە.

---

[٤٥٩] الجابری( تکوین العقل العربی) ل ٢٨٨.

ئەم شێوازە لە مامەڵە کردن لەگەڵ دەقی فەلسەفیدا مامەڵەیەکی هەژارانە و ڕواڵەتیە، وەك ئەو کەسە وایە کە لەبەردەم کۆشکێکی بەرزو بەهێزدا وەستابێت لەبری ئەوەی کە خۆشی لەجوانیەکەی ببینێت و لە هێزو توانای بنیاتنەرەکەی تێبگات دەڵێت: : ئەم کۆشکە بریتیە لە کۆمەڵێك داروبەرد ئەمەش بەهیچ شێوەیەك کارایی عەقڵی ئەم کەسە دەرناخات.

هەموو پیشەو دروستکردنێك لەحەقیقەتیدا بریتیە لەکۆکردنەوەی شتە جیاوازەکان، بەڵام هەموو کەسێك توانای ئەو کۆکردنەوەیەی نیە، بەڵکو پیشەگەری لێزان و شارەزا ئەو هێزو تواناو لێهاتنەی تێدایە کە پارچە بەرد و دارەگەورە و وردەکان کۆبکاتەوە و کۆشکێکی خاوەن ڕەونەق و جوان و بەهێزیان لێ دروستبکات، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە شێوازی بیناکردن تەنها کەسە بلیمەت و هەڵکەوتووەکان و بیرو زەین تیژەکان نەبێت نایزانن کە دەرئەنجامی فێربوون و خۆڕاهێنانە، کە لەکۆتاییدا پیشەگەر و دروستکەرێکە کە خۆی دەنوێنێت و هونەر و هێزو تواناکانی دەردەخات.

کاتێك غەزالی لەگەڵ فەیلەسوفەکانی تری ئیسلامدا بەرابەر دەکەین تەنها وەك نوسەرێکی موسوڵمان دێتە بەرچاومان کە بەئاسانی لەنێو کۆمەڵەی سیستەمی ئیسلامیدا دەگۆڕێت، وەك قورئان و سوننەت و فیقهو زانستی کەلام، کە لەنێو ئەم چوارچێوەیەدا باسی گەورەترینی فیکرەکان دەکات بەمشێوەیە دەبێتە کەسێکی داهێنەر نەك گێڕەرەوە [٤٦٠]. غەزالی بەشێوەیەکی ئیسلامی بیردەکاتەوە، چوونکە توانیویەتی دەقی ئیسلامی بهێنێتە گۆو وایلێبکات کە نهێنیەکانی ئاشکرا بکات،

[٤٦٠] ئەم مانایە لەهەموو نوسینەکانی ئەو نوسەرانەدا کە باسی فەلسەفەی غەزالی و ژیاننامەکەیانکردووە بەڕوونی دیارە، بەڵام هەندێك لەم سەربەخۆییەدا گەورەیی فیکری غەزالی دەبینن، هەندێکیش بە شکستی فیکری و دەرچوونی لەسەر ڕێگەی فەلسەفەی یۆنانی دەبینن.

دەقی ئاینی پێویستی بەخودێك هەیە كە ماناو ئەو ووشانەی كە خود بەزانست و مەعریفەكانیان گەشە دەكات تێیاندا دەربهێنێت هەركات بتوانێت بگاتە لای دوورترین و قوڵترینی ماناكانی، لەبەر ئەوەی خود هیچ سنورێكی نیە كە لێی بوەستێت هەربۆیە دەرهێنانی دەق و خوێندنەوەی بەكراوەیی تاوەكو بیٚ كۆتا دەمێنێتەوە، ئەمەش ئەوەیە كە ئێمە دەتوانین بە م قسەیە دەری ببڕین(جەدەلیەتی وەحی و واقیع).

ئەوەی كە من بەدەستم هێناوە لە ڕێگەی كتێبی(میزان العمل) دا بەبارمەتی وەرگرتن لەكتێبەكانی تری غەزالی مەبەستم لێی ئاشكراكردنی هەندێك لایەن و نیشانەی كەسایەتی ئەم پیاوە بووە، هەرچەندە هەندێك لەمەسەلەشم خستووەتە بەرباس كە چاوەڕێی پێداچوونەوە و بیرلێكردنەوەن، چوونكە من باوەڕم بەوە هەیە كەكاری بیرمەند بریتی نیە لەوەلامی ئەو پرسیارانەی كە بوونیان هەیە، بەڵكو كاری بیرمەند بریتیە لە دۆزینەوەی مەسەلەگەلێكی نویٚ، وە هەروەها ئەگەر بتوانم هەندێك لە ئاستەنگ و مەسەلەگەلێك دروستبكەم كە بەلای فەلسەفەی غەزالی بەتایبەت و فەلسەفەوە بەگشتی گرنگن ئەوكات ئامانج و مەبەستی خۆمم وەدیهێناوە، وەئەگەر نەتوانم ئەوكات هەوڵی خۆم داوە، بیركردنەوەش لە حەقیقەت و كۆتایی فەلسەفە تەنها هەوڵێكی باوەڕدارە بەتواناو سنورەكانی، لەسەرو هەموو خاوەن زانستێكەوە كەسێكی زۆر زاناو شارەزا هەیە كە خودای گەورەیە.

وەرگێڕانی ئەم كتێبە تەواوبوو لە
٢٧ / ٨ / ٢٠١٥

# سەرچاوەکان


غەزالی(ئەبوحامید)

١ – احياء علوم الدين: دار المعارف للطباعة والنشر بيروت – بلا تأريخ.

٢ – الاربعين في اصول الدين: دار الجيل بيروت ١٤٠٨ هجرى ١٩٨٨ميلادى.

٣ – الاقتصاد في الاعتقاد: مكتبة ومطبعة محمد محمد على صبيح واولاده، ١٣٨٢ هجرى – ١٩٦٢ ميلادى.

٤ – الماعرف العقلية تحقيق وتقديم وتعليق – د على ادريس الطبعة الاولى ١٩٨٨ التعاضدية العمالية للطباعة والنشر – تحقيق عبد الكريم عثمان دم ١٣٨٣ هجرى ١٩٦٣ ميلادى.

٥ – ايها الولد – تحقيق وتعليق وتقديم على محى الدين(على القرة داغى دار الاعتصام القاهرة ١٩٨٠ ميلادى.

٦ – جواهر القران – تحقيق لجنة احياء التراث العربى في دار الافاق الجديدة منشورات دار الافاق الجديدة بيروت الطبعة الخامسة ١٤٠١ هجرى – ١٩٨١ ميلادى.

٧ – تهافت الفلاسفة – تحقيق د سليمان دنيا الطبعة السادسة دار المعارف ١٩٨٠ م.

٨ – رسالة التوحيد: من رسائل الامام الغزالى ضبط وتقديم رياض مصطفى العبدالله دار الحكمة دمشق بيروت(بلا تأريخ).

٩ – القسطاس المستقيم: دار المشرق بيروت – تقديم وتذييل واعادة وتحقيق فيكتور شلحت طبعة ثانية منقحة ١٩٨٣م.

١٠ – كيمياء السعادة: دار المعارف للكباعة والنشر سوسة / تونس نوفمبر ١٩٨٨.

١١ – المنقذ من الضلال: حققه وقدم له د جميل صليبا ود – كامل عياد، دار الاندلس الطبعة العاشرة ١٤٠١ هجرى ١٩٨١ ميلادى.

١٢ –مقاصد الفلاسفة – تحقيق د سليمان دنيا دار المعارف مصر سلسلة ذخائر العرب ١٩٦٠.

١٣ – معارج القدس فى مدارج معرفة النفس: منشورات دار الافاق الجديدة بيروت كبعة رابعة.

١٤ – مشكاة الانوار ومصفاة الاسرار – شرح ودراسة وتحقيق الشيخ عبد العزيز عزالدين السيروان عالم الكتب الطبعة الاولى ١٤٠٧ هجرى ١٩٨٦ ميلادى.

١٥ – المستصفى: بولاق ١٣٢٤ هجرى.

١٦ – معيار العلم تحقيق د سليمان دنيا طبعة ثانية ١٩٦٩ م.

١٧– ميزان العمل: تحقيق د سليمان دنيا طبعة اولى ١٩٦٤ م دار المعارف.

١٨ – ميزان العمل: دار المعارف العربي ١٩٨٣م بيروت.

١٩– مجموع رسائل الغزالى(المضنون به على غير اهله، الاجوبة الغزالية فى المسائل الاخروية، ومشكاة الانوار والجام العوام عن علم الكلام) دار الكتب العلمية بيروت لبنان ١٤٠٦ هجرى – ١٩٨٦ م.

٢٠ – ابو حامد الغزالى فى ذكرى المئوية التاسعة لميلاده: المجلس الاعلى للفنون والاداب والعلوم الاجتماعية – القاهرة ١٣٨٢ هجرى – ١٩٦٢ م.

٢١ – الاعسم عبد الامير(الفيلسوف الغزالى) دار الاندلس بيروت لبنان طبعة ثانية ١٩٨١ م.

٢٢ – الاهوانى(احمد فؤاد) الغزالى مؤسس علم النفس الاسلامى – من مقدمة كتاب جواهر القران منشورات دار الافاق الجديدة بيروت الطبعة الخامسة ١٤٠١ هجرى ١٩٨١ م.

٢٣ – ابن رشد(ابوالوليد) الكشف عن مناهج الادلة فى عقائد الملة وفصل المقال وتقرير مابين الشريعة والحكمة من الاتصال – منشورات دار الافاق الجديدة طبعة ثانية ١٣٩٢ هجرى ١٩٧٩ م.

٢٤ – ابن سبعين: بد المعارف – تحقيق وتقديم د جورج كتورة – دار الاندلس للطباعة والنشر والتوزيع بيروت طبعة اولى ١٩٧٨ م.

٢٥ – ابن سينا(ابوعلى): الاشارات والتنبيهات – شرح نصيرالدين الطوسى – تحقيق سليمان دنيا – القاهرة دار المعارف – سلسلة ذخائر العرب ١٩٦٠ م.

٢٦ – ابن طفيل – حى ابن يقظان – دار المعارف ١٩٨٥ م.

٢٧ – ابن عبدالكريم سالم(عبد الجليل) التأويل عند الغزالى منهجا وتطبيقا – اشراف على الشابى تونس ١٩٨٨ م.

٢٨ – ابن مسكويه(احمد) الفوز الاصغر بيروت ١٣١٩ هجرى.

٢٩ – ابن مسكوية(احمد) تهذيب الاخلاق وتطهير الاعراق ١٩٠٨ م.

٣٠ – ابراهيم(عبدالستار) العلاج النفسى الحديث قوة للانسان – سلسلة عالم المعرفة عدد ٢٧ المجلس الوطنى للثقافة والفنون والاداب الكويت مارس ١٩٨٠ م جمادى الاولى ١٤٠٠ هجرى.

٣١ – التوحيدى(ابو حيان) الامتاع والمؤانسة – تحقيق احمد امين واحمد الزين بيروت دار الحياة – بدون تأريخ.

٣٢ – الجابرى(محمد عابد): نقد العقل العربى.

٣٣ – الجابرى(محمد عابد): تكوين العقل العربى – مركز دراسات الوحدة العربية طبعة الرابعة بيروت ئاذار / مارس ١٩٨٩ م.

٣٤ – الجابرى(محمد عابد) بنية العقل العربى طبعة ثالثة بيروت ايار مايو ١٩٩٠ م.

٣٥ – الحنفى(عبدالمنعم) معجم مصطلحات الصوفية – دار المسيرة بيروت الطبعة الثانية ١٤٠٧ هجرى – ١٩٨٧ م.

٣٦ – اخوان الصفا: الرسائل – بيروت دار صادر(بدون تأريخ).

٣٧ – ارستو علم الاخلاق الى نيقوماخوس – نقله الى العربية احمد لطفى السيد مع مقدمة فى علم الاخلاق وتطورات – بارتلمى سانتهيلر – مطبعة دار الكتب المصرية القاهرة ١٣٤٣ هجرى ١٩٢٤ م.

٣٧ – اركون(محمد) الفكر الاسلامى قراءة علمية – مركز الانماء القومى – بيروت ١٩٨٦ م.

٣٩ – اسفيتسر(البرت) فلسفة الحضارة – ترجمة عن الالمانية عبدالرحمن بدوى – دار الاندلس طبعة ثانية ١٤٠٠ هجرى – ١٩٨٠ م.

٤٠ – الشهرستاني(ابو الفتح) الملل والنحل – تحقيق محمد عبد العزيز الوكيل – القاهرة مؤسسة الحلبى ١٩٦٨ م.

٤١ – الطويل(توفيق) فلسفة الاخلاق – دار النهضة العربية – القاهرة.

٤٢ – الطويل(توفيق) اسس الفلسفة ١٩٧٦ م الطبعة السادسة دار النهضة العربية بالقاهرة.

٤٣ – العثمان(عبد الكريم) الدراسات النفسية عند المسلمين والغزالى بوجه خاص: القاهرة ١٩٦٣ م ١٣٨٢ هجرى.

٤٤ – العثمان(عبدالكريم) سيرة الغزالى واقوال المتقدمين فيه – طبعه اولى دمشق.

٤٥ – اغروس(روبرت م) و ستناسيور(جورج ن): العلم فى منظوره الجديد – ترجمة كمال خلايلى – سلسلة عالم المعرفة ١٣٤ – المجلس الوطنى للثقافة والفنون والاداب الكويت – فبراير ١٩٨٩ م.

٤٦ – افلاطون: الفيدون – عربها عن الانكليزية زكى نجيب محمود، لجنة التأليف والترجمة ١٩٦٦ م جمادى الاخرة ١٤٠٩ هجرى.

٤٧ – الفارابى(ابو نصر) مبادئ اراء اهل المدينة الفاضلة – بيروت ١٩٥٩ م.

٤٨ – القشيرى: الرسالة القشيرية فى علم التصوف، دار الكتاب العربى بيروت لبنان(بدون تأريخ).

٤٩ – الكندى(ابو يوسف) رسائل الكندى، تحقيق عبدالهادى ابو ريدة، الطبعة الثانية – القاهرة دار الفكر العربى ١٩٨٧م.

٥٠ – امين(احمد) ضحى الاسلام ج ٣ دار الكتاب العربى بيروت لبنان طبعة العاشرة(بلا تأريخ).

٥١ – المرزوقى(ابو يعرب) مفهوم السببية عند الغزالى طبعة اولى، دار بوسلامة للطباعة والنشر والتوزيع ١٩٨٧ م.

٥٢ – المحاسبى(ابو عبدالله الحارث) العقل وفهم القران، بيروت دار الفكر – ١٩٧١م.

٥٣ – النشار(على سامى): نشأة الفكر الفلسفى فى الاسلام، دار المعارف الطبعة الثانية ١٩٨١ م.

٥٤ – باسيل(فيكتور سعيد): منهج البحث عن المعرفة عند الغزالى دار الكتاب اللبنانى بيروت – بلا تأريخ.

٥٥ – برغسون(هنرى): منبعا الاخلاق والدين – تعريب سامى الدريوش وعبدالله عبد الدائم – الطبعة الثانية كانون الثانى يناير ١٩٨٤ م دار العلم للملايين، بيروت لبنان.

٥٦ – بروكلمان(كارل): تأريخ الشعوب الاسلامية، ترجمة د نبيه امين فارس ومنير البعلبكى، بيروت ١٩٦٠ – ١٩٦٢ م.

٥٧ – بدوى(عبدالرحمن): مؤلفات الغزالى، الطبعة الثانية ١٩٧٧ م.

٥٨ – بدوى(عبدالرحمن): ربيع الفكر اليونانى، طبعة رابعة ١٩٦٩ م مكتبة النهضة المصرية – مطابع دار القلم بيروت لبنان.

٥٩ – بدوى(عبدالرحمن) كتاب النفس ترجمة اسحاق ابن حنين، القاهرة – مكتبة النهضة المصرية ١٩٥٤ م.

٦٠ – بدوى(عبدالرحمن) ارسطو عن العرب، الكويت وكالة المطبوعات ١٩٧٨ م.

٦١ – بدوى(عبدالرحمن) مذاهب الأسلاميين – الجزء الاول دار العلم للملايين الطبعة الثانية كانون الثانى يناير ١٩٧٩ م.

٦٢ – بدوى(عبدالرحمن) اوهام حول الغزالى، مؤتمر الغزالى – دراسات فى فكره وعصره وتأثيره – كلية الاداب بجامعة محمد الخامس الرباط ١٩٨٨ م.

٦٣ – دنيا(سليمان) الحقيقة فى نظر الغزالى – دار المعارف الطبعة الرابعة ١٩٨٠ م.

٦٤ – دنيا(سليمان) التفكير الفلسفى الاسلامى – مكتبة الخانجى بمصر، الطبعة الاولى ١٣٨٧ هجرى ١٩٦٧ م.

٦٥ – ديبور(ت. ج) تأريخ الفلسفة فى الاسلام، نقله الى العربية وعلق عليه محمد عبد الهادى ابو ريدة – الدار التونسية للنشر المؤسسة الوطنية للكتاب، الجزائر بلا تأريخ.

٦٦ – ديورنت(ول) قصة الحضارة المجلد ١٣ / ١٤ ترجمة محمد بدران، الطبعة الثالثة ١٩٧٤ م القاهرة لجنة التأليف والترجمة والنشر.

٦٧ – رسل(برتراند) مقدمة الفلسفة الرياضية القاهرة ١٩٦٢، مؤسسة سجل العرب.

٦٨ – زكى نجيب محمود: المعقول واللامعقول فى تراثنا الفكرى – الطبعة الخامسة دار الشروق، القاهرة ١٩٩٣ م.

٦٩ – سكينر(ب. ف) تكنولوجيا السلوك الانسانى، ترجمة عبدالقادر يوسف، عالم المعرفة – الكويت عدد ٣٢ اعسطس اب ١٩٨٠ م.

٧٠ – صبحى(احمد محمود) الفلسفة الاخلاقية فى الفكر الاسلامى – دار المعارف الطبعة الثانية، بلا تأريخ.

٧١ – غرانجية(جيل غاستون): العقل، ترجمة عنرى زغيب، المنشورات العربية – ماذا اعرف عدد ٣٩.

٧٢ – غريغورا(فرانسوا) المذاهب الاخلاقية الكبرى، ترجمة قتيبة المعروفى، منشورات عويدات، بيروت لبنان، الطبعة الثانية اكتوبر ١٩٧٧ م.

٧٣ – فرويد(زيغموند): القلق فى الحضارة، ترجمة جورج طرابيشى دار الطليعة بيروت.

٧٤ — قاسم(محمود) فى النفس والعقل لفلاسفة الاغريق والاسلام — الطبعة الثانية ١٩٥٤ م مكتبة الانجلة المصرية.

٧٥ — قنصوة(صلاح) الموضوعية فى العلوم الانسانية، دار التنوير للطباعة والنشر، بيروت لبنان — الطبعة الثانية، ١٩٨٤ م.

٧٦ — قنصوة(صلاح) نظرية القيم فى الفكر المعاصر دار التنوير للطباعة والنشر، بيروت لبنان — الطبعة الثانية، ١٩٨٤ م.

٧٧ — كارادوفو(البارون): الغزالى، نقله الى العربية عادل زعيتر دار احياء الكتب العربية — ١٩٥٩ م.

٧٨ — كامل(الفؤاد) الغير فى فلسفة سارتر، دار المعارف مصر. بلا تأريخ.

٧٩ — كرم(يوسف) تأريخ الفلسفة اليونانية، دار القلم — بيروت لبنان، طبعة جديدة.

٨٠ — كوربان(هنرى) تأريخ الفلسفة الاسلامية، بيروت منشورات عويدات ١٩٦٦ م، ترجمة نصير مروة وحسن قبيسى.

٨١ — محمود(عبدالحليم) التفكير الفلسفى فى الاسلام، دار الكتاب اللبنانى بيروت، الطبعة الاولى ١٩٨٤ م.

٨٢ — مدكور(ابراهيم) فى الفلسفة الاسلامية منهجه وتطبيقه، دار المعارف بمصر، طبعة ثالثة ١٩٨٦ م.

٨٣ — ميتز(ادم) الحضارة الاسلامية فى القرن الرابع الهجرى، ترجمة محمد عبدالهادى ابو ريدة، القاهرة دار الكتاب العربى، بيروت الطبعة الرابعة ١٣٨٣ هجرى ١٩٦٧ م.

# گۆڤارەكان:

١ – الباحث: د خلف الجراد فراءة فى الفكر الغزالى التربوى، سبتمبر ١٩٨٦ م عدد ٤٣.

٢ – الفكر العربى المعاصر: مروان قبانى، النسق التربوى عند الغزالى فى ضوء رسالة ايها الولد عدد ٢١.

٣ – الفكر العربى المعاصر: بشارة صارجى– بنية الظاهرة النفسية عند فرويد عدد ٦٢.

٤ – الفكر العربى المعاصر: الغزالى بين فكر القطيعات وسياسة الاقطاع النهوضى والسياسى عدد ٥٦ – ٥٧.

٥ – الفكر العربى المعاصر: عبد المجيد الانتصار، المعرفة واسس سلطتها عند الغزالى النهوضى والسياسى عدد ٥٦ – ٥٧.

٦ – المجلة التونسية للدراسات الفلسفية: مقداد منسية: طبيعة النفس وطبيعة العلم عند ابن سينا وابن حزم و ابن قيم، مارسى ١٩٨٤ عدد ٢.

٧ – المجلة التونسية للدراسات الفلسفية: سعيد بن سعيد: الغزالى والفلسفة متاهات التأويل – جون ١٩٨٥ م عدد ٤،

٨ – المجلة التونسية للدراسات الفلسفية: توفيق الشريف: الانسان بين النزعة الالية والنزعة الروحانية او الالية والتصوف، نوفمبر ١٩٨٧ م.

٩ – الوحدة: د محمد ياسين عريبى، عقلنة العقل، عدد ٤٣ ابريل ١٩٨٨ م.

١٠ – الوحدة: السنة الخامسة عدد ٦٠ ايلول ١٩٨٩ م عدد خاص بالفلسفة العربية بين الابداع والانتباع.

١١ – الوحدة: السنة التاسعة عدد ٩٨ تشرين الثانى ١٩٩٢ م خاص بالفلسفة والفكر المعاصر.

## سەرچاوە بیانیەکان

1- Aristote;metaphysiqur.Taduction Tricot.
2-Benveniste;problems de linguistique generale. Gallimard1966.
3-Bouyges(M);essai de chronologie des oeuvres dalgh-azali.Beyrout 1959.
4-Comte(Auguste);Cours de philosophie.
5-Des Cartes(R);discours de la method et meditation collection 10-18 paris 1980.
Foucault(M);Surveiller et punir.Gallimard 1976 6-
7-Freud(Simund);Aberge de pshchanalyse PUF 1967.
،8-Freud(Sigmund);Metapsychologie Gallimard 1968.
Gallimard ،9-Heidegger(M);Essais et conferences 1958.)
10-Husserl(E);la crise des
scinces Europeennes le la phenomenologie transcendental. Gallimard 1976.
in Mi- ،11-Jabre(Farid);la biographie de Ghazali deo.1954.
12-Jabre(Farid);La notion de la Maarifa chez Beyrouth 1958. ،Ghazali
13-Jabre(Farid);Notion de certitude selon Ghaza-li.
14-Marx(M);manuscrits de 1844.Collection de la pleiade 1962.
15-Marx(K);Critique de Leconomie politique pris.Edition Sociales 1957.

16-Marcuse(H);L Homme unidimensionnel.Seuil 1970.
17-Munk(S);Melanges de philosophie Juive et Vrin.1988.Second tirage. ،Arabe.pris
18-Pearson(J.D);Index Islamicus.Cambridge 1958.Supplement 1-4.1962/1977.
19-ponty(Marleo);Fhenomenologie de la perception.Gallimard 1945.
20-Ricoeur(P);Conflits des interpretations.Seuil.
21-Ricoeur(P);Histoir et verite.paris.Seuil 1964.
22-Sarte(J.P);L etre et le neant.Gallimard 1943



## وەرگێڕ لەچەند دێڕێکدا

*- ناوی سیانی: سەعید بەشیر مستەفا

* - لەدایکبووی: ١ - ١ - ١٩٨٢

* - دانیشتووی: پارێزگای هەڵەبجە

* - بڕوانامە: بەکالۆریۆس - کۆلێجی زانستە ئیسلامیەکانی بەغداد - بەشی الشریعە.ساڵی(٢٠٠٧ - ٢٠٠٨)

* - لە ٣ - مانگی شوباتی ساڵی ٢٠٠٤ ز زانستە شەرعیەکانی تەواوکردووە و ئیجازەنامەی عیلمی(الأجازة العلمية) وەرگرتووە.

*- زمانەکانی فارسی عەرەبی - زۆرباش لەقسەکردن - وەرگێڕان.

*- پیشەی ئێستا: فەرمانبەر لە مۆنۆمێنتی شەهیدانی هەڵەبجە - وەرگێڕی بەشی لێکۆڵینەوەی ستراتیژی.(وەرگێڕی ئەو شاندە عەرەب و فارسانەی کە سەردانی مۆنۆمێنتی هەڵەبجە دەکەن).

*- خاوەنی پلەی(دووەم) لەبەرهەمی وەرگێڕدراو لەسەر ئاستی پارێزگای هەڵەبجە و دەوروبەری. لەفیستیڤاڵی خەڵاتکردنی کەسانی خاوەن بەرهەم لە(مەڵبەندی پێنجی یەکگرتووی ئیسلامی)

*- بەشدار لەچەندین چالاکی و کاری ڕێکخراوەییدا.

*- ئەندامی دامەزرێنەری(ڕێکخراوی گرین بۆ ڕاهێنانی مەدەنیەت)

* - سەرنوسەری گۆڤاری کۆمەڵایەتی مانگانەی(هانە) لە ٢٠٠٥ ئۆرگانی کۆمەڵەی چالاکیەکانی هاموون.

*- ئەندامی لیژنەی سەرپەرشتیکردن و نوسینی گۆڤاری ساڵانەی(زام) ٢٠٠٥ تا ٢٠٠٦ تایبەت بەکیمیابارانی هەڵەبجە(ئۆرگانی کۆمەڵەی چالاکیەکانی هاموون).

*- وەرگێڕ لەخانەی چاپ و پەخشی ڕێنما.

* – خاوەنی چەندین کتێبی وەرگێڕدراو لەزمانەکانی فارسی و عەرەبی:

١ – موقەدیمەی ئیبن خەلدون بەکوردی.

٢ – ئیسلام ناسی – د شریعەتی.

٣ – موعتەزیلە – شۆڕشی فیکری ئیسلامی ئازاد.

٤ – ئیبن ڕووشد.

٥ – ڕێگە ڕاستەکان – د سروش.

٦ – مرۆڤ و ئیسلام – د شەریعەتی.

٧– عەقڵ و ئازادی – د سروش.

٨ – سەدام لەزیندانی ئەمریکیەکانەوە – پرۆژەی هاوبەش

٩ – سێکس لەئاینەکانی جیهاندا.

١٠ – جوگرافیای دانیشتوان.

١١ – جوگرافیای ئاوو هەوا.

١٢ – خەونامەی کوردی – پرۆژەی هاوبەش.

١٣ – کاریگەری ئاین لەکۆمەڵگە مرۆڤایەتیەکاندا.

١٤ – کورتەیەك لەمێژووی چەکی کیمیایی – هەڵەبجەوەك نمونە.

١٥ – ڕوانینێك بۆ تایبەتمەندی سەدە نوێکان – د.شەریعەتی.

١٦ – گەشتێك بەناو فەلسەفەی ئایندا.

١٧ – بۆقەکەت ماچ بکە.

١٨ – ڕەهەندە نێو دەوڵەتیەکانی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی.

١٩ – ئامۆژگاریەکانی لوقمانی حەکیم.

٢٠ – زمانی جەستە.

٢١ – موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان.

٢٢ – ڕەخنەگرتن لەعەقڵ لە فەلسەفەی غەزالیدا.



# رەخنەگرتن لەعەقل

## لەفەلسەفەی غەزالیدا

گومان لەوەدا نیە کە "غەزالی" سەر سوڕهێنەرترین کەسایەتیە لەمێژووی ئیسلامدا و مەزهەبەکەشی ئاوێنەنوێنی کەسایەتیەکەیەتی). ئەمەش نزیکە لە هەڵوێستەکەی ڕینانەوە کە دەڵێت: : "غەزالی" تاکە فەیلەسوفێکی موسوڵمانە کە شێوازێکی تایبەتی لەبیرکردنەوەی فەلسەفیدا بۆ خۆی هەڵبژاردووە. کەواتە "غەزالی" وەك خاڵێکی جیاواز وایە لە مێژووی فەلسەفی لەلای موسوڵمانان، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەسایەتی خۆی بەجوانی ئاشکرا کردووە و نەبووەتە چاو لێکەر و لاسایی کەرەوەی کەسانی تر . بەڵام ئایا ئەم تاکبوونەوەیە سیفەتێکی باشە لەجیهانی فەلسەفەدا؟ یان یەکێکە لەسیفەتە ناشیرینەکانی دوونیای فەلسەفاندن؟ وەڵامی ئەمەش دەبێت لەڕێگەی ئاشکراکردنی هەڵوێستی ئێمەوە بێت لەبارەی فەلسەفەی یۆنانیەوە، ئەگەر فەلسەفەمان تەنها بەفەلسەفەی یۆنانی زانی، ئەوا ئەم تاکبوونەوەیە "غەزالی" لەدوونیای فەلسەفە دەکاتە دەرەوە، بەڵام ئەگەر فەلسەفەمان بەچالاکی عەقڵی هۆشیار(الواعی) زانی لەبارەی خود و لەبارەی جیهانەوە، بەبێ ئەوەی کە پەیوەستی بکەین بە لایەنێکی جوگرافی یان ئینتیمایەکی شارستانیەوە، ئەوکات ئەو تاکبوونە دەبێتە بەڵگەی پێگەشتن و نیشانەی سەربەخۆیی و لەدایکبوونی فەیلەسوف.

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (٨٠٠٠) دینار